٢٤

# بەرەو بەختیاریی ئافرەت

بەرگی سێیەم


نووسینی

جەمال حەبیبوڵا ( بێدار )



www.tishbooks.com

# بەرەو بەختیاریی ئافرەت

جەمال حەبیبوڵڵا
"بێدار"

بەرگی سێیەم

١٤٢٨ کۆچی

٢٠٠٧ زایینی

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

**ناوی کتێب:** بەرەو بەختیاریی ئافرەت

**نووسینی:** جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار"

**ژمارەی سپاردن:** (٨٦٧) ساڵی ٢٠٠٧

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر /٠٧٧٠٣٦١٢١٤١

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٧

**تیراژ:** ١٠٠٠

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٢٤)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

## ماف بە راوێژكاریی جێگیر ئەبێت

سكالاَ: مامۆستا دڵپاك ئەوا گەڕاوینەتەوە ئیتر كاتی وەڵامەكەم هاتووە.

دڵپاك: بۆچ لە باسەكەماندا گەیشتینە چیو كوێ؟

ئاواز: وادیارە ئەتەوێ تاقیمان بكەیتەوە؟ ئەوەندەش تەمەڵ نین، باسی ئەركو ماف ژنو مێردت بەسەر یەكەوە بۆ كردین، پەیمانیشت پێدان كە گەڕاینەوە باسی ناچیزەییمان بۆ بكەیت، وادیارە خۆت تووشی لەبیرچوونەوە هاتبی!

دڵپاك: ئێمە باسی ماف ژنو مێردو ئەركیان بەسەر یەكترەوەمان كرد، جا با سەرلەنوێ بیرتانی بخەمەوە كە خوای گەورە لە قورئانداو پێغەمبەری پێشەوایشمان لە فەرموودەكانیا هەموو مافەكانی ژنی بەسەر مێردەكەیەوە یان هەموو مافەكانی مێردی بەسەر ژنەكەیەوە بەیانو دیاری نەكردووە، تەنها هەندێكیانیان باسكردووە، ئەوانە بە ماف نەگۆڕاو و دامەزراو و مەعروف راستەقینەی ژیانگەو كۆمەڵگە دەناسرێن، لە هەموو كاتو شوێنێكدا، ئەها یاسا خواییەكە ئەفەرمووێ:(وَ لَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ)!

ئەو (المعروف)ە كە خوا ئەیەوێ ئەو عورفو باوە پاكانە ئەگرێتەوە كە دابو نەریتی خەڵكو رێگەی هەڵسوكەوتیانی لەسەر دائەمەزرێت یاخۆ شێوازی ژیانی رۆژانەیانیان لەسەر دائەمەزرێت، بەڵام بەو مەرجەی لە رێبازی ئیسلام بەدەر نەبێت، دژو پێچەوانەی یاساكانی ئیسلام نەبێت.

ئینجا مادام مەسەلەكە بە عورفو دابو نەریتی ژیانی رۆژانەو شێوازی ئەو ژیانە سپێرراوە، دیارە ژنو مێرد ئەتوانن لەیەكتر تێبگەن، لە نێوان خۆیانا رێك بكەون، پێكەوە راوێژ بكەنو بە راوێژكاریی ئەركو ماف خۆیان بزاننو هیچ كامیان لە ئەركی خۆیا كەمتەرخەمی بەپێی توانا و خۆی نەكات، لە هەمان كاتا ماف ئەویتریان پێشێل نەكاتو ستەم نەكات، نەهێڵێ دەست درێژیو ستەمكاری هێلانەی بەختیاریی خۆیو بەچكەكانی بشێوێنێ.[1]

ئەی لەیەكترگەیشتن، تویژینەوەو لێكۆڵینەوە، راوێژكاریی، چاكترینو پێشكەوتووترین شسێوازو رێگەی بە هیواگەیشتن نین؟ كە ئیسلام بۆ ژنو مێرد ئەم بوارەی هێشتۆتەوە، دیارە پێشكەوتنو شارستانیەتو گۆڕانی ژیانی ئادەمیزادی رەچاو كردووە، ئیسلام بۆ چەرخێكی دیاریكراو نەهاتووە، بەڵكو بۆ هەموو چەرخەكانو هەموو مرۆڤەكان نێرراوە، قابیلە نێرەرەكەی پێشكەوتنی ئادەمیزادی لەبیر چووبێت؟ سُبحانە.

سكالاَ: ئەم باسانەی تۆ جۆرە گیزە گیزێكیان خستووەتە دڵمەوە دڵپاك!

## ناچیزەیی (النُشوز)

سكالاَ: بەڵام ئیتر كاتی باسكردنی ناچیزەیی هاتووە خوشكە دڵپاك.

دڵپاك: خوای پەروەردگار لە یاسای ژمارە (٣٤)ی قورئانیدا ئەفەرمووێ: (وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً) (النساء: ٣٤).

ناچیزەیی یانی یاخی بوونی ژن لەمێردی خۆی، بەگوێنەكردنی، خۆ بەدەستەوەنەدانی سەبارەت بە خواستی سێكسی مێردەكەی، یان بەجێنەهێنانی ئەو ئەركانەی كە وان بەسەرشانیەوە وەك بە درێژیی باسمانكردنو خواو پێغەمبەر (د.خ) لەسەر ئافرەت پێویستیانی كردوون دەربارەی مێردەكەی.

ئاواز: دەی كەی راستە ژن لە هەموو شتێكا بە گوێی مێردەكەی بكات؟

---

1 – تەماشای (المرأة في القرآن و السنة)ی محمد عزت دروزة و (فقه السنة)ی السید سابق بكە.

دڵپاك: خوشكەكەم، ئیسلام داوای نەكردووە لە ژن كە لە هەموو شتێكا بەگوێی مێردەكەی بكات، بەڵكو ئەبێ تەنها لە رەوا (حلال)دا بەگوێی بكات، ئەویش لە سنووری تواناداا (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا) ، ئەی باسمان نەكرد كە یەكێك لە یاساكانی ئیسلام (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)ە؟

لە ئیسلامدا پیاو بۆی هەیە هەر كە ژنەكەی ناچیزە بوو ئەدەبی دابدات واتە (يُؤدِّبُها)، ئینجا هەر كە دەستی لە ناچیزەییەكە هەڵگرت ئیتر تأدیبەكە خۆی هەڵئەوەشێتەوە، بەجۆرێكی تر تأدیب بۆ چارەسەركردنی ناچیزەییە، كە ناچیزەیی نەبوو، تأدیبیش نابێت.

یاسا قورئانییەكە خۆی هەنگاوەكانی ئەو تأدیب كردنەی بەشێوەی یەك لەدوای یەك دەستنیشان كردووە: (وَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ)، لەپێشەوە ئامۆژگاریكردن، ئەمجا شەوان جێگە جیاكردنەوە لێی، دوای ئەوە ئەوسا سەرەی لێدان دێت.، ئەویش دوای فەشەل بوونی هەنگاوی یەكەمو دووەم، نەك یەكەمجار دەست بكرێت بەلێدان.

سكاڵا: دەی وا پیاوان ئەم هەنگاوانەیان بەشێوەی جەوركاری بەكار هێنا!

دڵپاك: هەموو راستییەك لەم دنیایەدا لەوانەیە بە هەڵە بەكار بێنرێت، ئەو تأدیبەش وەك هەموو راستییەك ئەبێ بەكاربهێنرێت بەڕاستیو بەپاكی، بەڵام من لە ئێوە ئەپرسم: ئایا راستییەكانی تر بەلارییو خوارییی بەكارناهێنرێن؟ دەی ئەمیش هەر وەك ئەوانی ترە، جا هەر راستیو حەقیقەتێك لەوانەش مافی تأدیبكردن، ئەگەر بەچەوتی بەكارهێنران، ئایا ئەوە وائەگەیەنێ كە ئەو راستییە خۆی چەوتە؟ یان چەوتییەكە لە بەكارهێنانو بەكارهێنەرەكەوەیە؟

سكاڵا: ئاشكرایە كە چەوتییەكە لە بەكارهێنانو بەكارهێنەرەكەوەیە.

دڵپاك:كاربەدەستی مسوڵمانان هەر كە ئەو چەوتی بەكارهێنانەی پێگەیشت (واتە پێی زانی) پێویستە لەسەری كە تۆڵە لەو ستەمكارە بسێنێ، هەتا راستی جێی خۆی بگرێتو ستەم لەكەس نەكرێت.

بەرنامەی ئیسلام خوو جوانكردنو پەروەردەكردنو پێگەیاندنە، بزواندنی دڵو مێشكو بیرو هۆشو سۆزو هەستە بەرەو خێرو چاكە، ئەبێ پیاو ئەو ئەدەبدادانە بۆ پەروەردەكردن و پێگەیاندن بەكاربهێنێت، ئەبێ بزانێت هۆیە، رێگەیە بۆ مەبەستێك، تێبگات كە خۆی لەخۆیا مەبەست نییە، كاتییە نەك هەمیشەیی، دەرمانە بۆ چاكبوونەوە نەك بكرێت بە خۆراكو هەمیشە بخورێت، ئەبێ بزانێت مەبەست لە بەكارهێنانی ئەو مافە پاراستنی گیانو بەرژەوەندی خێزانە، نەهێشتنی هۆی پچڕاندنو شێواندنی خێزانە، ئەو خێزانەی كە بەردی بناغەی كۆمەڵگەیە، كە پیاو ئەمەی زانی ئیتر كار ئاسانە.

سكاڵا: یاساكە جوانو بەكەڵكە، بەڵام خۆزگە ئەو لێدانەی لەگەڵدا نەبوایە!

دڵپاك: ئەی نازانی كە هەموو یاساو رژێمێك لەسەرانسەری دنیادا ئەگەر دەسەڵاتی لەگەڵدا نەبێت هەرچەندە راستو جوانو بەكەڵك بێت، جگە لە مەرەكەب بەسەر كاغەزەوە هیچی تر نییە؟ خۆ ژنو مێردی رژێمێكە چاكەی ژنو مێردو كۆمەڵگەی وەك یەك تێدایە، ئەبێ ئەم رژێمە فراوانترین كەڵكو چاكەی بۆ هەمووان فەراهەم بهێنێ، جا هەر كە ئەو ژنو مێردە لەناو خۆیاندا كۆكو گونجاو بوون، ئەوا بەوە كەڵكو سوودی هەمووان فەراهەم دێت، بەبێ ئەوەی یاسا خۆی تێبگەیەنێ، بەڵام هەر كە ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە ئەوە زیانو زەرەری تەنها هەر بۆ ژنو نێردەكەی نییە، بەڵكو زیانی بۆ منداڵەكانیان كە پیاوی دواڕۆژن هەیە، ئەی ئەوەش زیان بە كۆمەڵگە ناگەیەنێ؟ ئەی ئەو هەموو لێدانو گرتنو كۆتو زنجیركردنو لەسێدارەدانە كە لە جیهاندا هەیەو هەبووە بەناوی سوودو قازانجی كۆمەڵگەوە نەكراوەو ناكرێ؟ ئەی بۆچ پەنجە بۆ ئەوە راناكێشن؟!

سكاڵا: واللە خۆ راست ئەكەی! من هەرگیز ئەوە بەبیرمدا نەئەهات، ئای چەند بە سادەیی بیرئەكەینەوە! ئەوە بۆچ سەلیقەی هەڵسەنگاندنی قسەمان نییە؟

خوشکە دڵپاك، مودەڕریسەیەکی خزممان هەیە، بوێنێ شەو لەماڵی خۆمان بوو، هەروا قسە کەوتە ناوەوە، جا خۆی تا ئێستا یەك دوو گەشتێکی ئەورووپای کردووە ، کەوتە باسکردنی ژیانی ئەو وڵاتانە، بەتایبەتی ژیانی ئافرەت، گەلێ تاریفی خۆشیی ژیانی ئافرەتی ئەوێی ئەکرد، زۆر هات بەشانو باڵیا، ئەیگوت: "ئافرەت لەوێ مرۆڤێکی تەواوی سەربەستو ماف پارێزراوە، ئازادە، لەگەڵ پیاودا لە هەموو روویەکەوە یەکسانە، وەك ئافرەتی لای ئێمە لەژێر چنگو چەپۆکی پیاودا نەچەوساوەتەوە.، لای ئێمە لەژێر پەردەی ئادەمیزاددا ئافرەت شارراوەتەوە، هەر بە زیندوویی ئەمرێت، ئەوەتا ئیسلام دەسەڵاتی داوە بە پیاو کە قسە بە ژنەکەی بڵێو جنێوی پێبدات، لەگەڵیا نەخەوێ تا بەوە نەفسییەتی بشکێت، بەشەقو گورزو تێلا بۆی هەیە لێیبدات... هتد.

ئێ.. ئێ! ئەمە ئەم تأدیب کردنە بوو کە ئەو بەو جۆرەی ئەگوت!! دەی ماموستا دڵپاك،باسەکەمان بەتەواوی بۆ رۆشنبکەرەوە، با بزانم قسەکانی ئەو تاکوێ بڕئەکەن، بەڕاستی من نەمزانی وەڵامی بدەمەوە، بێدەنگ بووم.

دڵپاك: زۆر چاکت کردووە لەوەدا کە بێدەنگ بوویت، چونکە لە حاڵەتی نەزانیدا بێدەنگی زۆر زۆر لەهاتنەدەنگ چاکترە، بەڵام با منیش ئێستا لەتۆ بپرسم: ئایا ئەو مودەڕریسەیە خۆی شووی کردووە؟ مێردەکەی پیاوێکی موسڵمانی راستەقینەیە؟ بەو شێوەیە لەگەڵیا جوڵاوەتەوە؟ ئایا ئەو لەگەڵ نەخەوتنو بە پەندکردنو تێڵاکارییەی لە قورئانو حەدیسدابەچاوی خۆی دیووەو دیراسەی کردووە؟

سکاڵا: وەڵامی سێ پرسیاری یەکەم (نا)ی ئەوێ، بەڵام چوارەم نازانم.

ئاواز: دڵپاك، دەی ئینکاری مەکە ئەی خۆت ئایەتە قورئانەکەت نەخوێندەوە؟ ئەی لە ریسواکردنو تێهەڵدان بەولاوە چی تری تیابوو؟

## سێ دەرمانی گرنگ بۆ دەردەکە

دڵپاك: سبحان الله! ماموستا ئاواز ئەبوایە وەها نەبوویتایە! حوکمەکانت زۆر زوو لەدەم دەرئەچن، هەڵچوونێکی توندو تیژیان لەگەڵدایە هەروەك لەو کاتەدا زاڵنەبیت بەسەر قینتا وەهایە!

چاوەکەم، خۆ سەرەتایەکی ناچیزەییم بۆ باسکردن، چۆن راستە کە بڵێیت لە تێهەڵدانو ریسواکردن بەولاوە هیچی تری تێدانەبوو؟! ئەی باسمان نەکرد کە لە سێ قۆناغ یاخۆ سێ هەنگاو پێکدێت؟ ئەی ئایەتەکە (ئامۆژگاریی و جێگا لێجیاکردنەوە)ی پێش (لێدان) نەخستبوو؟

سکاڵا: گریمان ژنێك لەگەڵ مێردەکەیا ناچیزەیە، مێردەکەی چی ئەکات؟

دڵپاك: بێگومان مێردی مسوڵمان ئەبێ بەپێی فەرمانەکەی خوا لەگەڵیا بجوڵێتەوە، فەرمانە خواییەکەش وەك باسمانکرد سێ دەرمانی بۆ دەردەکە نواندووە، مێرد ئەبێ ئەم سێ دەرمانە بەپێی پێویستی و بەتەرتیب بەکاربهێنێت، ئەمەش ئەو سێ دەرمانەن:

**١- ئامۆژگاری کردن:**

کەپیاو هەستی بەناچیزەیی ژنەکەی کرد، لەسەرەتاوە ئەبێ بە نەرمونیانی، بە هێمنیو لەسەرخۆو ژیرانە لەگەڵیا بجوڵێتەوە، زمانی شیرین بێت لەگەڵیا، ئامۆژگاریی بکات، نموونەی بە باسکردن بخاتە بەرچاو، بەشکو بەو مامەڵە جوانە، بەو ئامۆژگارییە دڵسۆزانەیە، بەو سۆزو میهرەبانی نواندنە لەگەڵیا وریا ببێتەوەو رابچڵەکێت، بیر بکاتەوە، شێوازی خۆی بگۆڕێت، دەست لە قینو دڵڕەقی خۆی هەڵبگرێتو لە هەڵەکەی پەشیمان ببێتەوە، ئینجا کە پیاو ئەوەی لەگەڵ ژنەکەیا کرد، راستو هەڵەی خستە بەرچاو، بۆی باسکرد کە ئەو ناچیزەییە ئەبێتە هۆی تووڕەکردنی خوای گەورە و پێغەمبەری خوا (د.خ) لە ناچیزە.، کە پیاو ئەم دەرمانەی بە ئارامیی و بۆ چەند جارێك بەکارهێنا، لەوانەیە ژنەکەی هەڵوێستی خۆی بگۆڕێت، رێگەی هەڵسوکەوتی بگۆڕێت، بێتەوە سەر رێگای

راست، بەوەش هێمنیی و خۆشیی رووئەکاتەوە نێوانیان، خێزانەکەیشیان لە تەنگ و چەڵەمە قوتار ئەبێت، ئیتر مادام مەبەستەکە هاتەدی پیاو پێویستی بە پەنابردنە بەر دوو دەرمانەکەی تر نییەو ئەبێ سوپاسی خوا بکات.

سکالا: با بڵێین پیاو ئەوەی کرد، کەچی ژنەکەی هەر بە رەقی مایەوە، چیی تر ئەکات؟

دڵپاک: بەڵێ، گەلێ جار پیاو بەوە ناگاتە ئامانجێکی بەکەڵک و ئەنجامێکی چاك.

چونکە زۆر کەس هەیە کە هەستی مرۆڤانەی نزم و سستە، پەندو ئامۆژگاریی و راستی پێناسین کاری تێناکەن، هەستی نابزوێنن، تەنانەت ئەو هەنگاو و کارە جوانانە بە نیشانەی لاوازیی و بێدەستی بەرامبەرکەی ئەژمێرێت، بەتایبەتی ئافرەتی نەزان و تێنەگەیشتوو، بەوە بەیەکجاریی پێڕائەکێشێ، ئەوەندەی تر سواری ملی مێردەکەی ئەبێت، لەبەرئەوە پیاو ئەبێ پەنابەرێتە بەر دەرمانی دووەم یاخۆ هەنگاوی دووەم بەنیازی بە مەبەست گەیشتن.

**٢- جێگا لێ جیاکردنەوە:**

دڵپاک: دەرمانی دووەم بۆ چارەسەرکردنی دەردی ناچیزەیی، لووت پێنەدان و جێگە لێ جیاکردنەوەیە، لەگەڵ نەخەوتن و دوورکەوتنەوەو پەیوەندی پچڕاندنی سەر جێگەیە لەگەڵ ناچیزەدا، ئەمەش بەو هیوایەی کە هەڵەکار وریاتر ببێتەوەو لە هەڵەکارییەکەی دەست هەڵبگرێت، لە یاخی بوونەکەی پەشیمان ببێتەوە، بەزاراوەیەکی زانیارییانە، لالێکردنەوەیەکی سایکۆلۆژییە، هەنگاوێکی قووڵی کاریگەری ئیسلامییە، کە کاریگەرییەکەی ئەگاتە ناخ و سرووشتی ئافرەت، ئەو ئافرەتەی کە شانازیی بە جوانیی و شۆخ و شەنگیی خۆیەوە ئەکات و هەر بەوانەش رەگ و ریشەو دڵی پیاو ئەخاتە لەرزە!

ئینجا کە پیاوەکەی لەگەڵیا نەخەوت و گوێی پێنەدا، لالووت بوو لێی، مانای ئەوەیە لەو شۆخ و شەنگی و جوانییە دەستی هەڵگرتووە، ئیتر بە بێذرخ و بە هیچی ئەزانێ، بێگومان ئەوەش تەقە لەبن مەنجەڵی فیزو دەمار بەرزیی ئافرەت هەڵئەسێنێ، لووت بەرزیی لێئەشێوێنێ، لەوانەیە ئەم شێوازە (وەك گوتمان) ببێتە دەرمان و چاکی بکاتەوە.

ئاواز: واتە دەرمانی دووەم، کاریگەرییەکەی لە هی یەکەم بەهێزترە!

دڵپاک: بەڵێ.. بەڵێ، هەنگاوی یەکەم یاخۆ دەرمانی یەکەم، تەنها قسە بوو، بەڵام دووەمیان لەقسە تێپەڕ ئەکات، پشت تێکردن، گوێپێنەدان، لەگەڵدا نەخەوتن، قسە لەگەڵدا نەکردن، سۆزو میهرەبانی لێسەندنەوە، بایەخ پێنەدان، ئەمانە لە نێوان دۆست و خۆشەویستاندا، لە نێوان کەسوکاردا، بەتایبەتی لە نێوان ژن و مێرددا زۆر توندوتیژو خاوەن کاریگەریین.

ئەوکاتە ئافرەت وا هەست ئەکات، کە مێردەکەی خۆی بزرکردووە، لێی دوورکەوتۆتەوە، لە نزیکترین کەسەوە بووە بە بێگانەیەکی زۆر دوور لێی، ئەمەش لە ئەنجامی هەڵەکاریی خۆیەوە بوو، ئیتر هەست بە ئاوارەیی و تەنیایی ئەکات، هەست بەوە ئەکات کە مێردەکەی لە هاوسەرێکی خۆشەویستەوە بووە بە غەوارەیەکی دوور لە خۆشەویستی بۆی و ئەوەتا بە شتێکی پشت گوێخراوی ئەزانێ و بوونی و نەبوونی بەلایەوە یەکسانن، تەنانەت ئەو چەکەی کە جاران راوی مێردەکەی خۆی پێئەکرد، کە مێیەتییەکەیەتی (أُنوثتها) ئەوا ئەمرۆ ناتەقێت! ئەی ئەوە نییە کە لەگەڵیا ناخەوێت؟ ئایا دەسمایەکەی بێرەواج نییە ئێستا؟ کە چەکی راوچی نەتوانێت کاربکاتە نێچیر، ئایا راوچی بەوە چەك نەکراوە؟ تۆ بڵێی بەوە گیرۆدەی غەم و پەژارەو ئاهی سارد نەبێت؟

سکالا: بەڕاستی سزاپێچەشتنێکی زۆر سەختە! لەهەمان کاتدا دادگەرانەیە، چونکە ناچیزەییش سەخت و تاڵەو داخی لە دڵی پیاودا زۆر گەورەیە! بەڵام ئەگەر ئەم دەرمانەش چارەی دەردەکەی نەکرد، پیاو چی ئەکات؟

ئاواز: ئیتر نۆرەی لێدانە.

### ٣- لێدان (الضرب):

دڵپاك: ئەگەر دەرمانی دووەمیش چارەی دەردەكەی نەكرد، بێگومان دەرمانی سێیەم واتە (لێدان) ئیتر سەرەی دێت، بەڵام نەك وەك ئەوەی كە مودەڕڕیسەكە بۆی باس كردوویت.

ئەبێ لێدانەكە سووك بێت و بریندارکردنی پێوە نەبێت، لە سەرو دەمو چاوو شوێنی هەساس نەدرێت، ناشیرین كردنی بەدەمەوە نەبێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (... ولاتضربُ الوَجه ولا تُقبّح ولا تهجر إلاّ في البيت) (رواه أبو داود). بە داڕشتنێكی كورت: لێدان بۆ تأدیبە نەك بۆ لێدان، هۆیە نەك مەبەست، لەوەش زیاتر لە شێوەی ڕێپێدان (الإباحة)دا هاتووە، واتە پێویست كراو نییە، لەسەر مسوڵمان پێویست نییە كە ئەو لێدانە بەكاربهێنێ، بەڵكو بۆی هەیە بەكاری بهێنێ، ئەویش لە دوای بەكارهێنانی دوو دەرمانەكەی تر، وە كاتێ دەركەوت كە دوو دەرمانەكەی تر چارەی دەردەكەیان نەكردووە.

خوشكی شیرینم، ئادەمیزادێك كە ئامۆژگارییەكی دوورو درێژی پڕ لە سەلیقەكاریی لە هەڵە نەیگێڕێتەوە، لەگەڵ نەخەوتن و بەڕەقی جوڵانەوە لەگەڵیا داینەچڵەكێنێ، لە سەهەندەیی خۆی نەیخات، دەست لە پێشێلكردنی مافی نزیكترین كەس بۆی هەڵنەگرێت، ئایا ئەو ئادەمیزادە نەرمو نیانیی تیایە؟ هەستی مرۆڤایەتی پێوەیە؟ لە ئاژەڵەوە نزیكتر نییە تا ئادەمیزاد؟ ئایا وریاكردنەوەی ئەو جۆرە كەسانە بۆ ئەوەی مافی خەڵك پێشێل نەكەن، بە ستەم یان دڵڕەقی ئەژمێررێت؟ ئەی جگە لە لێدان چیی تری لەگەڵا بەكاربهێنرێ؟

ئاواز: بەڵام ئایا ئەو لێدانە ئافرەتە بە مسەوگەریی لەو حاڵەتە قوتار ئەكات؟

دڵپاك: خوشكەكەم، گەلێ ئافرەت تووشی لادان (إنحراف)ێكی دەروونی ئەبن كە هۆیە نەرمەكانی چاككردن دادی چاككردنەوەی نادەن، ئەو لادانەش لادانێكی سایكۆلۆجییە كە زاناكانی دەروون ناسی پێی ئەڵێن (ماسۆشیزم)، ئەو ئافرەتەی كە دووچاری ئەم لادانە ئەبێت، ئەگەر لەلایەن مێردەكەیەوە مامەڵەیەكی توندوتیژو ڕەقی لەگەڵدا نەكرێت، ڕاست نابێتەوە، ئەو ئافرەتە خوناوێزەیە لە شێوازی توندوتیژو ڕەقی مێردەكەیا لەگەڵیا، لەززەت و حەسانەوەیەكی پێئەگات (هەرچەندە بەپێچەوانەشەوە ئەوە دەربپڕێت)، جا لێدان لەو حاڵەتە ناوێزەیەدا دەرمانێكی خراپ نییە، زانایەكی دەروونناسی خۆرئاوایی بەناوی (g.a.Hadfiled) لە پەڕاوەكەیدا (علم االنفس والأخلاق) ئەڵێت: "ئارەزووی ملكەچی هەندی جار بەهێز ئەبێت، خاوەنەكەی لە ملكەچكردندا لەزەت ئەچێژێ، بۆ ئەوەش بە شادومانییەوە خۆی ئەخاتە بەردەم ئێش چەژتن.. هەر ئافرەتێك لەم جۆرە بێت، مێردەكەی چەند لێی بدات و چەند ڕەقی بەكاربێنێ لەگەڵیا، ئەوەندە پێی موعجەب ئەبێت، هەندێ ئافرەت هیچ شتێك بەقەدەر ئەوە پەستیان ناكات كە مێردەكانیان هەمیشە نەرمونیان بن لەگەڵیاناو هەرگیز تووڕە نەبن و هەڵنەچن..."[١]

سكالاّ: وی، چە دەردێكە! ئەی پیاو نایگرێ؟ هەر ئافرەت تووشی ئەبێت؟

دڵپاك: پیاویش ئەو دەردە ئەگرێت، تایبەتی نییە بە ئافرەتەوە بەتەنها، هی پیاو پێی ئەوترێ (سادزم).[٢]

جا سەیر لەوەدایە كە هەندێ جار پیاوێك كە سادزمیەتی، وا دێتە پێشەوە بۆی كە ژنێكی تووش بوو بە ماسۆشیزم ئەبێتە هاوسەری! ئەوسا ئیتر هەمیشە گاڵەو چەكرو پیكان و شەڕو ئاژاوەیانە، لەیەكتر ئەدەن، كەچی زۆر بەدەگمەنیش ڕووئەدات لەیەكتر جیاببنەوە! بەڵكو جوان پێكەوە ئەگونجێن و لەیەكتر ئەگەن و گوزەران لەگەڵ یەكترا ئەكەن، هەرچەندە ئەوەش لەسەر بناغەیەكی لادان بۆ هەردووكیان دائەمەزرێت، كەچی چونكە

1 – (شبهات حول الاسلام، فصل: الاسلام والمرأة) محمد قطب.

2 – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

سرووشتیان وایە، ئەو هەموو هەراو بەزمەیان لا سەیر نییە، بەڵکو بە ئاسایی ئەزانن و یەکترییان لەبەرچاو ناکەوێت و نابێزرێت!!

سکالاَ: ئای چەند لەو لێدانە ئەترسام، بەلاَم ئێستا باشم، خۆزیەی دڵم نیشتەوە، من وامئەزانی سەرو دەست و قاچ شکاندنی تیایە، چاو کوێرکردن و گوێ کەڕکردن و دەمو دان و لووت شکاندنی تیایە، دەی ئەوەبێ کەتۆ باستکرد، ئاسانە.

دڵپاك: ها، ها! بۆچ زیندانەکانی خوارووی ئەفریقایە؟ ئەگەر ئەو نەخۆشی ماسۆشیزمە لەناوا نەبێت، لێدان هەر زۆر کەم پەنای پێئەبرێت، چونکە لەدوای دوو دەرمانەکەی ترەوە دێت، چەکێکی ئەحتیاتەو بۆ ناچاری بکارئەهێنرێ، پێغەمبەر ﷺ لە حاڵەتی ئاساییدا بەشێوەی قخلێکردن ناوی بردووەو نەهیلێکردووە: (لايجلد أحدكم إمرأته جلد العير ثمّ يجامعها آخر النهار) (رواه البخاري). شافیعی پێشەوایشمان ئەفەرمووێ: (هەرچەندە لێدان ڕێگەی پێدراوە، بەلاَم دەست هەڵگرتن لێی چاکترە).

خۆ تۆیش کچێکی خوێندەواریت، سوپاس بۆ خوا موسڵمانیشی، دەی حەیف نییە کە نەزانی بە شێوەیەکی جوان لەگەڵ هاوسەرەکەتا بجوڵێیتەوە؟ چۆن ئەبێت ناچاری بکەیت و بیگەیەنیتە لێدان بەکارهێنان؟ خوا یاربێت ئەبێت خۆت بکەیتە نموونەی هاوسەران لە چاکی و چاك بەجێهێنانی ماڤی هاوسەرەکەتا، تا خەڵکی چاوت لێبکات، خۆ پیاو لەخۆیەوە شێت نەبووە دەست بکات بە لێدانی هاوسەرکەی، ئەی نەتبیستووە کە پێشینان وتوویانە: (ژن خۆی دار ئەدات بەدەست مێردەکەیەوە)؟

ئاواز: ئەی ئەگەر پیاو ناچیزە بوو، ئایا هەمان هەنگاوانی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێت؟ واتە ئافرەتیش لەپیاو ئەدات؟

دڵپاك: ئەگەر هاتوو پیاو ناچیزە بوو (کە ئەمەش زۆر کەمە لەچاو ناچیزەیی ئافرەتا) هەمان هەنگاوانی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت، ئەمەش مانای وەهانییە کە ئیسلام ناچیزەیی پیاوی فەرامۆش کردبێت، بەپێچەوانەوە هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو ڕێگەی چارەسەرکردنی ئەوەیشی زۆر بە وردیی دیاریکردووە، لێرەدا گیروگرفتی واقیعیی عەمەلی و بۆچوونی مرۆڤایەتی پێش چاو گیراوە، نەك گیروگرفتی مەسەلەی دادپەروەرییەکی نەزەریی نموونایەتی بێ بنچینەو بنەوان.

ڕێگە بە ئافرەت نەدراوە کە لە مێردی خۆی بدات، دیارە ئەپرسن: بۆچ؟ منیش پێتان ئەڵێم: فەرموون با ئاوڕ لە یاسا زەمینییەکان بدەینەوە، بە کۆن و تازەیانەوە، چ ئافرەتێکی ئاسایی لەسەر ڕووی سەرانسەری زەویدا تا ئێستا لە مێردەکەی خۆی داوەو لەگەڵ ئەوەشا بەدەنگ نەکردنی مێردەکەی ڕێزونرخی ئەو پیاوە لای ژنەکەی ماوە؟ یان دوای ئەوەی لێیدابێت، کەی ئەو ئافرەتە وەك ئافرەتانی تر لەگەڵ مێردەکەیا ڕەفتاری کردووە؟ لە چ ولاَتێکی خۆرئاواییدا یان خۆرهەلاَتییدا، ئافرەتان داوای لێدانی مێردەکانیان کردووە تا تۆیش داوا لە ئیسلام بکەیت؟!

سکالاَ: سەد خۆزگە زووتر ئەم ڕاستیانەم ئەزانین، تا زووتر بکەوتمایە سەر ڕێگەی مسوڵمانەتی، ئای کە درۆو دەلەسەی ناهەقی زۆرم پێگوترا سەبارەت بە بەرنامەی خوا!!

## ناچیزەیی پیاو: نشوز الرجل

سکالا: بەڵام زۆرم پێخۆشە کە شتێکیش لە بارەی ناچیزەیی پیاوەوە بزانم.

دڵپاك: لەخوا بەزیاد بێت، ئیسلام ئەوەندە پاكو تێروتەواوە کە مسوڵمانان بەوپەڕی شانازییەوە بە هەموو کەسێکی بگەیەنن، شاردنەوەی تێدا نەکەن، منیش بە بەختیارییەوە ئەو باسەتان بۆ ئەکەم.

ئەگەر پیاو ناچیزەیی لێدەرکەوت، ئەوا یەکەم جار ئەدرێتە دەستی ژنەکەی خۆی، جا ئەگەر وریاو لێزانو زیرەك بێت، زۆر بەئاسانی ئەتوانێت هۆی ناچیزەییەکە بدۆزێتەوەو هەوڵی نەهێشتنی ئەو هۆیە بدات، تەنگو چەڵەمەکە بڕەوێنێتەوە، ئاسوودەیی بۆ نێوان خۆیان بگێڕێتەوە، واتە ئەبێ ژنەکەی پەنابەرێتە بەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە، دیارە ئەوەش پێویستی بە ئارامگرتنو لێبڕانو لەسەرخۆیی و تێکۆشانو ماندووبوون هەیە، چونکە بیرکردنەوە سەرێشەو ماندووبوونی دەروونی ئەوێت، لەوەشدا هیچ شەرمو شوورەییەك بەدی ناکرێت بۆ ئافرەت، چونکە بەدەستهێنانەوەی چاکترین بزربووی ئافرەتی تێدایە کە مێردەکەیەتی، ئایا هەوڵو تەقەلای پیاو بۆ گێڕانەوەی ژنەکەی بۆ سەر بارودۆخی سرووشتیی، بە عەیبە بۆ پیاو لەقەڵەم ئەدرێت؟! ئەی ئەبێ بۆچ بەنیسبەت ئافرەتەوە نەنگ بێت؟

ئاواز: ئایا ئەتوانین هۆیەکانی ناچیزەیی پیاو دیاری بکەین؟

دڵپاك: هەموویان نەخێر، بەڵام هەندێ هۆ هەن پێیان ئەزانین وەك: گەورەیی لە تەمەندا، ناشیرینی ژن، نەخۆشیی، ساردوسڕیو تەمەڵی ژن، پیسو پۆخڵیی، چەندەها هۆی تری جۆربەجۆر.

دیاریکردنی هۆیەکان زۆر گرنگ نییە، بەڵکو چارەسەرکردنیان بە ژیرانەو وریایی و زیتەڵی ئافرەتەکەوە بەستراوە، بە لەسەرخۆیی و هەوڵو وەڕس نەبوونی ئافرەتەکەوە وابەستەیە، بە سەرنجو چاك بۆچوونیەوە بەندە، نەك بە دیاریکردنی هۆیەکانەوە، ئەگەر بێتو ژنەکە بەوجۆرەی کە باسمانکرد بجووڵێتەوە، دڵنیابە کە ئەتوانێ دڵی مێردەکەی بە باشیی بێنێتەوە جێی خۆیو کۆسپەکە نەمێنێ، سا مەگەر نەخوازەڵڵا هۆی ئەو ناچیزەییە پەیوەندی بە شەرەف شکاندنەوە بێت.

سکالا: ئەی ئەگەر هاتوو ئافرەت ئەوەی کە گوتت بەجێی هێنا، بەڵام مێردەکەی زیاتر رەقو لووت بەرزتر بوو، کەشخەی بەوەوەکرد، زیاتر لە جاران خۆی گێڤ کرد، چار چییە؟

دڵپاك: زۆر زۆرکەم شتی وا رووئەدات، ئەوەش چارەی بۆ دانراوە، ئەوسا چەند رێگەیەك هەن، ئافرەت کامیان بەباش بزانێت ئەتوانێت بیگرێتەبەر، ئەگەر نەگەیشتە ئەنجام، دیارە جیابوونەوە چاکترین چارەسەرە بۆی.

## کەوتنە نێوانەوە (الوساطة)

سکالا: لەسەرەتای باسەکەدا ئاماژەت کرد بۆ ئەو باسە کە ناچیزەیی تەنها لە جنسدا نییە، بەڵکو شتی تریش ئەگرێتەوە، جگە لەوەش جۆرەها ساردیو ناکۆکی لە نێوان ژنو مێرددا رووئەدا کە هۆیەکانی. وەك گوتت. زۆرو جیاوازن، جا لەوانەیە بە هەوڵو کۆششی جۆربەجۆری مێردەکە یان ژنەکە ئەو ساردییو ناکۆکییە چارەسەر نەکرێت، ئایا پەسەندە ئەو ژنو مێردە بەو ژیانە رەشەوە بمێننەوە؟ ئایا چاکتر ئەوەنییە زوو بەزوو لەیەکتر جیاببنەوە؟ بۆچ هەریەکەیان رێگەی ژیانی خۆی نەگرێتە بەرو بەدوای هاوسرووشتی خۆیا نەگەڕێ؟

دڵپاك: قسەکانی پێش پرسیارەکانت راستنو پرسیاری یەکەمیشت بەجێیە، بەڵام پرسیاری دووەمو سێیەمت نەخێر، چونکە خێزانو خێزانداریی بەلای ئیسلامەوە ئەوەندە گەورەو گرنگو بەرزن کە ئیسلام هەرچی لەتوانادا

بێ بۆی بەکارئەهێنێ بەمەبەستی مانەوەیان و تێکنەچوونیان، دوای ئەوەی کە دەرکەوت هیچ چارەیەك نەماوە، ئینجا ئەوکاتە تەنیا یەك رێگە ئەمێنێتەوە کە تەلاقدان و لێجیابوونەوەیە.

ئاواز: بەلام هیچ رێگایەکی تر جگە لە جیابوونەوە لە ئاسۆدا دیار نییە؟

دڵپاك: ئەبوایە پرسیارت بکردایە و بتگوتایە: ئایا هیچ رێگایەکی رووناك: هەیە؟ لە ئیسلامدا بۆ هێشتنەوەی خێزان و تێکنەچوونی رێگایەکی گرنگ هەیە، کە پێی ئەوترێ (کەوتنە نێوانەوە . الوساطة)، ئەم رێگەیە لەپێش تەلاقدانا پەیرەویی ئەکرێت بە مەبەستی چاککردنەوەی پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد و نەهێشتنی گیروگرفتی خێزان و دوورخستنەوەی بەدبەختی و ئاوارەیی لە جگەرگۆشەکانیان.

خوای پەروەردگار لە یاسای ژمارە (٣٥)ی سورەتی (النساء)دا ئەفەرمووێ: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً)، لەم رووەوە خاوەنی (المُغني) دەڵێت: "ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، ئەوسا داوەر تێئەفکرێ، ئەگەر بۆی دەرکەوت لە پیاوەکەوەیە ئەوا ژن و مێردەکە لە نزیك باوەڕپێکراوێکەوە نیشتەجێ ئەکرێن و ئەبێ نەهێڵێ زیانی پێبگەیەنێت، خۆ ئەگەر بۆی دەرکەوت کە هۆیەکە لە ژنەکەوەیە، ئەوا حوکمی نا چیزەیی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێت،وە ئەگەر بۆی دەرکەوت لە هەردووکیانەوەیە لەگەڵ ئەوەشا هەریەکەیان ئەیەوێت تاوانەکە بدات بەسەر ئەویتریاندا، دیسان لە نزیك کەسێکی باوەڕپێکراوەوە نیشتەجێ ئەکرێن بۆ ئەوەی چاودێرییان بکات و هەوڵی رێخستنیان بدات، جا ئەگەر ئەمەش هەر بێ سوود بوو، ئەوکاتە حەکەمێك لە کەس وکاری ژنەکە و یەکێك لە هی مێردەکەی تەرخان و دیاری ئەکرێن بۆ لێکۆڵینەوە" .[1]

ئاواز: کارو ئەرکی ئەو حەکەمە چییەو چی ئەبێ؟

دڵپاك: کارو ئەرك و پێویستی سەرشانی ئەو دوو حەکەمە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان ژن و مێردەکەیە، دیاری کردنی هۆیەکانی ئەو ناکۆکییەیە، بێگومان ئەوەش دەسبارێکی زۆر سەرکەوتووانەو باشە ئەگەر بێتو بەچاکیی و بە وردکاریی و دڵسۆزانە دەستی پێبکرێت و نییەتی پاك و بێگەردی لەگەڵدا بەکاربهێنرێت، چونکە خوای پەروەردگار خۆی لەو کارەدا یاریدەدەرە، ئەها ئەفەرمووێ: (إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا)، واتە مەرجی سەرەکی لەوەدا نیەتی دڵسۆزانەو پاك و چاکەویستی دوو حەکەمەکەیە، کە ئەو مەرجە هەبوو خواوەند سەرکەوتوویان ئەکات لە کارەکەیاندا، خۆ ئەگەر ئەو مەرجەیان تێدا نەبوو ئەوا پێچەوانە دەرئەچێت، ئەوەتا نەیگوتووە (إن لا يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا)! ئایا ئەمەش گەورەترین بەڵگە نییە لەسەر پەرۆشی ی ئیسلام بۆ رێکخستنەوەی ژن و مێرد یاخۆ تێکنەچوونی هێلانەی شادومانیی و بەختیارییان وەکە خێزانە؟

سکالا: ئایا ئەبێ ئەو دوو حەکەمە هەر بئەبێ داوەر (حاکم) هەڵیانبژێرێ؟

دڵپاك: مەرج نییە داوەر هەڵیانبژێرێ، کەس و کارو خزم و خوێش یان دۆست و برادەر و دراوسێش ئەتوانن هەڵیان ببژێرن، چونکە ئەوەی کە مەبەستە هەڵسانە بەکارەکە نەك شتێکی تر، تەنیا مەرجێ کە ئەبێ بەرچاو بگیرێت دڵپاکی و دڵسۆزی و لێزانیی دوو حەکەمەکەیە، تەنانەت زانایان رایان وایە سەرکەوتنی ئەو دوو حەکەمە بەپێی ئایەتەکە (وەك گوتمان) بەستراوە بە نییەتی چاك و ویستی گەرموگوڕی ئەوانەوە، زومەخشەری پێشەوا ئەڵێت: "مەبەستی دوو حەکەمەکە چاککردنی پەیوەندی نێوان ژن و مێردەکەیە، جا ئەگەر نییەتیان پاك و دڵیان ساف بێت و ئیشەکەیان لەبەر خوا بێت، ئیشەکەیان پیرۆزیی تێئەکەوێ، خوایش بەبۆنەی پاکی دەروون و چاکیی کۆششیانەوە گونجاندن و خۆشەویستی ئەخاتە دڵی ژن و مێردەکەوەو سۆزو میهرەبانی ئەخاتە دەروونیانەوە".

---

1 – ج٧ ص١٨ لە کتاب المغني لإبن قدامة.

گەورەی مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب، دوو حەکەمی هەڵبژارد بۆ ئەوەی بکەونە نێوان ژن و مێردێکەوەو ناکۆکییان لابەرن، گەڕانەوەو پێیان ڕاگەیاند کە لە کارەکەیاندا سەرکەوتوونەبوون، عومەری خواناس توڕەبووو گوتی: (درۆ ئەکەن، بەڵکو ویستێکی ڕاستتان لە چاککردنی نێوانیاندا نەبووە، خۆ ئەگەر ئەو ویستەتان ببوایە خوا پیرۆزیی ئەخستە کۆششەکەتانەوە، ئەی خوا نەیفەرمووە: (إِن يُرِيدَا إِصْلَاحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا)؟ بەڵێ ئیشەکە وەهابوو کە عومەر فەرمووی، دوو حەکەمەکە شەرمەزار بوون) سەرلەنوێ بە نییەتێکی پاکەوە دەستیان کردەوە بە هەوڵدان و ژن و مێردەکەیان ڕێکخستەوە.

ئاواز: دەی خۆ ئەو دوو حەکەمە ئۆکسجینیان پێ نییە، ژن و مێردەکەش ئاسن نین کە ئەوان لەحیمیان بکەن، گیروگرفتەکەش بە ژن و مێردەکەوە وابەستەیە... ئایا وانییە؟

دڵپاك: بەڵێ وەهایە، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەڵێین ئەبێ ئەو دوو حەکەمە زاناو زیرەك و دڵسۆزو نییەت پاك بن، ئەگەر وابوون و بەوردی هۆیەکانی ناکۆکییەکەیان دەستنیشان کرد، ئەوسا بەو ژیریی و نییەتە پاکەیانەوە ئەتوانن پیاوەکە قایل بکەن، واتە هەریەکەیان کەمێك لە ڕاکەی خۆی کەمێك بێتە خوارەوەو دەست لە توندوتیژیی خۆی هەڵبگرێت، بەوەش سافیی و پاکیی ئەگەڕێتەوە بۆ نێوانیان، ئەی زۆربەی هەراو ناکۆکی و درێژەکێشانی و مانەوەی بەهۆی لەیەکتر نەگەیشتنەوە نییە؟

خۆ ئەگەر ئەو ژن و مێردە موسڵمانی تەواوبن، بێگومان هیچکامیان لە هاتنەخوارەوەکەدا هەست بە نەنگ و ژێرکەوتن ناکات، بگرە لەوەدا بە خۆشحاڵییەوە هەوڵی دەست پێش ختسن ئەدات، چونکە بەوە ئەزانێ خۆی ئەخاتە بەر پاداشت و بەزەیی خوای گەورە، ئەزانێ کە کارەکەی ئەو ژێرکەوتن نییە، بەڵکو لێبوردن و بەخشینە، ئەوەش هۆی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوایە، (ليس الواصلُ بالمكافئ ولكن الواصل الذي إذا قطعت رحمه وصلها) (صحيح البخاري).

## گۆشتت بخوا ئێسقانت ناشکێنێ

سکاڵا: باشە مامۆستا دڵپاك، ئەو دوو حەکەمە بۆچ ئەبێ یەکێکیان خزمی مێردەکەو ئەویتریان خزمی ژنەکە بێ؟ ئایا غەوارەبن چاکتر نییە؟ مەبەستم ئەوەیە غەوارە بێلایەنە.

دڵپاك: وا نییە چاوەکەم، لەوانەیە ئەو گیروگرفتەی کە بووەتە هۆی ناکۆکی نێوان ژن و مێردەکە پەنهانییەکی وەهابێ کە بەهیچ جۆرێ حەزنەکەن بێگانە بیزانێت، دیارە ئەوکاتە هۆ سەرەکییەکە هەرگیز باسناکەن و ئەیشارنەوە، ئایا تۆ دڵنیایت کە بێگانە ئەو نەنگەی یان ئەو پەنهانییەی کە بۆی دەرئەکەوێ، بڵاوی ناکاتەوە؟ بەڵام خزم نەنگ و پەنهانی خزمی خۆی ئەپارێزێ و ئەیشارێتەوە، دایئەپۆشێ و بڵاوی ناکاتەوە، چونکە خۆیشی بەشداری ئەو عەیب و نەنگەیە، پێشینان خاوەنی تاقیکاریین و بە هەوانتە نەیانگوتووە: (خزم ئەگەر گۆشتت بخوات ئێسقانت ناشکێنێ)، هەروەها شیعرێکی فۆلکلۆریی ئەڵێت:

هەرکەس بێگانە بکەرۆ بەخوێش

مدۆ بەسەردا هەردوو دەسی وێش

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە خزم و کەسوکار زیاتر ڕەحمی بەو ژن و مێردەوە هەیە لە بێگانە، ئەی هەراو ناکۆکی نێوان ئەو ژن و مێردە یەخەی کەسوکاریشیان ناگرێت و پەرێشانیان ناکات؟ لەبەر ئەوەش ئەو هەوڵ و دڵسۆزیی و نییەتە پاك و گەرمەی کە لە خزم و کەس وکار ئەوەشێتەوە، زۆر کەم ڕێئەکەوێ کە لە بێگانە بووەشێتەوە، دیارە خزم ئەوپەڕی هێزو توانا بە پەرۆشییەوە بەکارئەهێنن بۆ ڕێکخستنەوەیان.

لەگەڵ ئەو هەمووەشدا مەرج نییە کە دوو حەکەمەکە لە خزمو کەسوکاری ژنەکەو مێردەکەبن. بێگانەش بێت هەر ئەکرێت، بەڵام دیارە خزم بن چاکترە لە بێگانە، ئایەتەکە بۆ (ندب)ە نەك بۆ (فرض).

ئاواز: ئەی ئەگەر هاتوو دوو حەکەمەکە هەموو ئەو مەرجانەشیان تێدا هەبوو کە ئیسلام پەسەندیان ئەکات، لەگەڵ ئەوەشا لە گرنگە (مهمه)کەیاندا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، چ دەکرێت؟

دڵپاك: ئەوسا دوو حەکەمەکە بۆیان هەیە بڕیاری خۆیان بدەنو جێبەجێشی بکەن، چ لەڕووی هێشتنەوەیان لە شێوەی هاوسەرییداو چ لەڕووی لەیەکتر جیاکردنەوەیانەوە، چ ژنو مێردەکە بیانکەن بە وەکیلی خۆیان و رازین بە بڕیارەکەیانو چ رازی نەبن،[1] ئەمەش رای (علي، إبن عباس، أبي سلمه بن عبدالرحمن، الشعبي، النخعي، سعيد بن جبير، مالك، الاوزاعي، إسحاق، إبن المنذر)ە.

ئاواز: منیش بیستوومە لەم دواییەدا فەرەنسە دەستی داوەتە ئەم سەرەتاو بنەمایەو سەرۆکی دادگا دەسەڵاتی هەڵبژاردنی ئەو دوو حەکەمەی پێسپێراوە، تا دیراسەی ناکۆکی ژنو مێرد بکەنو هەوڵی رێکخستنەوەو گونجاندنیان بدەن.

سکاڵا: بەڵام ئیسلام (١٤٠٠) ساڵ زیاتر پێش ئەوان کەوتووە، پەندێکیش ئەڵێ: ( الفضل للمتقدم)، باوەڕناکەم وەك ئیسلام بەو فراوانیی و وردەکاریی و قووڵییەش دەستی بۆ بەرن.

## حوکمەکانی ئیسلام بۆ دنیاو قیامەتن

ئاواز: ئەگەر لێم دڵگران نەبیت (دڵپاك) پێت ئەڵێم: "یاساو بەرنامەی ئیسلام بەڵێ راستو پاكو دادپەروەرانەیە.، بەڵام لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ! چونکە هەموو شتێك ئەداتە دەست دنیاکەی تر واتە قیامەت، بەوپێیەش هیچ کاریگەرییەکی بۆ ئەم دنیایە نامێنێتەوە، بۆ نموونە: رێگرێك من یان تۆ لە رێگادا رووت ئەکاتەوە، چۆن ئەبێ گوێی نەدەینێو بڵێین لەو دنیا خوا هەقمان ئەسێنێ لێی؟! ئاخر چۆن وەها ئەبێ؟!

دڵپاك: من بەو قسانەی تۆ هەرگیز دڵگران نابم چونکە راست نینو هی خۆیشت نین، بەپێچەوانەوە بە قسەکانت دڵشاد ئەبم، چونکە راستیت ئەخەمە بەرچاو، ئیتر لێم وەربگری یان وەرنەگری ئەوەیان بەگرنگ نازانم، ئەنجامەکەی خۆت ئەیدۆزیتەوە، گوناهت بە ئەستۆی خۆت، من تەنیا بیرخستنەوەم لەسەرە (فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ * لَسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ) (الغاشية: ٢١ -٢٢)، تۆ ئەگەر نیگەران نەبیت پێت ئەڵێم: ئەوەی کە گوتت، شریتی قەوانێکی کۆنی باو نەماوەو تازە گەیاندوویانەتە لات.

ئاواز: ئاخر نەرێکردن (النفي) بەڵگەی ئەوێ؟

دڵپاك: هەرچەند لە نەرێکردنەکەدا تۆ پێش دەستیت کردو ئەبوایە من داوای بەڵگەم لەتۆ بکردایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەم راستیت پێبڵێمو بە بەڵگە بۆت بچەسپێنم.

ئەو ئیسلامەی کە دراوە بەگوێی تۆدا لەگەڵ ئەو ئیسلامەی کە خوای پەروەردگار ناردوویەتی جیاوازییان وەك جیاوازیی زەمینو ئاسمانە، ئیسلام (بەرنامەی خوا) پڕە لە ئەحکام، ئەحکامەکانیشی بریتین لەو مەبادیئو نەزەریاتانەی کە لە شێوەی قورئاندا هاتوون بۆ مرۆڤو پێغەمبەریش ﷺ بە گوفتارو کردارە شیرینەکانی خۆی بۆی تەفسیر کردووین، بە تێکڕای ئەو مەبادیئو نەزەریاتانە ئەگوترێت شەریعوتی ئیسلام، واتە شەریعەتی ئیسلام ئەو کۆمەڵە نەزەریاتو مەبادیئانەن کە ئیسلام هێناونی لە: یەکتای خوا، لە ئیمان، خواپەرستی،

[1] فقه السنة، ج٢ ص٣٠٨ ، للسيد السابق.

(الأحوال الشخصية)، تاوانەكان (الجرائم)، مامەڵە (المعاملات)، بەڕێوەبردن (الادارة)، رامیاریی (السیاسة)، مەبەستو لایەنەكانی تردا، ئایا تۆ بەمانەت زانیوە، یان پێیان ئەزانی؟

سكالاّ: خۆ ئەو وەڵامی نەدایتەوە، بەخوا نەزانیویەتیو نە ئەشزانیٚ!.

دڵپاك: خوشكی ئازیزم، ئەو حوكمانەی كە ئیسلام هێناونی دوو جۆرن: ئەو حوكمانەی كە ئاینی پێهەڵئەسێنرێت كە ئەمانەش پێیان ئەگوترێت (العقائدوالعبادات)، دووەمیش ئەو حوكمانەی كە دەوڵەتو كۆمەڵو كۆمەڵگەی پیٚ رێكئەخرێتو پەیوەندیی كەسانو كۆمەڵان بەیەكترەوە ئەڕەخسێنیٚ، ئەمەش حوكمەكانی معامەلات، عقوبات، ئەحوالی شەخصی، ئەحكامی دەستووریی، نێودەوڵەتییو... هتد ئەگرێتەوە. دەی ئایا ئەمەیان بۆ باسو شەرح كردوویت؟.

ئاواز: بۆچ ئیسلام ئاوڕ لەو لایەنانەش ئەداتەوە؟!!.

دڵپاك: خوا لێت ببوریٚ خوشكەگیان، ئیسلام دنیاو قیامەت لەیەكتر جیاناكاتەوە، بەڵكو ئەیانشێلیٚ بەیەكدا، مزگەوتو دەوڵەت بەیەك شت سەیر ئەكات، ئیسلام دینو دەوڵەتە، پەرستشو سەركردایەتییە، هەروەك ئایین پارچەیەكە لە ئیسلام، دەوڵەتیش پارچەیەكی تریەتی، بگرە بەشە گرنگەكەیان ئەمە، ئەی ڕەحمەتی خوا بە بەردەوامیی بڕژیٚ بەسەر گیانی پاكی (عوسمانی كوڕی عەففان)دا كە فەرموویەتی: (إنّ الله لیزع بالسلطان ما لا یزع بالقرآن).

حوكمەكانی ئیسلام بە هەموو جۆرەكانیەوە، بۆ بەختیاركردنی ئادەمیزاد هاتوون، چ لەم دنیاداو چ لەو دنیادا، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو كارێك لەم دنیایەدا بەپێی شەریعەت دوو ڕووی هەیە، یەكێكی دنیاییو یەكێكی تری قیامەتی، كاری پەرستش، مەدەنیی، جینائیی، دەستووریی، یاخۆ دووەلیی، شوێنەوارو ئەنجامێكی دنیایی هەیە، لە بەجێهێنانی ئەركدا، لە دانان، یاخۆ لابردنی پاشاو دامەزراندنی دەزگای راستی، یان لابردنی ناهەقی، لە جێبەجێكردنی تۆڵەسەندندا لە تاوانبار... هتدا. لە هەمانكاتدا هەر ئەو كارە شوێنەوارو ئەنجامێكی تری قیامەت چاوەڕێی ئەكات،كە ئەویش، یان پاداشت دانەوەیە، یان سزادانە.

ئاواز: ئەگەر راستیت ئەویٚ لەم باسەی دوایی چاك تێنەگەیشتم!.

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، ئێمە گوتمان ئیسلام بۆ بەختیاركردنی ئادەمیزاد هاتووە، بەختیاركردنی لە هەردوو جیهاندا بە واتا یەك یەكە (وحدة)یەو بەشبەشكردن ناگرێتە خۆی، لە ئیسلامدا (ما لله فهو لله وما لقیصر فهو لقیصر) نییە، بەڵكو هەموو شتیٚ بۆ خوایە، ئیسلام وشەیەكە هەر كە پیت پیت تەماشا كرا، ئەوا ئەشێویٚو پیتەكان مانا نادەن بەدەستەوە بە جیاجیا.

هەركەس بە لێبڕانەوە تەماشای قورئان بكات، بەتایبەتی ئایەتەكانی حوكمەكان، زۆر بە ڕوونییو بەجوانی ئەبینیٚ كە هەر یەكە لەو حوكمانە دوو تۆڵەی تێدایە بۆ تاوانبارو دوو پاداشتیش بۆ كارچاك، یەكێكیان لەم جیهانەداو یەكێكی تریان لە قیامەتدا. بۆ نموونە: تۆ باسی رێگرت كرد، دەی لە ئیسلامدا رێگر، لە دنیادا سزاكەی كوشتن، پارچەپارچەكردن، چوارمێخە كێشانو دوورخستنەوەو شار بەدەركردنە، لە قیامەتیشدا سزایەكی زۆر گەورەیە، خوای گەورە لە یاسای قورئانیی ژمارە (٣٣)ی سوورەتی (المائدة)دا سەبارەت بە رێگرو رێگریی ئەفەرموویٚ: (إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ). ئایا ئەوەی كە گوتت وەها بوو؟، خۆت حوكمی خۆت بدە.

ئاواز: بەڵام ئەی بۆچ مسوڵمانان لە دنیادا ئەو حوكمانە جێبەجیٚ ناكەن؟

دڵپاك: من ئەڵێم نێرەو تۆیش هەر ئەڵێیت بیدۆشە، ئەی فەرموودەکەی (عوسمانی کوڕی عەففان)م نەدا بەگوێتدا؟ یان لێی تێنەگەیشتی، هیوادارم ئەو نموونەیە وەك دڵۆپێك لە دەریایەك بزانی، بێگومان خۆت بیستووتە کە (مشتێك نموونەی خەرمانێکە).

سکالاّ: خوا پاداشتت بداتەوە، ئێمەی هەژار زۆر بەجێماوین.

## هەمووماں بەرپرسیارین

سکالاّ: ئاە ! ئەم ئیسلامە تەواوە بێگەردە، توخوا حەیف نییە پەیڕەویی نەکرێت؟، بۆچ دەستمان بەرداوە لێی؟، بۆچ بەمجۆرە بێئاگاین لێی؟ ئێمە ئیسلاممان پێنەناسراوە، دڵپاك گیان ئەوەش تاوانە.. تاوان.، ئادەی پێم بڵێ لەم تاوانەدا کێ بەرپرسیارە؟

دڵپاك: بەڵێ، ڕاست ئەکەی تاوانێکی بێوێنەیە، چی لە شاردنەوەی ڕاستی تاوان ترە؟ بەلاّم مامۆستا سکالاّ، ئەگەر تاوانەکە بدەین بەسەر کۆمەڵێکی دیاریکراودا، بەوەش ئێمە ستەمکار دەرئەچین، واتە نابێ بڵێین فلاّن کۆمەڵ خۆی تەنیا بەرپرسیارە، ڕاستییەکەی مسوڵمانان هەموویان تاوانبارن، هەموویان بەرپرسیارن لە شاردنەوەو دوورخستنەوەی ئیسلام لە ژیان.

بەڵێ هەموویان بەجارێکدا بەرپرسیارن، ئەوەندە هەیە کە بەرپرسیاریی هەندێکیان لە هی هەندێکی تریان زیاترو فراوان ترە، ئاشکرایە ئەوانەیان کە زاناو کاربەدەست و خاوەن دەسەلاّت و دەمڕاست بوون، بەرپرسیاریی ئەوان لە پلەی یەکەمیندا دێت، ئینجا بەو پێیە بەدوای ئەواندا بەشەکانی تری کۆمەڵگەی ئیسلامی سەرەیان دێت.

جەماوەری مسوڵمان بەرپرسیارە، چونکە ئایینەکەی ناناسێت، شارەزایی لە چەندەها شت و ڕێگەو کۆمەڵێتردا هەیە، کەچی لە ئایینەکەیدا نەخێر، بەهۆی ئەوەشەوە هەنگاو هەنگاو لایدا لێی، دوورکەوتەوە لێی و فەرامۆشی کرد، بەبێئەوەی بەخۆی بزانێ ئیسلامی لەخۆی داماڵیووە، فڕی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە، لەگەڵ کوفرو خراپەکاریی و تاوانبارییدا ئەوەندە ئالوودە بووە، کە بیر لەوە ناکاتەوە ئەو ئالوودە بوونە خۆی لەخۆیدا تاوانە، چ جای تێکەڵ بوون و کردنی. لەوانەیە بڵێیت: ئاخر خەڵك نەزان و نەخوێندەوار بووە، بەلاّم ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو نەزانی و نەخوێندەوارییەش هەر تاوانە، ئیسلام لەسەر مسوڵمانان پێویست (واجب)ی کردووە کە زانابن، نەك نەزان، کە ئایینەکەیان فێربن، شارەزای بن، یەکتر فێربکەن، (فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ) (التوبة: ١٢٢).

جەماوەری مسوڵمان ئەمڕۆ لە بێئاگاییەکی سامناکی کوشندەدایە، ئەمڕۆ بێئاگایە لە ئایینەکەی، تەنانەت لە دنیاکەیشی، لە گیان و خودی خۆی، خۆزگەم بەو ڕۆژەی کە چاوی خەواڵووی ئەکاتەوەو ڕاستی ئەبینێ، ئەوسا تێئەگات کە دۆڕاوە، دنیا و قیامەتی لەدەست چووەو ئیتر مەگەر هەر بڵێ: "ئەمیشم چوو، ئەویشم چوو، بەجارێ ماڵم وێران بوو".

دەوڵەتە ئیسلامییەکان بەرپرسیارن و بەرپرسیارییەکەشیان لە هی جەماوەر گەورەو فراوانترە، چونکە لەژێر باڵی حوکمی ئەواندا ئیسلام لە کاروباری ژیان دوورخرایەوە، ئەوەی خوا حەرامی کردبوو حەلاّڵ کراو، ئەوەش خوا حەلاّڵی کردبوو حەرامکرا، لەژێر باڵی حوکمی ئەواندا جەماوەر لە ئیسلام کرایە دەرەوە، لە حوکم و ڕامیاریی و ئیدارەی ئیسلامی دوورخرایەوە، دیارە سەرۆکەکانی ئەو دەوڵەتانەش لە پلەی یەکەمی بەرپرسیارییەکەدان.

زانایانی ئیسلام برپرسیارن، تاوانبارن سەبارەت بەو گومڕاییەی کە ئێمەی تێداین، سەبارەت بەوەی بەسەر ئیسلامدا هات ، سەبارەت بەوەی کە حاکمانو حوکمەتانی ئیسلامی کردییان، سەبارەت بەو بێئاگاییەی کە جەماوەری مسوڵمان تێیدا ونبوونو لە ئیسلام دوورکەوتوونەتەوە.

زانایانی ئیسلام، جەماوەریان تێنەگەیاند، ئیسلامیان پێنەناساند، شێوە پاکو راستەقینەکەی ئیسلامیا ن وەك خۆی نەخستەڕوو، لارییو خواریی حاکمانو حوکمەتە ئیسلامییەکانیان لە جەماوەر ئاشکرا نەکرد، بەرامبەر ستەمو ستەمکاران بێدەنگ بوون، کەسایەتی خۆیانیان لە ئیسلام خۆشتر ئەویست، باسی جیهادیان خستە ناو سەبەتەی لەبیرچوونەوەوە.

بەڵێ، کۆمەڵێکی کەمیان هاتنە زمانو لە هەموو چەرخێکدا هاتوونەتە زمانو بەکردارو هەڵوێستی مەردانەوە بەرامبەر ناهەقی وەستاون، درێغییان نەکردووە، سەرو ماڵی خۆیان لە پێناوی ئیسلامدا بەختکردووە، بەڵام کۆمەڵێکی کەم بوون، هەزارەها ماری تۆپیوی خراوەتە بەر پێ، دەیان کۆسپیان لە رێگەیاندا دروستکردووە، نەیان هێڵاوە بگەن بە ئامانجی پاکی خۆیان، بەمجۆرە ئەبینین هەموومان بەرپرسیارین، خوا حیسابمان لەگەڵدا ئەکات، دەبا پێش ئەو حیسابە خۆمان حیساب لەگەڵ خۆماندا بکەین.

## خوا دڵی کردوومەتەوە

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، باسەکانی ئەم هەفتەیەم زۆر بەلاوە جوانو بەتامو تاسۆغ بوون، ئای کە حەز لە باسەکان ئەکەم!، پێمخۆشە هەمیشە قسەم بۆ بکەیتو گوێت لێبگرم، لە قوتابخانەدا خوا خوامە زوو بگەڕێمەوە هەتا لەگەڵتا دانیشمو کەڵك لە باسەکان وەربگرم، ئەگەر لەبەر وەڕەسکردنو ئازاردانی تۆ نەبێت، حەز ئەکەم بە شەویشدا نەخەوینو پرسیارت لێبکەمو گوێ لە وەڵامەکان بگرم.

ئاواز: هم..! دەی جا مەخەون، خۆ خەو ئەوەندە پێویست نییە، بەشکو بەمزووانە دڵپاك بڕوانامەی دکتۆرات بداتێ لە...

سکاڵا: ئێ، بۆچ تەواوت نەکرد؟، جا تۆ بۆچ پێت ناخۆشە؟، هەرچۆنێك ببێ، لە فڕوفیشاڵەکەی تۆ چاکترە، قسەی زیاترم پێ مەکە.

دڵپاك: نا، سکاڵا گیان نا، قسەکردن بۆ تۆ جوان نییە، نابێ لە قسەی مامۆستا ئاواز نیگەران بین، ئەبێ بەچاوی رێزەوە تەماشای بکەینو بە خوشکی گەورەی خۆمان داینێین، هەرچی بڵێتو بە هەرجۆر بێتە گۆ، ئەبێ رێزی راکەی بگرین، ئەو وای بەڕاست ئەزانێ.

بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان، ئەترسم مەبەستت کەڵك وەرگرتن نەبێت خوشکە سکاڵا، باسەکان بەشێوەی چیرۆك بێنە بەرچاوت، چونکە هەندێ کەس حەزو ئارەزووی چیرۆك بیستنی بەهێزە.

سکاڵا: بەخوا ئەوەیان نییە، بەڵکو باوەڕم بە کەڵکیی باسەکان زۆر بەهێزە، زۆر بەکەڵکی من دێن، رێگای هەردوو ژیانم بۆ رۆشن ئەکەنەوە، خوا یاربێت بناغەی ژیانمیان لەسەر دائەمەزرێنم.

دڵپاك: حەز ئەکەم وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە، لە مەسەلەی ناچیزەیی چی فێربوویتو چ یاسایەکت هاتووەتە دەست؟.

سکاڵا: ناچیزەیی وەزعێکی ناسرووشتییە کە دێت بەسەر پەیوەندی نێوان ژنو مێردا، ئەبێتە هۆی دروست بوونی هەراو ناکۆکی لە بەینیاندا، ئەمجا ئەگەر هۆیەکەی لەلایەن ئافرەتەوە سەری هەڵدا ئەوا بە ناچیزە دائەنرێو ئەبێ نرخەکەی بدات، ئەگەر لەلایەن مێردیشەوە بوو ئەوا هەر بە ناچیزە دائەنرێتو ئەویش هەر ئەبێ

نرخەکەی بدا، ئەگەر هەریەکەیان ویستی تاوانەکە بدات بەسەر ئەویتردا، ئەبیٚ حەکەم بکەویٚتە نیٚوانیانەوەو هەوڵی چاککردنو ریٚکخستنەوەیان بدات.

ئەوەی کە زۆر سەرسامی کردووم، ئەوەیە کە ئیسلام تا ئیٚرە لە باسکردنی تەڵاق دوورە پەریٚزیی کردووە!، ئەوەش وائەگەیەنیٚ کە ئیسلام ئیحتمالی گونجانو سازاندنی لە تەڵاقدانو جیابوونەوە بەگەرمترو چاکتر زانیوەو داناوە، ئەوەش ریٚزی خیٚزانو خیٚزانداریی بەئاشکرا ئەنویٚنیٚو بەرژەوەندی گشتیی ئەپاریٚزیٚ.

دڵپاك: سوپاس بۆ خوا، بەڕاستی چاك تیٚگەیشتوویت، قەت باوەڕم نەئەکرد بەم شیٚوەیە ئەو باسە لە میٚشکتدا بمیٚنیٚتەوەو بەم خەستییە وەری بگریت، ئەمەش وائەگەیەنیٚ کە دڵت بەرامبەر خوای خۆت پاكو سافەو بە نییەتیٚکی پاکەوە هاتوویتە مەیدانەوە، ئەو کەسەش کە وەها بیٚت خوا یارمەتی ئەداو فیٚری ئەکا، (واتّقوا الله ويُعَلِّمُكم الله).

سکاڵا: بەڵیٚ.. بەڵیٚ، خوای میهرەبان دڵی کردوومەتەوە، پەردەی رەشی سەر چاوو دڵمی رەواندۆتەوە، ئیٚستا هەست بەخۆم دەکەم کە لە جاران زووترو چاکتر شت فیٚرئەبمو وەرئەگرم، لەبەر ئەوەش دڵم بەخۆمو ئەم ژیانە نوییەم خۆشەو هەست ئەکەم کە هەمیشە بەختیاریی ئەڕژیٚتە دڵ و دەروونمەوە، خوا دڵی کردوومەتەوە.

دڵپاك: مامۆستا ئاواز بیٚدەنگ دیاریت!.

ئاواز: خەریکە بەرەو باسیٚکی ئاڵۆز ئەچین، باسی تەڵاق ئاه تەڵاق!، ئەو چەکوشە پۆڵایینەی کە دراوەتە دەست پیاو بۆ پانکردنەوەی سەری ئافرەتی بەسەزمان، با باسی نەکەین چاکترە وازی لیٚبیٚنین!.

دڵپاك: ئادەی بیڵیٚرەوە، چەکوشی پۆڵایین!، پانکردنەوەی سەری ئافرەتی بەسەزمان!، ئەمە یانی چی مامۆستا ئاواز؟!.

ئاواز: بۆچ خۆت نابەڵەد ئەکەی؟، گوایا نایزانی؟، ئیسلام وشەی تەڵاقی داهیٚنا، ئەمجا وەك چەکیٚکی کوشندە دایە دەست پیاو، هەر کە ئارەزووی هەبیٚ بەکاری ئەهیٚنیٚ دژی ئافرەت، ئەی نەدراوەتە دەست پیاو؟ هەر کە مەیلی ببیٚت ناتوانیٚت ژنەکەی تەڵاق بدات؟، ناتوانیٚ لەماڵ بیکاتە دەرەوە؟، خۆ ئیسلام نایداتە دەست ئافرەتو نەیشی داتە دەستی، گوایا ئەوە سەرپانکردنەوە نییە؟ لیٚم ببورن، لەوانەیە هەستم بریندار کردبن.

دڵپاك: نا خوشکەگیان نا، هەستمان بەوە بریندار نەبووە، بەڵکو ریٚگات بۆکردینەوەو فیٚرت کردم کە لەکویٚوە بچمە ناو باسەکەوە، خوا پاداشتت بداتەوە، وەك (محمد سعيد بوطي) ئەڵیٚت: (ربّ ضارة نافعة، ورب عمل استهدف شيئاً فأتى بنقيض).

جا بۆ ئەوەی دەرکەویٚ کە ئیسلام وشەی تەڵاقی دانەهیٚناوە، پیٚوستە پەنا بەرینە بەر میٚژوو، تا گەواهیمان بۆ بدات، بەڵیٚ بەکورتی باسی تەڵاق لە میٚژوودا بکەین، ئەوسا باسی تەڵاق لە ئیسلامدا ئەکەین، جا راستیو ناڕاستی دەرئەکەویٚ، وەك ئەزانی راستی شەرمی لەهیچ نییەو سەر بە هیچ کەسیش نییە و سەربەخۆیە، (الحقّ يعلوا ولايعلى عليه).

## تەڵاق لەمێژوودا

دڵپاك: بێگومان هەموو ئایینەكان بە درێژایی ژیانی ئادەمیزاد روویان كردووە بەلای مەسەلەی تەڵاقەوەو پشتگوێیان نەخستووە، جا هەریەكەیان بەپێی شێوەو سرووشتی تایبەتی خۆی، قابیل نییە كە پەروەردگاری ژیان و ئادەمیزاد، ئەو لایەنە گرنگەی فەرامۆش كردبێ، هەروەها ئەو كۆمەڵانەش كە ئایینی ئاسمانییان نەبووە، یاخۆ هەبووە بەڵام بەگوێی پێغەمبەرەكانیانیان نەكردووە، هەرجۆرە داب و باوو نەریت و یاسایەكیان لەم رووەوە هەبووە، چونكە ئادەمیزاد بە سرووشت حەز لە یاساو باوو نەریت ئەكات و زۆر جار ژیانیش ئەیانسەپێنێ بەسەر ئادەمیزادا.

هەموو كۆمەڵگەیەك، ئەو كۆمەڵگەیە هەرچۆن بووبێت، پێویستی (الضرورة) ناچاری كردووە كە ئاوڕ لە ژنهێنان و شووكردن و گیروگرفتی نێوان ژن و مێرد بداتەوە، یەكێك لەو گیروگرفتانە، یان با بڵێین لە ئەنجامی ئەو گیروگرفتانە جیابوونەوەی ژن و مێرد بووە لەیەكتر، ئەی تەڵاق جیابوونەوە نییە؟، ئایا ئادەمیزاد ناچار نەبووە كە حیسابێكی بۆ بكات؟ بەتایبەتی سەبارەت بە میرات، بۆ ئەو بەچەو وەچانەی كە لێیان كەوتوونەتەوە، تۆ بڵێی كە ئادەمیزاد لەكۆندا خاوەنی ویژدان نەبووبێت و گوێی نەدابێتە پاكی و ناپاكیی كردن؟، تۆ بڵێی گوێی بە مەسەلەی هاوسەریی نەدابێت؟ مێژوو گەواهی بوونی هاوسەریی و بوونی بەشێوەی جۆربەجۆر ئەدات، دیارە بوونی هاوسەریی، بوونی تەڵاقی بەدەمەوە بووە، ئایا بوونی دار خورما، بوونی خورما مسۆگەر ناكات؟، هەر كە رۆژ بووەوە خۆر هەڵنایەت؟.

بوونی هاوسەریی و جیابوونەوەی ژن و مێرد بەهۆی گیروگرفتی ژیانەوە، واقیعێك بووە لەناو میللەتان و كۆمەڵگەكاندا، كە ژیریی و ژیربێژی ناتوانن ددانی پێدا نەنێن و نەفی بكەن، ئیتر چۆن راست و گونجاوە كە تەڵاق بە داهێنراوێكی ئیسلامیی دابنرێت؟.

بەڵام بۆچ خەڵك تەڵاق بە موڵكی ئیسلام دائەنێ؟، ئیسلام بە كەوتنی تەڵاق بەتەواویی، ژن و مێردەكە لەیەكتر حەرام ئەكات، واتە لە ئیسلامدا جیاوازیی نێوان حەڵاڵ و حەرامی پەیوەندی ژن و پیاو لە بوون و نەبوونی تەڵاقدایە، هەركە بوو حەڵاڵن لەیەكترو بەپێچەوانەشەوە، لێرەشدا ئەبێ ئێمە شانازیی بە ئیسلامەوە بكەین كە حەڵاڵ و حەرام، پاك و پیس، لەیەكتر جیائەكاتەوە.

### ١- تەڵاق لە یۆناندا

دڵپاك: پیاو لە یۆناندا بەهۆ (سبب)، یان بەبێ هۆ ژنی تەڵاق ئەدا، كەچی ژن جگە لە دوو حاڵەتدا مافی تەڵاق لێسەندنی (واتە داوای تەڵاقی) لەپیاو نەبوو، یەكەمیان كەمتەرخەمیی پیاو لە ئەركی ژن و مێردییدا، یان لەكاتی رۆچوونیدا لە ناپاكی و داوێن پیسییدا، یاخۆ لەكاتی شێتیدا، دووەم ئەگەر پیاو بەتەواوی لەگەڵ ژنەكەیدا خراپ بووایە، دیارە سەلماندنی ئەوەش كارێكی ئاسان نەبوو.

ئینجا لەبەر ئەوەی كە پیاو مافی ئەوەی هەبوو كە پاش تەڵاقدان ژنەكەی مارەبكاتەوە، یان پیاو پاش مەرگی خۆی بەهۆی ئەو وەسیەتەوە كە كردبووی ژنەكەی ئەدرا بەوكەسەی كە دیاریی كردبوو، ئافرەت هیچ كەڵكێكی لە یاسای تەڵاق لێسەندن نەئەبینی، دیسان پیاو ئەگەر ژنەكەی نەزۆك بوایە ئەیتوانی تەڵاقی بدات و هەرچییەكیشی خەرجكردبوو لە لەپێناویدا، لە باوكی ژنەكەی ئەسەندەوە، بەكورتی یاساكە لە (نظري)ەوە نزیكتر بوو تا واقیع.

سكاڵا: ئای لەو یاساو ماسایە!، ئەوە گەورەترین دەوڵەتی كۆن لەڕووی زانیاریی و پێشكەوتنەوە لەگەڵ مەسەلەی تەڵاقدا، ئەبێ لە وڵات و شوێنە بچووك و دواكەوتووەكاندا چۆن بووبێت!!.

### ٢- تەڵاق لە رۆماندا

دڵپاك: لەو وڵاتەدا تەڵاق هەر لە چەرخە دێرینینەکانەوە بەدەست پیاوەوە بووە، ئافرەت مافی داواکردنی نەبووە، هەتاکو ئەوکاتەی کە پەیوەندیی لەنێوان کەسانی خێزاندا لاوازبوو، ئەوکاتە تەڵاق پەرەی سەندو یاساکە گۆڕا، ئەمجا ئافرەت لە چەرخی کلاسیکییدا مافی تەڵاقی مێردەکەی پێدرا، تەڵاقدان هەر کە ژن و مێرد مەیلیان بکردایە جێبەجێ ئەکرا، بەڵام ئیمپراتۆر (قسطنطین) ئەو مافەی بەستەوە (واتە سەربەستی ژن و مێردی لە تەڵاقداندا موقەییەدکرد) کەچی (جولیاس) کە بەدوای ئەودا هات یاسای تەڵاقی گێڕایەوە بۆ سەر شێوە کۆنەکەی خۆی، یانی (عادت حليمة الى عادتها).

ئاواز: بەهەر جۆرێك بێت، ئەمانە خاوەن ویژدان بوون لە چاو ئەوان.

### ٣- تەڵاق لە یەهوودییەتدا

دڵپاك: ئەوەی کە لە شەریعەتی یەهوودییەتدا هاتووەو پەیڕەویش کراوە، ئەوەیە کە تەڵاق بە بەهانەبوون، یان بەبێ بوونی بەهانەش ڕێگەی بۆ ئاچۆغ کراوە، وەك حەزو ئارەزووی پیاو لە هێنانی ژنێکدا کە لەوەی هەیەتی جوانتر بێ، بەڵام بەبێ بەهانوو بەچاك نەئەزانرا، بەهانوویش لای ئەوان دوو جۆر بوون:

یەکەمیان: نەنگی سرووشتیی (عيوب الخِلقة) وەك: شەوکوێریی، خێلیی، پشت کۆمیی، بۆنی بن باخەڵ، شەلیی، نەزۆکیی.

دووەمیان: نەنگی ڕەوشتی (عيوب الاخلاق) وەك: بێ حەیایی، زۆر بڵێیی، پیس وپۆخڵیی، دەم زەنیی و سەهەندیی، دەس پێوە نەگرتن (الاسراف)، زۆرخۆریی، ورگدۆستیی و قەڵەویی، هونەرکردن لەخۆراکدا، لوتبەرزیی و کەشخەکردن، زیناکردن گەورەترین بەهانوویان بوو، هەر ئەوەندە باسی زیناکردنەکە بڵاو ببوایەتەوە، گەرچی ئیسپاتیش نەکرایە، ئیتر تەڵاقدان مسۆگەر ئەبوو، تەنانەت ئەگەر مێردەکەی چاوپۆشیشی لەو تاوانە، یان لەو پڕوپاگەندە بکردایە، هەر ناچارئەکرا کە ژنەکەی تەڵاق بدات، لەکاتێکدا کە ئافرەت مافی داواکردنی تەڵاقی نەبوو، هەرچەندەش مێردەکەی عەیبدار بووایەو عەیبەکانیشی هەرچۆنێك بوونایە، ئەگەرچی زیناکردنیشی بەسەردا ئیسپات بکرایە.

ئاواز: ئەی هەزار ڕەحمەت لە کفن دزی پێشوو.

### ٤- تەڵاق لە مەسیحییەتدا

دڵپاك: مەسیحییەکان لەڕووی مەسەلەی تەڵاقەوە ئەبن بە سێ بەشەوە:

یەکەم: کاسۆلیك: ئەمانە بەهیچ شێوەیەك بواری تەڵاقدانیان نەئەداو بە ناڕەوایان ئەزانی، بەهیچ کلۆجێ ماوەی جیابوونەوەی ژن و مێردیان بەناوی تەڵاقەوە نەئەدا گەرچی هۆیەکەی گەورەترین هۆ بووایە، بگرە زیناکردنیش لە نەزەری کاسۆلیکدا نەئەبووە مایەی ناوبردنی تەڵاق، خۆ ئەگەر زیناکردنیش ڕووی بدایە، ئەوکاتە تەنها جیاکردنەوەیەکی لاشەیی (تفرقة جسمية) لەنێوان ژن و مێردا ڕووی ئەدا، کەچی لە ڕووی شەرعییەوە هەر بەشێوەی ژن و مێرد ئەمانەوە، هیچکامیان بۆی نەبوو هاوسەرێکیتر بۆخۆی بدۆزێتەوە، چونکە ئەوە بە چەند ژنێتی دائەنراو مەسیحییەتیش بەهیچ جۆرێ ڕێگای چەند ژنێتیی نەئەدا، گوێت لە باسەکەیە مامۆستا ئاواز؟.

بەڵگەیان لە مەزهەبەکەیاندا ئەوە بوو کە لە ئینجیلی (مرقص و مەتا)دا بەزمانی مەسیحەوە هاتبوو: (... هەردووکیان ـ ژن و مێرد ـ یەك لاشەن، واتە ئیتر دووان نین، بەڵکو یەك لەشن، ئەوەی خوا کۆیکردووەتەوە نابێت ئادەمیزاد لەیەکی جیابکاتەوە).

هەروەها لە ئینجیلی مەتا، ئیصحاحی (٥)ی ژمارە (٣١)دا هاتووە: (گوتراوە هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات، با تەڵاقنامەی بداتێ.. بەڵام من پێتان ئەڵێم: لەسەر زینا نەبێت، هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات ئەوە وای لێئەکات کە زینا بکات).

دووەم: پرۆتستانت: ئەمانە لە دوو حاڵەتدا بواری تەڵاقدانیان ئەدا، زیناو ئایین گۆڕیین، بەڵگەیان ئەو گوفتەبوو کە لە ئینجیلی (مەتیو لوقا)دا هاتبوو، گوایا عیسا پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەربێ لە ئامۆژگاریی (الجبل)دا گوتوویەتی: (هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات بەبێ ئەوەی کە زینای کردبێت، ئەوە وای لێئەکات کە زینا بکات، هەرکەس تەڵاقدراو مارە بکات بێگومان زینا ئەکات)، هەروەها یاساو باویان وەها بوون هەرکەسێك ئایینی خۆی بگۆڕایە، ئەوە بە مردوو دائەنرا، بێگومان مردوویش تەڵاقی هەڵئەوەشێتەوە، واتە ئەوکەسەش حوکمی مردووی بەسەردا بدرایە تەڵاقی هەڵدەوەشایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەریی بۆ هەردوولایان جارێکیتر مەحاڵ بوو.

ئاواز: ئەمەشیان هەر پڕ لەزەحمەت بووە، خێری بۆ ئافرەت تیا نەبوو.

سێیەم: ئەرسەدۆکس: ئەمەیان بە نەرمترین ڕاڕەوی مەسیحییەت لە بارەی ڕێدانی تەڵاقەوە دائەنرێت، چونکە بواری تەڵاقدانی بەهۆی دەرکەوتنی زیناوە دەدا (هەروەك لە ئینجیلدا هاتووە)، هەروەها پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر نەزۆکی ژنەکەدا، یان نەخۆشییەکی درم، یان ڕێکنەکەوتنو ئاژاوەی ژیانی ئەو ژنو مێردە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، ڕێگەی تەڵاقی ئەدا.

لەڕاستیدا ئینجیل ئەو جۆرە شتانەی تێدا نەبوو، بەڵام خۆیان پاش فراوانکردنی بواری تەڵاق، گەیشتنە ئەوەو ئەو مۆڵەتەیاندا، هەرچەندە کۆمەڵێکی سەر بەم ڕاڕەوە ئەو مۆڵەتدانەیان بەلاوە پەسەند نەبوو، چونکە هیچ سەنەدێکی لە ئینجیلدا بۆ نەدۆزرا بۆوە.

مەزهەبە مەسیحییەکان، حەرامکردنی ژنهێنانی تەڵاقدەرو شووکردنی تەڵاقدراویان لە ئینجیلی (مرقص)دا هەڵگۆزابوو کە ئەیگوت: (هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بداتو یەکێکیتر بێنێت ئەوە زینا ئەکاتو ئەگەر ژنێك مێردی خۆی تەڵاق بداتو شووی تر بکاتەوە ئەوە زینا ئەکات).[1]

سکاڵا: بەهەر جۆر ببێ، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە وشەی تەڵاق ئیسلام داینەهێناوەو لە پێش هاتنی ئیسلامدا هەبووە.

### ٥ - تەڵاق لەسەردەمی نەفامییدا

دڵپاك: خاتوو عائیشە دایکی مسوڵمانان ڕەحمەتی خوای لێبێت بۆمان ئەگێڕێتەوە: (پیاو ژنی خۆی بەپێی هەوەسی خۆی تەڵاق ئەدا، ئەگەر لە عیددەدا بووایەو بیویستایە بیگێڕێتەوە ژێر بەنی خۆی، ئەیگێڕایەوە، ئەگەرچی سەد جار یان یاتریش تەڵاقی بدایە، تەنانەت پیاوێك بە ژنەکەی خۆی گوت: واللە وەها تەڵاقت نادەم کە لێم بپچڕێیت، هەرگیزیش ناتهێنمەوە بۆلای خۆم، ژنەکە گوتی: ئەوە چۆن ئەبێ؟ مێردەکەی گوتی: تەڵاقت ئەدەم جا هەرکە خەریکبوو عیددەت تەواوببێت ئەتگێڕمەوە ژێر بەنی خۆم، ژنەکە چوو بۆ خزمەتی خاتووعائیشەو ئاگاداری کرد، ئەویش دەنگی نەکرد هەتا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوەو ئاگاداری کرد، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، هەتا قورئان هاتە خوارەوە: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) (رواه الترمذي).

### ٦ - تەڵاق لە ئیسلامدا

ئاواز: دڵپاك خان، بەسە باسی مێژوویی بەسە، ئادەی بزانم ئیسلام چۆنی لێکردو چی کر بە تەڵاق؟

دڵپاك: پرسیارەکەت جوانو بەجێیە، کە ئیسلام دەرکەوت ڕێگەی تەڵاقیدا بەڵام لە تەسکترین سنووردا، وەهایشی خستە بەرچاوی خەڵكو وای تێگەیاندن کە تەڵاقدان ناشیرینترین شتی حەڵاڵە لای خوای گەورە، ئەمەو ئیسلام پیاویشی سەربەستو ئازاد نەکردووە کە بەپێی حەزو هەوەسی خۆی دەست بۆ تەڵاقدان بەرێت، بەڵکو بەستوویەتی بەچەند بەستەرو (ضوابط)ێکەوەو ئافرەتیشی لەمافی تەڵاق بێبەش نەکردووە.

سکاڵا: مەبەستت چییە لەوەدا کە گوتت ئافرەتیشی لەو مافە بێبەش نەکردووە؟

---

١- فقه السنة، ج٢ ص٢٤٤-٢٤٦ للسيد السابق، الطلاق بين الفقه والقانون: ابراهيم النعمة.

دڵپاك: یانی ئیسلام له تەڵاقدا ماف به ئافرەتیش بەخشییوه، بەڵام له چەند سنوورو بەسته (قیود)ێكی دیاریكراودا، قورئانی پیرۆز پیاوان وریاو ئاگادار ئەكاتەوه كه لەو مەسەله پڕ لەمەترسییەدا هێمن‌و لەسەرخۆبن‌و له بەكارهێنانیدا هەڵەشه نەبن، ئەفەمووێ: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً) (النساء : ١٩ ).

ئیمامی طبری له تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: (بەچاكی‌و جوانی لەگەڵیاندا . لەگەڵ ژناندا . بجووڵێنەوه ئەگەرچی رقیشتان بێت لێیان، ئەگەر وابكەن خوا خێر ئەهێنێته رێتان، چ بەهۆی بەخشینی منداڵەوه پێتان لەو ژنانەتان، چ بەهۆی بەخشینی سۆزەوه پێتان بەرامبەریان، پاش ئەوەی كه رقتان بوو لێیان).[1]

پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ داوای له مێردان كردووه كه له تەڵاقدان دووربكەونەوه: (تزوجوا ولاتطلقوا فإن الله لايحب الذواقين والالذواقات) (رواه الطبراني)، لەوەش زیاتر، پێغەمبەر ﷺ تەڵاقدان لەبەرچاوی مسوڵمانان ئەبێزێنێ وه تەنانەت سوێندخواردن‌و سوێندان به تەڵاق به نیشانەی موونافیقان ئەژمێرێ: (ما حلف بالطلاق وما استحلف به الا منافق)،[2] دیسان رووئەكاته ئافرەتان‌و ئەیانترسێنێ: (أيما إمرأة سألت زوجها طلاقاً من غير ما بأس فحرام عليها رائحة الجنة) (رواه أصحاب السنن وحسنه الترمذي).

لەوەش زیاتر پێغەمبەر ﷺ ناوبردنی تەڵاقی بەبێ هۆیەكی رەوا، به گاڵتەكردن به سنوورو یاسای خوایی ناوبردووەو ئەفەرمووێ: (ما بال أحدكم يلعب بحدود الله، يقول: قد طلقت قد راجعت) (رواه ابن ماجة وابن حبان).

هەندێ له فەقیهانی ئیسلام وا بڕیاریان داوه كه لەبنەڕەتدا تەڵاقدان سڵ لێكراو (محظور)ه، یاخۆ سڵ لێكردنەوه (حظر)ه، كمال الدين إبن الهمام ئەڵێ: "لەبنەڕەتداو لەڕاستیدا سڵكردنەوەی تیایه، مەگەر پێویستی زۆربهێنێ " {شرح فتح القدير ٢٢/٣ طبعة بولاق} هەروەها (الكاساني) دەڵێ: "بنەڕەتەكەی سڵ لێكردنەوەو رق لێبوونەوەیه، سا مەگەر بۆ ژیركردن (تأديب) بێت".(بدائع الصنائع ٩٥/٣).

سكاڵا: ئێستا من وا بیرئەكەمەوه كه تەڵاقدانیش وەك لێدان، بۆ دەرمانكردنی دەرد بەكارئەهێنرێ، دەرمانێكەو چاوەڕوانی چاكبوونەوەی لێئەكرێت بەكارهێنانی له ئیسلامدا بەچاك نازانرێ.

دڵپاك: دەمخۆش، زیادی هەیەو كەمی نییە، (إبن عابدين) ئەڵێت: "بنەڕەت له بەكارهێنانی تەڵاقدا سڵ لێكردنه، بەو مانایه سڵی لێئەكرێتەوه، جگه له حاڵەتێكدا كه دێت بەسەراو رەوای ئەكات، واتای قسەی فەقیهان: (بنەڕەت له تەڵاقدا سڵ لێكردنه، رێگەپێدانی لەبەر پێویستیه بۆ رزگاربوون)، جا ئەگەر بەبێ هۆ بەكارهێنرا و لەپێناوی رزگاربووندا نەبوو، بەڵكو لەبەر كەرێتیی‌و به گەمژەیی (الحماقة والسفاهة)و تەنها بۆ كوفركردن به نیعمەتی خواو زیانگەیاندن بوو به ژن‌و كەسوكاری‌و منداڵەكانی، ئەگەر بۆ ئەمجۆره مەبەستانه بەكارهێنراو رێگەی رەوای خۆی پێنەگیرا، ئەوه لەسەر ئەصڵ‌و بنەڕەتەكەی خۆی ئەمێنێتەوه كه سڵ لێكردنه، بۆیه خوا ئەفەرمووێ: (فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلاً) (ابن عابدين ٤٢٧/٣)، هەروەها فەقیهان (الفقهاء) بڕیاریان وایه، ئەگەر ژنهێنان بۆ كاتێكی دیاریكراو بێت به دانەمەزراو ئەژمێرێت، چونكه تەڵاقدانی تێدا ئاشكراو مسۆگەره، لەكاتێكدا خوای گەوره ژنهێنان‌و شووكردنی بەو شێوەیه بۆ دانەناوین، بەڵكو بۆ درێژایی تەمەن دایناوه بۆمان، ئەگەر حەزئەكەن بەدرێژیی لەمه بگەن تەماشای (فقه السنة)ی سيدسابق و(الطلاق بين الفقه والقانون)، دانراوی ابراهيم النعمة بكەن.

سكاڵا: ئایا خەڵكی بەم راستیانه ئەزانێ مامۆستا دڵپاك؟ باوەڕ بكه ئەمه له خەڵكی شاراوەتەوه!.

1 – تفسير طبري ٣١٣/٤.

2 – رواه ابن عساكر عن انس.

دڵپاك: ناڵێم هەموو كەسێك نازانێ، بەڵام ناشڵێم هەموو كەسێكیش ئەزانێ، ئەوەندە هەیە خەڵك گەر نەزانێ ئەوەش هەر تاوانبارییە، ئەی ئەوە بۆچ خەڵك كون و كەلەبەرو قوژبنی بنەماكانی كوفر شارەزایە؟ ئەی بۆچ هەوڵی شارەزابوونی حوكمەكانی ئاینەكەی نادات؟، كە ناشارەزایەو نایزانێ، بۆچ درۆ و دەلەسەو پڕوپاگەندەی بێجێ ئەكات لە دژی ئایینی خۆی و باوو باپیری؟!.

## وەك بڕینی ئەندامە نەخۆشەكە وایە

ئاواز: هەروەك باستكرد بۆمان، ئیسلام حەز لە تەڵاقدان و داواكردنی تەڵاق ناكات، لەهەمان كاتا ڕێگەی تەڵاقدانی بەتەواوی بەربەست نەكردووەو ددانی پیادا ئەنێت، ئایا ئەمە لە دژایەتی (تناقض) بەولاوە هیچی تر هەیە دڵپاك؟.

دڵپاك: ئەگەر مانای (تناقض)ت بزانایە ئەوەت نەئەگوت خوشكە گیان، وابزانم ماناكەیم پێگوتی لە باسەكانی پێشوودا، بەڵام لەبیرت چۆتەوە، ئەوەندە هەیە، بەدڵنیاییەوە پێت ئەڵێم كە هیچ دژایەتییەكی تێدا نییە، چونكە هەریەكە لە تەڵاقدان و سڵكردن لە تەڵاقدان بارودۆخ و كات و هۆی تایبەتیی خۆی هەیە، ئەمەش دژی یاسای دژایەتییە، جا با ئێستا ئەمەت بە نموونەیەك بۆ ڕۆشن بكەمەوە.

سكالا: من زۆر حەز لە نموونە هێنانەوە ئەكەم، چونكە تێگەیشتن ئاسان ئەكات.

دڵپاك: ئاشكرایە پزیشكەوانی (الطب) لە حاڵەتی سرووشتییدا، نەك هەر حەز بە بڕینی دەست و قاچ ناكات، بەڵكو دژی ئەوكارە ئەوەستێ، بەڵام ئەگەر یەكێك لەو ئەندامانە تووشی نەخۆشییەكی پیس و سامناك هات و هەموو هەوڵێكی لەگەڵدا درا، هەموو جۆرە دەرمانێكی زانراوو دەستكەوتوویان لەگەڵدا بەكارهێنا، بەنیازی چاكبوونەوە، كەچی بێسوود بوو، نەخۆشییەكەی هەر لە پەرەسەندندا بوو، ترسی تووشبوونی ئەندامەكانی تری لەشی لێكرا، ئا لەم حاڵەتەدا، ئەگەر هەڵسا بە بڕینی ئەو ئەندامە نەخۆشە، ئایا ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ كە پزیشكەوانی تووشی دژایەتی هاتووە؟، كارەكە بە دژایەتی ناوئەبرێت؟.

ئاواز: نەخێر، ئەمە كارێكی چاكەو لەپێناوی سەلامەتی ئەندامە ساغەكاندا كراوە، بەڵام پەیوەندی ئەم كارە بە تەڵاقەوە چییە؟.

دڵپاك: هێمنی و ئارامی ژیانی ژن و مێردو خێزان، یەكێكە لە مەبەست و هیوا بەرزەكانی ئیسلام، ژنهێنان و شووكردنیش پەیماندانێكە بەیەكتر لەنێوان ژن و مێردا، بە ئامادەبوونی ئەوانەی كە ئەبێ ئامادەبن، پەیماندانێك لەسەر دەستووروو ڕێبازی خوا، بۆ ماوەی درێژایی تەمەنی ئەو ژن و مێردە، هەتا بتوانن ماڵەكەیان بكەن بە هێلانەی بەختیاریی و تیایدا بحەسێنەوە، لە سایەیدا بەرەیەكی پاك و چاك پێبگەیەنن.

لەبەرئەوە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە پیرۆزترین و بەتینترین پەیوەندیی دائەنرێت، تەنانەت پەروەردگار ئەو پەیوەندییەی بە (پەیمان – العهد) پەیماننامەی توند (المیثاق الغلیظ) ناوبردووەو فەرموویەتی: (وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقاً غَلِيظاً) (النساء: ٢١)، جا مادام پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد ئەمەندە گەورە و گرنگ بێ، چۆن ئەبێ بەنزم تەماشا بكرێت و خەوشدار بكرێت؟، كەی ڕاستە بە هەڵەیی و هەروا بەسادەیی دەستی تێبخرێت؟.

هەر كارێك كە ببێتە هۆی كزو لاوازكردنی ئەو پەیوەندییە، ئەوكارە لەلایەن ئیسلامەوە بە چەپەڵ ئەژمێردرێت، چونكە لەقە لە بەرژەوەندی ئەو ژن و مێردە ئەدات، هەركەسێكیش بیەوێت پەیوەندیی دوو هاوسەر

لێڵ بکات، بەپێی بۆچوونی ئیسلام ئەوکەسە لە ئیسلامەتی چۆتە دەرەوەو فڕی بەسەر بەرنامەی خواوە نامێنێ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (ليس منّا من خبّب إمرأة على زوجها) (أبو داود والنسائي).

دیسان ئافرەتان وریاو ئاگادار ئەکاتەوە کە نەبنە هۆی شێواندنی ژنانو مێردان، هەوڵنەدەن ژنێك دەربپەڕێنن تا ژنێکیتر خۆی بهاوێتە شوێنەکەیەوە، (لا تسأل المرأة لطلاق أختها لتستفرغ صحفتها ولتنكح، فإنّما لها ما قدّر لها).

ئەوەی باسکرا سەبارەت بە بارودۆخی سرووشتی (سەلامەتی)یە، ئایا پزیشکەوانیش هەر بەوجۆرە نییە سەبارەت بە لەش ساغان؟.

سکاڵا: کتومت وەهایە، من لەباسەکە تێگەیشتم.

دڵپاك: بەڵام کاتێ کە دەرکەوت ئامۆژگارییو چاك جوڵانەوەو لەگەڵ نەخەوتنو لێدانو کەوتنە نێوانەوە (الوساطة)، هەراو ناکۆکی ژنو مێردێکیان چارەسەر نەکرد، هەر مایەوەو بەرەو خراپتر چوو، مەترسیی پەیدابوونی ئاژاوەیەکی گەورەی لێکرا. ئایا تەڵاقدان وەك بڕینی ئەندامە نەخۆشەکە چارەسەرییەکی ناچاریی نییە؟، ئایا ئەتوانین خۆمانی لێ لابدەین؟ ئەی چارێکی تر هەیە؟.

سکاڵا: نەبەخوا هیچ چارەسەرێکی تر نییە کە جێگای بگرێتەوە.

ئاواز: (بێدەنگی دایئەگرێو هیچ ناڵێت).

سکاڵا: پێشینان گوتوویانە: (نە بۆ کوێر هەڵپەڕەو نە بۆ کەڕ گۆرانی بڵێ)، ئای کەلێزان بوون!.

## حوکمی تەڵاق

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، ئایا ئەتوانین وەك یاسایەك، کات بۆ تەڵاقدانو تەڵاق نەدان، بەشێوەیەکی گشتیی دیاریی بکەین؟

دڵپاك: ئێمە لەخۆمانەوە ناتوانین ئەوە بکەین، ئەی بۆچ شوێنپێی زانایانی ئایینەکەمان هەڵنەگرین؟ خواپاداشتیان بداتەوە، لە هەموو روویەکەوە شوێنەواری پاكو جێپەنجەی نەخشینیان دیارە، لەم رووەشەوە کەمتەرخەمییان نەکردووە، گەرچی بیروڕای جیاوازیان هەیەن بەڵام هەر کۆمەڵێکیشیان هەر بەڵگەی بەجێیان هەیە.

بەڵام راستترین بیروڕا لەم رووەوە هی حەنەفییەکانو حەنبەلییەکانە، چونکە سوورن لەسەر سڵکردن لە تەڵاقدانداا جگە لە حاڵەتی پێویستدا، بەڵگەشیان لەسەر بۆچوونەکەیان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ: (لعن الله كل ذواقٍ مطلاقٍ)، حەنبەلییەکان تەڵاقدان ئەکەن بەچوار بەشەوە، بەکورتی ئەمانەن:

١ – تەڵاقدانی پێویست (الواجب): وەك ئەو تەڵاقدانەی کە دوو حەکەم بەڕەوای بزانن‌و بڕیاری لەسەر بدەن و بەکۆتاییهێنەری ناکۆکیی دابنێن، لەحاڵەتی (إيلاء)دا کە پیاو سوێند بخوا کە نەچێتە لای ژنەکەی خۆی بۆ ماوەیەك، کە بگاتە چوار مانگ یا زیاتر، (لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ* وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ٢٢٦ –٢٢٧).

٢ – تەڵاقدانی ناڕەواکراو (الحرام): ئەو تەڵاقدانەیە کە بۆ پێویستی پەنای پێ نەبراوە، جا بۆیە بەناڕەوا ئەژمێررێت، چونکە زیانی مێردەکە خۆیو هی ژنەکەی تێدایە، بێئەوەی پێویستیی زۆری هێنابێت بۆیان

بەرژەوەندیی خۆیانیان سووتاندووە، لەبەرئەوە حەرامە وەك بەفیڕۆدانی ماڵ وەهایە، پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرمووێ: (لاضرر ولاضرار)، خۆ زیانمەندیش لەم تەڵاقدانەدا زۆر ئاشکرایە.

٣ – تەڵاقدانی ڕێپێدراو (المباح): ئەوەیە کە پێویستی ئەیهێنێ بەسەر ئادەمیزادا وەك: بەدڕەوشتی ئافرەت، خراپی هەلسوکەوتی، زیانپێگەیشتن بەهۆیەوە، بەبێ ئەوەی ژنەکە لەوکارانەدا هیچ مەبەستێکی پاك و بەجێی هەبێت.

٤– تەڵاقدانی (المندوب إليه): ئەو تەڵاقدانەیە کە ژنەکە بەرامبەر ئەو ئەرکانەی کە خوا پێویستی کردوون لەسەری لە بەجێهێنانیاندا ژنەکە (تفريط) کەمتەرخەمیی ئەکات وەك نوێژو پایەکانی، کەچی پیاوەکە ناتوانێت ناچاری بکات بۆ بەجێهێنانیان، یاخۆ ژنەکە بێگەرد نییە.

پێشەوامان (احمد) خوا لێی ڕازیبێت ئەفەرمووێ: "نابێ پیاوەکەی ڕاگیری بکات، چونکە ڕاگیرکردنی ئەبێتە هۆی ناتەواویی ئایینی مێردەکە، پیازەکەش دڵنا نییە لە داوێنپاکی ژنەکەی، دوور نییە کە منداڵێکی لێبکەوێتەوە کە هی مێردەکەی نەبێت"، (فقه السنة، ٢٤٢-٢٤٣).

سکاڵا: ماشاء الله.. ماشاء الله! بەڕاستی ئەم ئایینە . ئایینی ئیسلام . ئایینی دادپەروەرییە، پڕاوپڕی خۆی بەختیاریی تیایە، ئەتوانم بڵێم ئافرەتیش تەنیا لەسایەی ئەم ئایینەدا ئەتوانێ بەرەو بەختیاریی هەنگاو بنێ.

## تەڵاق ئەدرێتە دەست پیاو

ئاواز: باشە دڵپاك، لە ئیسلامدا تەڵاق ئەدرێتە دەست مێرد، یان ژن؟.

دڵپاك: بێگومان ئەدرێتە دەست مێردو مافی مێردە.

ئاواز: ئەی بۆچ نەدرێتە دەست ژن؟، گوایا ژن ئادەمیزاد نییە؟.

دڵپاك: مەبەستی ئیسلام لە سپاردنی تەڵاقدا بەپیاو، ئەوە نییە کە ئافرەت بە ئادەمیزاد دانەنێ، ئیسلام لەڕووی مرۆڤایەتییەوە ئافرەتو پیاوی لەلا یەکسانە، ئەم باسەمان کاتی خۆی شیکردەوە.

بەڵام بۆچ بەپیاوی سپاردووە؟ بێگومان ئەمەیان حیکمەتی تایبەتی خۆی هەیە، خوا لەهەموو زانایەك زاناترە، ئێمەش ئەزانین کە پیاو لە ئافرەت سوور (حريص) ترە لەسەر مانەوەو بەردەوامی ئەو هاوسەرێتییەی کە لە پێناویدا ماڵو سامانی خۆی خەرجکردووە، ئەشزانێ کە تەڵاقدانی ژنو هێنانی یەکێکی تر، پێویستی بە ماڵو سامانێکی زۆرو فراوانتر هەیە، چونکە ئەبێ مارەیی تەڵاقدراوو (حق المتعة)ی بداتێو لەماوەی چاوەڕوانی کردندا (العدة) مەسرەفی بکێشێ.

ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە، بەپێی ژیریی و سروشت، میزاجی پیاو توانای ئارامگرتنی زیاترە بەرامبەر بەوەی کە لەژنەکەیا ڕقی پێی هەڵئەسێ، خێرا پەلاماری تەڵاق نادات کاتێ کە تووڕە ئەبێت، بەڵکو پیاو لەکاتی تووڕەبووندا لە ئافرەت خۆگرترە، کەچی ئافرەت خێرا تووڕە ئەبێو لەکاتی تووڕەبوونیدا بەرگەناگرێ، نەگبەتی و مەسروفاتی تەڵاقیش ناکەوێتە سەر ژن، بەڵکو ریشی پیاو ئەگرێت.

ئەگەر تەڵاق بدرێتە دەست ئافرەت، دڵنیابە بۆ بچووکترین هۆ دەستی بۆ ئەبات، پەیوەندیو بەستەری نێوانی خۆیو مێردەکەی هەڵئەوەشێنێتەوەو ئەبڕێت، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستیو بۆچوونە ئەوەیە فەڕەنسیو مەڕەنسییەکان کاتێ تەڵاقیان بە ژنو مێرد وەك یەك سپارد، تەڵاقدان لەناویاندا ئێجگار زۆربوو، بەجۆرێکی وا چەندقات لە تەڵاقدانی مسوڵمانان تێپەڕی کرد.

ئاواز: ئەوەی کە گومانی تێدا ناکرێت ئەمەیە: تەڵاق ئیسلام دایە دەستی پیاو، من خوێندوومەتەوە لە چەرخە کۆنەکاندا تەڵاق بەدەست ژنەوە بووە، ئیسلام لەژنی سەندەوەو کردی بەمافی پیاو.

سکاڵا: ئای لەم درۆ زلەیە!، پح لەم نوقڵانەیە!، من ئەڵێم نابێ بۆ کوێر هەڵپەڕیو بۆ کەڕ گۆرانی بڵێیت، کەچی خوشکە دڵپاك بەگوێم ناکات!.

ئاواز: ئای قسەت چەند تاڵو ترشە سکاڵا! ئیتر بەس نییە؟!.

دڵپاك: خوشکە سکاڵا، تکام وایە کە دڵی یەکتر نەیەشێنین‌و لەسەرخۆ بین. مامۆستا ئاواز نازانم دێتەوە یادت، یان نەء، کە لە سەرەتای باسی تەڵاقدا گوتت وشەی تەڵاق ئیسلام دایهێنا، ئەوەت گوت یان نەتگوت؟ بیربکەرەوە.

ئاواز: ئێ.. ئێ هاتەوە یادم، بەڵێ ئەوەم گوت.

دڵپاك: رەحمەت لەدایك‌و باوکت، ئەی ئێستا چۆن ئەڵێیت: (لە چەرخە کۆنەکاندا تەڵاق بەدەست ژنەوە بووە، ئیسلام کردی بەهی پیاو)؟! خوشکی شیرینم، ئەو دوو قسەیەت لەیەکەوە زۆر دوورن، دژ بەیەکترن، ئەگەر یەکێکیان راست بێت ئەویتریان ناڕاستە، ئەتوانم بڵێم تووشی دژایەتی گوتن هاتوویت، خۆ ئەگەر دژایەتی گوتن نەبێت بێگومان ئەوکارە بە بوختانکردن دائەنرێت، بوختانکردن بۆ کێ؟، بۆ ئایینی ئەو خوایەی کە خەلقی کردوویت، گیانی کردووە بە بەرتدا، ئەتمرێنێ‌و زیندووت ئەکاتەوەو حیسابت لەگەڵدا ئەکات، تۆیش کچێکی گەنج‌و ماشاء الله خوێندەواریت، خەڵك بە تێگەیشتووو ژیرت ناو ئەبا، بەرە (جیل)ی نوێت دراوەتە دەست، میللەت چاوەڕوانی بەرهەمی پەروەردەکردنت ئەکا، خوا چاوی لێتەو ئەتبینێ، دەی لەخوا بترسە، هیوادارم چاوێك بە ژیریی‌و بیری خۆتا بخشێنیتەوە.

ئاواز: ..........!

## لەسەر فطرە دامەزراوە

سکاڵا: وەك دەرکەوت، ئەو کۆمەڵگەو میللەتانەی کە ئایینی ئاسمانیان هەبووە، خوا تەڵاقی بەپیاو سپاردووە، ئەی ئەو کۆمەڵگانەی کە ئایینی ئاسمانییان نەبووەو پەیڕەوییان نەکردووە، کێ تەڵاقی لەوێدا داوەتە دەست پیاو؟.

دڵپاك: تەنانەت لەناو ئەوانەشدا تەڵاق لەسەر بنچینەی ژنهێنان دامەزروە، وەك زانراوە لەو کۆمەڵگانەدا بەپێی سروشت‌و فطرە، نێر داوای مێی کردووە، نەك بە پێچەوانەوە. دیارە لەسەر ئەو بنەڕەتە رای وازهێنان‌و جیابوونەوە هی ئەو کەسەیە کە داواکاریی‌و خوازبێنیی لە ئەستۆیابووە، واتە نەریت (عادەت)ەکە نەریتێکی فطرییە، هەر لەسەر ئەو نەریتە فطرییەش رێبازی تەڵاقدان، وەك ژنهێنان دامەزراوەو ئیتر تەڵاق بۆتە موڵکی پیاوو دراوەتە دەستی، جا هەر لەو نەریتەش یاساو رێباز هەڵقوڵاوەو پێکهاتووە.

سکاڵا: واتە لەناو ئەو کۆمەڵگانەدا فطرە تەڵاقی کردووە بە هی پیاو.

بەڵێ.. بەڵێ، مەسەلەکە لە فطرەدا هاتووە، جا نازانم ئەگەر ئێمە بەپێچەوانەی فطرە بجووڵێینەوە قازانج ئەکەین؟، سەرکەوتوو ئەبین؟! ئایا ئەتوانین فطرە بگۆڕین؟.

# زیان بژاردنەوە بەرامبەر تەلاقدان ( الخُلع )

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، پرسیارێك خۆی سەپاند بەسەر بیرو هۆشما كە ئەمەیە: وەك رۆشنتكردەوە ئیسلام دان بە مرۆڤایەتی ئافرەتدا ئەنێت‌و لەم رووەوە لەگەڵ پیاودا یەكسانە، دەی چی ئەكەی لەو ئافرەتانەی كە بە سروشت حەز لە مێردەكەی نەكات، تەبیعەتی نەچێتە سەری؟، ئایا رێكناكەوێ ئافرەتێك‌و پیاوێك كە بە خۆشەویستیش بووبن بە هاوسەر، كەچی دوای ماوەیەك بۆیان دەركەوێ كە پێكەوە گونجانیان موستەحیلە؟ حۆ پیاو ئەتوانێ ژنەكە تەلاق بدات، چونكە تەلاق هی پیاوە، ئەی ژنەكە...؟.

سكالا: بەخوا خۆ پرسیارەكەی جوان‌و بەجێیە! راست ئەكات.

دڵپاك: چاوەكەم، ئەمە شتێكی راست‌و سرووشتییە، روویداوەو رووش ئەدا، زانایانی ئیسلام لەوەشیان كۆڵیووەتەوە، فەیلەسووف (إبن سینا) لە پەڕاوی (الشفاء)دا نووسیوویەتی: "پێویستە جیابوونەوەی ژن‌و مێرد رێگەیەكی هەر هەبێت، نابێت لە هەموو روویەكەوە داخراوبێت، چونكە بنەبڕكردنی هەموو ئەو رێگایانە چەندەها زیان‌و سەرلێشێوانی وا بەدەمەوە، لەوانە: هەندێ تەبیعەت هەن كە لەگەڵ هەندێكی تردا یەكناكەون، جا هەرچەند هەوڵی یەككەوتنیان بدرێت، شەڕ زیاترو فراوانتر ئەخێزێ، ناكۆكی زیاتر ئەبێت، ژیانیان تاڵتر ئەبێت.

هەروەها رێكدەكەوێت كە كەسێك كەسێكی تری ناهاوشانی خۆی ببێت بە هاوسەری، هەڵسوكەوتی لەگەڵیدا چاك‌و شیاو نەبێت، یاخۆ ناشیرین بێت‌و تەبیعەتی نەچێتە سەری، لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی جۆرەها خراپە، ببێتە هۆی حەزكردن لە كەسێكیتر، چونكە حەزبازیی (الشهوة) بنەڕەتی‌و سرووشتییە، دیسان لەوانەیە ئەو دوو هاوسەرە هاوكاریی یەكتر نەكەن لە بەچەخستنەوەدا، جا ئەگەر ئاڵوگۆڕ ببێ واتە (تەلاقدان‌و ژنهێنان‌و شووكردن) ئەوا هاوكاریی ئەبێت، لەبەرئەوە ئەبێ رێگای جیابوونەوە ببێ، بەلام ئەبێ زۆركەم بكرێتەوە".

خوشكەكانم، ئێوە ئەزانن كە تەلاق هی پیاوەو ئەتوانێت ژنەكەی تەلاقبدات ئەگەر بەدڵی نەبوو، پرسیارتان بۆ ئافرەت كرد، بەڵێ ئافرەتیش لەو حاڵەتەدا كە باستان كرد، مافی داواكردنی جیابوونەوەی هەیە، ئەمە لە زاراوەی فیقهدا پێی ئەوترێت خولع (الخلع).

سكالا: زەحمەت نەبێت جوان بۆمان شیبكەرەوە.

دڵپاك: باسی ئەوەمانكرد كە ئیسلام حەز لە تەلاقدان‌و جیابوونەوە ناكات‌و هەوڵی یەكخستنی ژن‌و مێردو رێكخستنیان ئەدات، ئەمەمان باسكرد. جا كاتێ كە دەركەوت جیابوونەوەیان بەسوودترە و هۆیەكەش ژنەكەیە، ئیسلام رێگەی جیابوونەوەیان لێناگرێت، ئافرەتەكە بۆی هەیە تەلاق لە مێردەكەی بسێنێ، بەلام ئەبێ ئەنجامی ئەو جیابوونەوەیە بزانێت، ئەبێ نرخەكەی بدات، ئەی خۆی هەڵینەبژاردووە بۆ خۆی؟.

ئاواز: نرخەكەی بدات؟! یانی چی؟! نرخەكەی كامەیە؟

دڵپاك: ئەو پیاوەی كە مارەیی بە ئافرەت ئەدات، بە هەزاران بگرە بە ملیۆنان دینار خەرج ئەكات تا ئەیهێنێ، جۆرەها خزمەت لەپێناویدا پێشكەش ئەكات، بگرە تالاوو سوڵاو ئەچێژێ، خۆی قەرزار ئەكات، گەلێ جار دایك‌و باوك‌و خوشك‌و برا بەجێئەهێڵێ‌و لەو ماڵە دەرئەچێ كە تیایدا چاوی بەژیان هەڵهێناوەو پێگەیشتووە، ماڵێك ئامادە ئەكات بۆ (خاتوون)و بەڕێزو نازەوە ئەیهێنێتە سەر ماڵی حازر، ئەمجا ئامادەیە لە سنووری تواناداد ماڵی بۆ بڕازێنێتەوە، قوربانیی بۆ بدات، كەچی خانم دوای ماوەیەك بە دەرخستن، یان راستەوڕوو پێی بڵێ (توانای هاوسەرێتیم نییە، نامەوێ لەگەڵتا بژیم، حەزم لێت نییە....هتد)، بەڕای ئێوە چی لەو ئافرەتە بكرێت؟، شایستەی چییە؟ چی بۆ دائەنرێت؟.

سكالا: چاوی هەڵئەكۆڵم، ئەوە كەی ژنە پشیلەی سپڵەیە.

ئاواز: هەق وایە بەندبكرێت‌و بەیەكجارییش لە هاوسەریی بێبەش بێ.

دڵپاك: دەك بێبەڵابن بۆچ ئەوەندە دڵڕەقن؟!، دەی ئیسلام وای لێناكات، لەگەڵ ئادەمیزادا دڵڕەق نییە، خاوەنی دادگەرییەو هەموو شتێك لەشوێنی خۆیدا دائەنێ.

دادگەریی وا پێویست ئەكات كە ژنەكە لە مێردەكەی جیاببێتەوە، بەو مەرجەی كە زەرەرو زیانی پیاوەكە ببژێرێتەوە، جا زانایانی ئیسلام لەم رووەوە چەند رایەكیان هەیە، هەندێ رایان وایە كە زەرەرەكە چەند بووبێ هەر ئەوەندە لە ئافرەتەكەش بسێنرێت، هەندێكی تر ئەڵێن پیاوەكە بۆی هەیە زیادیشی پێوە داوا بكات، هەریەكە لەوانەش بۆ رای خۆی بەڵگەی بەدەستەوەیە.

سكاڵا: الله.. الله! بەڕاستی ئیسلام گەورەیە، هەمووی دادگەرییە.

ئاواز: ئایا شتی وەها لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ روویداوەو بووە؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، روویداوە. پێشەوامان مالك لە (الموطأ)دا ئەگێڕێتەوە كە (حبيبة بن سهل الأنصاري)، ژنی (ثابت بن قيس شماس) بووە، ئەو ئافرەتە دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو ئەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا من سكاڵامە بەدەست ئەم پیاوەوە، لەبەر بێ ئایینی، یان بەدڕەوشتیی ئەو نییە، بەڵام لەگەڵ چەند پیاوێكدا كەوتە بەرچاوم، تەماشامكرد لە هەموویان رەشترە، منیش نامەوێ لە مسوڵمانەتیمدا كوفر بشارمەوە، لەبەر ئەوە سەری منو سەری ئەو هەرگیز لەسەر یەك سەرین كۆنابنەوە.

ثابت گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من چاكترینماڵی خۆمم پێشكەشكردووە كە باخچەكەمە، ئەی نابێ بمداتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ بە ژنەكەی فەرموو: ها ئەڵێ چی؟ ژنەكەش گوتی: ئەگەر بیەوێ زیادەیشی ئەخەمەسەر، پێغەمبەر ﷺ بە ثابتی فەرموو: باخچەكەی لێوەربگرەوەو یەك تەڵاقی بدە"(البخاري والنسائي)، بەوجۆرە رێككەوتنە لەیەكتریان جیاكردنەوە.

سكاڵا: بەڕاستی ژنەكەش مەردو پاكو راستو لێهاتوو بووە، یەكسەر راستییەكەی گوتووە، دەستی نەداوەتە فرۆفێڵو ساختە تاشین، ئەوەتا گەواهی ئایینداریی و رەوشتپاكی مێردەكەی ئەدات لەبەردەم پێغەمبەرا ﷺ، ئەمجا شتەكانی تری بۆ باس ئەكات!. سەرنج لەو رستەیە بدە (منیش نامەوێت لە مسوڵمانەتیمدا كوفر بشارمەوە)!.

بەڵێ، هێزو تینو رۆشنایی باوەڕبوون بەخواو بەرنامە پاكەكەی وەها ئادەمیزاد فێری راستیو راستبێژی ئەكات.

## بۆ پیاو قەراغو بیچاغیش دێتەكایەوە

ئاواز: ئەی ئەگەر ئەو ناچیزەیی و خۆداماڵینە لە پیاوەكەوە بوو، چ بەسەلماندنو چ بە ددان پێدانانی خۆی، چی لەپیاو ئەكرێت؟.

دڵپاك: ئەوكاتە پیاوەكە هەر خزمەتێ كە كردوویەتی، هەر پارەو سامانێكی تر كە خەرجی كردووە هەمووی ئەفەوتێو ئەبێت بە ماڵی ژنەكە، بێگومان لێرەدا پیاوەكە زەرەر ئەكات، لەوەش زیاتر قەراغو بیجاغ زۆرو زەبەندەیە كە پیاو تیایدا زیانمەند ئەبێ.

سكاڵا: قەرغو بیجاغ كامەیەو چۆنە؟ من هیچ نازانم.

دڵپاك: ئەوە دەقی قورئانیو شوێنەواری رەفتارو گوفتاری پێغەمبەر ﷺ، رۆشنی كردۆتەوە بۆمان، لەوانە: یاسای ژمارە (٢٢٩)ی سوورەتی (البقرة) كە ئەفەرموێ: (وَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ).

بەگوێرەی ئەو یاسا قورئانییە، ئەگەر هاتوو تاوان لەپیاوەكەوە بوو لە تەڵاقدانەكەدا، ئەوا بۆی نییە نەمارەیی و نەهیچ خەرجكردنێكی تر كە كردوویەتی لەو ژنەی بسەنێتەوە، مادام ئەو خۆی لە ژنەكە دائەماڵێ، سا مەگەر ژنەكە بە پیاوەتیی خۆی شتێكی بداتێ یان لێی نەسێنێ، ئەمە ئەو قەراغو بیجاغە وا لەپیاو ئەكەن كە

نەوێرێ هەروا بەئاسانیو هەوانتە ناوی تەڵاق ببات، جا لەوانە: ئەبێ بەدرێژایی ماوەی (العدة) چاوەڕوانکردن مەسرەفی بکێشێ، مەسرەف بەهەموو واتاکانی وشەکە، مناڵەکان ئەگەر بچووك بوون ئەدرێنە لای دایکەکەیانو مەسرەفیان لەسەر باوکەکە ئەبێ، هەتا ئەگەنە تەمەنی دیاریکراو لەلایەن یاساوە، ئەبێ جگە لە مەسرەفی ئەوان پارەی دایەنییو لەلەیی (الحضانة) بدات بەدایکەکە، خۆ ئەگەر سکی هەبوو، دیسان مەسرەفی ئەو ژنەی ئەکەوێتەسەر هەتا مناڵی ئەبێت، (فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ) (الطلاق: ٧)، ئەوەش کرێی شیرپێدانەکە.

ئاواز: ددانی پیادا ئەنێم کە لێرەدا ئەگەر زۆر وردببینەوە، ئافرەت براوەیەو پیاو دۆڕاوە، بەڕاستی دادگەریی لە چڵەپۆپەدایە.

دڵپاك: ئەبوایە وشەی (لێرەدا)ت بەکارنەهێنایە، چونکە یاساکانی ئیسلام هەموویان هەر دادگەریین، هەموویان پڕن لەخێرو بێر بۆ مرۆڤایەتیی بەتێکڕا، ئەمەش شتێکی سەیر نییە، چونکە ئیسلام بەرنامەی خوایە، خوا دایڕشتووە، (ومن أحسن من الله صبغة؟)، هیوادارم راستی تێکەڵی گیانت ببێت.

## لەزەتپەرستییو چاونە پۆشییش هۆی سەرەکیین

سکاڵا: خوشکە دڵپاك، ئایا تۆ بەبیرتدا دێت کە هەبێت تەڵاقدانو تەڵاق سەندن لە غەیری شوێنی خۆیدا بەکاربهێنێ؟

دڵپاك: ئای! ئەوە خۆت گێل ئەکەیت؟!، جا ئەگەر خەڵك هەمووی ژیانی لەسەر راستی دابمەزرایەو بڕۆشتایە، مرۆڤایەتی دووچاری ئەم ژیانە تاڵەی ئێستای ئەبوو؟، ئەگەر خەڵك هەموو شتێکی لەکاتی خۆیداو بەچاکی بەکاربهێنایەو بەپێی پێویست بکرایە، ئەم گێرە و کێشە و دژوارییەی ئێستا بەرپا ئەبوو؟ ئەی تۆ بیر لەم هەموو جەورو ستەمو تاوانو نالەبارییەی کە لەم سەرزەوییەدایە ناکەیتەوە؟ دڵنیابە ئەگەر خەڵك هەموو شتێکی لەکاتو شوێنی خۆیدا بەپێی پێویست بەکاربهێنایە، ئەم ژیانەی ئێستا جۆرە ژیانێکی تر ئەبوو، پاكو بەتامو شیرین ئەبوو.

گەر خەڵکی هەموو پاكو ژیر بووایە شارێگەی راستی ژینی بدیایە

ستەمو جەورو تاڵاوی ژیان کەی جێی ئەبووەوە لەم سەر دنیایە؟

تەڵاقدانو تەڵاقسەندنیش وەك هەموو شتێکیتر، بەهەڵەکاریی بەکارئەهێنرێت، خەڵك ـ کەمی نەبێت ـ سەلمێنراوو راستییەکانی ژیان بەڕێکوپێکی نابینێ، چونکە تەنها لە توێکڵی ژیان گەیشتووە، شەیدای رواڵەتە، زۆربەی خەڵك ژنهێنانو شووکردن تەنها بە لەزەتپەرستی ئەزانن، بە کۆبوونەوەی دوو لەش لەیەك نوێندا، بۆ لەزەت چەشتن دائەنێن.

بۆیە ئەبینی پاش ماوەیەك، کە تاسەی جنسییان شکا، وردە وردە ساردیی، نیشانەی وەڕسیی، لەیەکێکیانەوە، یاخۆ لە هەردووکیانەوە دەستپێئەکاتو دەرئەکەوێ، پشتلێکردن رووئەداو ئەکەوێتە زیتەزیتکردن بۆ گەڕان بەدوای هاوسەرێکی تردا، بەشکو لەزەتو تامی خۆشتر ـ بەنیازی خۆیان ـ بەدەستبێنن، دیارە ئەمەش تەڵاقکاریی ئەرەخسێنێ، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرمووێ: (لعن الله كل ذواق مطلاق)، وە (تزوجوا ولا تطلقوا، فإن الله لايحب الذواقين والذواقات) (أخرجه الديلمي).

ئەم دیاردەیە لەناو مسوڵمانانیشدا، بەهەموو بەشەکانیەوە، زۆر زۆرە، بەتایبەتی لە خۆرئاوادا، تەنانەت ئاشکراکردنی ئەو کارە لەناویاندا پێویستی بە شەرمکردن نییە، بەڵکو ژنهێنانو شووکردن شێوەی دۆستو دڵییو ماشقەبازیی وەرگرتووە. پیاو هەرماوەیەك لە باوەشی ئافرەتێکداو ئافرەت هەرماوەیەك لە باوەشی

پیاوێكدا ئەبا تەسەر، تازەكردنەوەیان لەم رووەوە زۆر بەلاوە گرنگەو كردوویانە بەناوەرۆكی فەلسەفەی ژیانیان، مرۆڤایەتیو تایبەتمەندییەكانی مرۆڤیان بیرچۆتەوەو كردوویانە بەژێر خاكو خۆڵی لەزەتپەرستییەوە.

سكالا: رۆژئاوا؟! ئەو رۆژئاوایەی كە خاوەن شارستانیەتە؟!

دڵپاك: بەڵێ، ئەو خۆرئاوایەی كە زۆربەی خەڵك كردوویەتی بە رووگە (قبلە)ی خۆیو وائەزانێ شەربەتی شارستانییەتو سەرفرازییو بەختیاری تەنیا بەشوێنكەوتنو لاساییكردنەوەی ئەوێ ئەگیرێتەوە، ئەگەر ئەوان بەشمان نەدەن، ئیتر بەهیچ جۆرێك دەممان نایگاتێ!

سكالا: واتە تەنیا لەزەتپەرستان تەلاق لە كاتو شوێنی خۆیا بەكارناهێنن؟.

دڵپاك: نەخێر، جگە لەوانە هیتریش هەن، ئادەمیزاد فریشتە نییە تا بێنەنگو لەكەو كەموكوڕی بێت، چ ژنو چ پیاو لە سروشتو رەوشتیاندا هەندێ كەموكوڕیی هەیە، ناتەواوییان تێدایە، هەر ئەمجۆرە شتانەش ئەبنە هۆی جیاوازیی بیروڕاو حەزو ئارەزووو خواستیان، جا هەندێ پیاو، یا هەندێ ئافرەت، سەیری هاوسەر وەك فریشتەیەك . نەك وەك ئادەمیزاد . ئەكەن، لەبەرئەوە بەتەمانین كە جارێك یا چەند جارێك، سیفەتێك، یا چەند سیفەتێك لە هاوسەركەیدا دەركەوێ. خۆ هەر كە دەركەوت، یەكسەر وەك فیشەكە شێتە ئەچێت بە ئاسمانداو ئیتر هەرچییەكی لەدەست بێت درێغی لێناكات، چاوپۆشیو لێبوردن نازانێت، لەجیاتی ئەوەی هەڵەكەی پێ لابەرێ، یا راستی بكاتەوەو داپۆشێ، گەورەو ئاڵۆزی ئەكاتو ئەیخاتەڕوو. كەچی بیر لەوەناكاتەوە كە خۆیشی ئادەمیزادەو خاوەنی هەڵەو كەموكوڕییو ناتەواوییە.

یەك عەیبی خەڵك ئەبینی، خۆت ساحێبی هەزاری

خەڵكت لەلا خەراوە، خۆیشت وەكو دەواری

بێگومان ئەوەش ئەبێتە هۆی شەڕو ئاژاوە لەنێوان ژنو مێردا، لەئەنجامدا ژنەكە ئەتۆرێتو داوای تەلاق سەندن ئەكا، یان پیاوەكە ئەو دەرئەكاتو تەلاقی ئەدات.

ئەو نەنگو كەموكوڕییەش مەرج نییە كە زۆرو گرنگ بێ، بگرە هەر شایستەی باسكردنیش نەبێت، بەلام لەلایەن هاوسەركەیەوە بە گەورەو گرنگ دائەنرێت، ئەویش لەبەر بێحەوسەڵەییو چاونەپۆشیو زوو هەڵچوونیەتی.

ئێستا شەوگار درەنگە، خوا یاربێت بەیانی كە لە قوتابخانە گەڕاینەوە چەند نموونەیەكتان لەو جۆرە نەنگو بەهانانە بۆ باس ئەكەم.

## چەند نموونەیەك

سكالا: سوپاس بۆ خوا، وا لەمەكتەب گەڕاینەوە، ئای چەند پەلەمبوو!، خۆ لەبیرتە شەوێ پەیمانی چیت پێداین، مامۆستا دڵپاك.

دڵپاك: بەڵێ لەبیرمە، گوتم چەند نموونەیەكتان لەو جۆرە نەنگو بەهانانە بۆ باس ئەكەم كە ئەبنە هۆی پشێوی نێوان ژنو مێرد، لەوانە:

* پیاوی وا هەیە كە حەز لە خواردنیخۆش ئەكات، بەكوردیی چڵێسو نەوسنە، یا بابڵێین سكدۆستە، هەمیشە خۆراكی خۆشی ئەوێ، بەلام ژنەكەی حەز لەو سیفەتە ناكات، لێی وەڕسە، بەنەنگیی دائەنێت، لەمەشەوە هەرا دەستپێدەكاتو ئەگاتە تەلاقكاریی!.

* هەندێ ئافرەت سرووشتی وایە حەز لە ئارایشدانو خۆجوانكردن ناكات، كەچی پیاوەكەی داوای ئەوەی لێئەكاتو زۆریشی بەلاوە گرنگە، لەسەر ئەوە ئەیگەیەننە جیابوونەوە!.

* ئافرەتێك ئەیەوێ تەلاق لەمێردەكەی بسێنێ، چونكە گۆرانی ئەلێت‌و هەمیشە گۆرانییەكەی بە (خۆزگە عازەب بوومایە) دەستپێدەكات!.

پیاوێك رقی لە ژنەكەی هەڵگرتووەو دواییش تەلاقی ئەدات، چونكە بەشەودا كە ئەخەوێ ئەمرخێنێ!.

* ئافرەتێك ئەچێتە دادگاو داوای تەلاق سەندن ئەكات، چونكە مێردەكەی رۆژێ لەرۆژان جلی ناخواردنی لەكاتی نانخواردندا لەبەر نەكردووە!

ئەمەو دەیان بڕو بەهانووی تری بێ ڕێ‌وجێ.

سكالاّ: ئەگەر هاتوو ئادەمیزاد هاوسەرێكی سروشت لار. كەم ئاوەزو گێژو ناژیرو گەمژەی بوو بە ریشەوە، هێمنی دەروون‌و خۆشیی ژیانی لەگەلێدا دەست نەكەوت، هەمیشە رووگرژو مۆن بوو، رێی لە ژیربێژی نەكەوت، لەسەر هیچ بارێك خۆی ڕاگیر نەكرد، مایەی سەرێشەو ئاژاوەی گیان بوو، ئەگەر هاوسەركەی لێی جیاببێتەوە، ئایا ئەوە لەشوێنی خۆیدا نییە؟.

دڵپاك: منیش لەتۆ ئەپرسم: ئایا ئیسلام بڕیاری لەسەرمانەوەی ئەوجۆرە هاوسەرییە داوە؟، ئایا ئەلێت لەشوێنی خۆیا نییە؟، ئایا ئیسلام داوای هەڵبژاردنی وەهای كردووە؟، هاوسەریی وەها دۆزەخە، نەك هاوسەریی، خۆ ئیسلامیش داوای لە خەڵك نەكردووە كە دۆزەخ بكڕێت بۆ خۆی.

ئیسلام كە حەز لە تەلاقدان‌و تەلاق سەندن ناكات، ئەوە وا ناگەیەنێت كە لە دۆزەخی ناكۆكیی هاوسەرێتیدا بمێنێتەوە، (ولا تطلقوا النساء إلاّ من ريبة...)، وشەی (ريبة) مانای گومان نییە، بەڵكو مانای بێزاریی‌و وەڕس بوون‌و ناڕەحەتییە، سكالاّخان.

## خۆرئاواییەكانیش پەنایان برد پێی

سكالاّ: مامۆستا دڵپاك، ئێستا من بۆم ساغ بۆتەوە كە ئەوانەی ئەیانگوت ئیسلام تەلاقی كردووە بە كوتەكێك‌و داویەتە دەست پیاو بۆ دەمكوتكردن‌و سەركوتكردنی ئافرەت‌و جیابوونەوە لێی هەر كە هەوەسی ببێ، درۆیەكی زۆر گەورەی بێبنج‌و بناوانەو فڕی بەسەر راستییەوە نییە.

هەروەها بۆم دەركەوت كە تەلاق ئەگەر چەكێكیش بێت لەدەستی پیاودا، رێگەی بەكارهێنانی لە حالەتی زۆر پێویستدا نەبێت نەدراوەو ئەبێت لە كۆتایی كاروانی تێكۆشانێكی زۆردا، لەو كاتەدا كە هەموو رێگەیەكی نێوان چاككردنی ژن‌و مێرد گیرابێت، ئەوسا پەنای پێ ببرێت.

لە راستییدا . وەك باستكرد . تەلاق وەك نەشتەرگەرییەكی جەڕاحیی وەهایە، ئەوەی ناچار نەبێت پەنای پێنابات، هیچ كەس حەز لە عەمەلیات كردن ناكات، بەلاّم ئەگەر نەخۆشەكە لە نەخۆشییەكەی ترساو خەمی ئەوەی بوو ئەندامەكانی تری لەشی بگرێتەوەو هیوای چاكبوونەوەی براو داودەرمان سوودی نەما بۆی، ئەوسا عەمەلیاتەكە پێویست ئەبێ لەسەر ئەو نەخۆشە، چونكە تەنیا چارەسەرێكە كە بۆی ئەمێنێتەوە .

ئاواز: بەلاّم ئایا مسوڵمانان بەو جۆرە ئەجووڵێنەوە؟

دڵپاك: زۆربەی بەچكە مسوڵمانانەكانی ئەمڕۆ، كە باوك‌و باپیرانیان موسڵمانی پاك‌و بێگەرد بوون، ئێستا ئەمان لەگەڵ ئیسلامدا دوژمنایەتی ئەكەن، ئایا ئیسلام داوای ئەوەی لێكردوون؟، ئایا ئیسلام داوای لێكردوون كە هەوڵی سڕینەوەی باوەڕی ئیسلامی بێگەرد بدەن؟، بۆچ ئەتانەوێ هەڵەو ناتەواوی مسوڵمان بدەن بە كۆڵی ئیسلامدا؟!.

سكالاّ: ئاواز قسەكەی پچڕاند، من ئەمویست بپرسم: مادام ناتوانرێت كە واز لە تەلاقدان بهێنرێت، ئەی بۆچ خۆرئاواییەكان ددانی پێدا نانێن؟.

دڵپاك: (سبحان الله)! كێ ئەڵێ كە ددانی پێدا نانێن؟ بێگومان زۆربەی فەیلەسووفە گاورەكان (النصاری)و ڕۆژهەڵاتناسەكان ددانیان بەوەدا ناوە كە تەڵاقدان پێویستییەكە وازلێهێنانی مەحاڵە. ئەوەتا كەڵە زانای ئینگلیزی (بنتام) كە لە كەڵە فەیلەسووفە گاورەكانە لە پەڕاوەكەیدا (أصول التشریع) ئەڵێت: "ڕاستە كە ژنهێنان و شووكردنی هەتا هەتایی شایستەی ئادەمیزادە، لەگەڵ پێویستی مرۆڤا ئەگونجێ، بۆ خێزانداریی زۆر لەبارەو ئەبێ دەستی لێ بەرنەدرێ، بەڵام ئەگەر ئافرەت پیاوی ناچاركرد كە مەرج بكا، لێی جیا نەبێتەوە، با رق لێبوونەوەیەكی زۆریش لەگەڵ دڵیاندا جێگای خۆشەویستی بگرێتەوە، دیارە ئەوە كارێكی ناپەسەندە، كەس پەسەندی ناكات، لەكاتێكدا ئا ئەو مەرجە خۆی هەیە، بەبێئەوەی ئافرەت داوای بكات، چونكە یاسای كەنیسە حوكمی پێئەكات، لەكاتی مارەبڕیندا دەستی تێ ئەخات و پێیان ئەڵێت: (ئێوە ئەبنە هاسەری یەكتر تا بەخیارین، با بزانن كە ئەچنە بەندیخانەیەكەوە كە داخستنی دەرگاكەی زۆر هێقمە، ناهێڵم هیچ كامتان بێنە دەرەوە، ئەگەرچی بە چەكی دوژمنایەتی و رقبازییش دەست بدەنە جەنگ و بكەونە كوشتار)"[1]

یەكێك لە فەقیهانی خۆرئاوا ئەڵێت: "تەڵاق شەڕێكە، بەڵام شەڕێكەو هەر ئەبێ ببێ بۆ چاككردنی كۆمەڵگە، چونكە تەنیا چارەیەكە بۆ ئەو شەڕەی كە لەم پڕ لە بەڵاتره"[2]

خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی (ئیتین دینیە) ئەڵێت: "بەڵام كەنیسە لە مەسەلەی تەڵاقدا هەروەك كارو مەسەلەی یەكتایی (التوحید)، بە نەزانیی و خراپی جووڵایەوە، چونكە دیسان بە پێچەوانەی یاسای سرووشتی جووڵایەوە: تەماشاكە، چی لەوە خراپترە كە دوو گەنج ناتوانن لەگەڵ یەكترا ئارام بگرن، هاوسەرییان سەركەوتوو نییە، ئەو بەختیارییەی لە پەنایدا چاوەڕوانییان ئەكرد، چنگیان نەیگرت، چی لەوە خراپترە كە حوكمیان بەسەرا بدرێت بەوەی هەتا ماون پێكەوە بمێننەوەو ئەو تەمەنەیان كە ماوە بە تاڵاو چەشتن و دژایەتی یەكترو بەدبەختی بەرنە سەر؟! هەروەها ئەگەر یەكێك نەزۆك بێت، یان هاوشانی هاوسەرەكەی نەبێت، ئایا ئەوی تریش ڕەوایە كە بێ بەش بكرێ لەوەی كە بە هاوسەرێكی تر خۆی لەوە بپارێزێ و خێزانێك سەر لەنوێ پێكبهێنێ؟"

تەنانەت لە (ئیتالیا)دا كە دەمارگیرییان سەبارەت بە تەڵاق نەدان ئێجگار بەتینەو ڕێگری لێئەكەن، پێش ساڵی (١٩٧٠) كە یاسای تەڵاقدان ددانی پیادانرا بەڕەسمی، خۆپیشاندان لەملاو ئەولاوە ئەكرا، داوای دانانی یاسای ڕێگەپێدانی تەڵاقیان ئەكرد، لەو دروشمانەی كە لەو كاتانەدا بەرزیان ئەكردنەوە: (ئاژەڵ تەڵاقدانی بۆ نییە، بەڵام گەلە خاوەن شارستانیەتەكان ئەوە ئەكەن).[3]

ئەوەی بۆم باسكردن مشتێك بوو لە خەرمانێك، ئیتر نازانم ئەو كەسانەی كە بە تۆو خەڵكیتر ئەڵێن، خۆرئاواییەكان تەڵاق دانیان تێدا نییە، یان ددانی پیادا نانێن، لەسەر چ بنەڕەتێك ئەوە ئەڵێن؟!، نازانم چ بەڵگەیەكیان بەدەستەوەیە!.

سكاڵا: بەخوا منیش نازانم، بەڵام پێكەنینم بەخۆم دێت كە چۆن كاتی خۆی یەكسەر باوەڕم بەو جۆرە قسانە ئەكرد، بەبێئەوەی داوای هیچ جۆرە بەڵگەیەك بكەم!!.

---

1 – حقوق الانسان في الاسلام د.علی عبدالواحد ص١٤٢،

2 – سماحة الاسلام د.احمد محمد الحوفي ص٢٢٠.

3– الطلاق بين الفقه والقانون ابراهيم النعمة.

## تەلاق جۆری تری هەیە

ئاواز: سکالاَ ماتو بیر بلاَو دیارە، هەروەك لە کێشەدا بێت وایە!.

دڵپاك: بۆچ، خوانەکردە هیچ شتێکی خراپ روویداوە؟

سکالاَ: نا، هیچ رووی نەداوە، راستییەکەی بیرم بە مەسەلەی تەلاقەوە پەشۆکاوە، هێشتا چەندان پرسیار لە بیرما پەنگی خواردۆتەوە. خوشکە دڵپاك تەنها باسی خۆدامالّین (الخلع)ی بۆ کردین، وابزانم تەلاق تەنها ئەوەندە نییەو جۆری تری هەیە، لە خەڵك باسی تری زۆرم بیستووە.

دڵپاك: خوشکە سکالاَ، خۆ منیش نەمگوت تەلاق تەنها خولعە، بەڵکو جۆری تری هەیە. بەڕاستی مەسەلەی تەلاق مەسەلەیەکی زۆر گەورەو بەرفراوانە، زانایانییش (خوا پاداشتیان بداتەوە)، زۆر بەچاکی لێی کۆڵیونەتەوە،وردەکارییان تێدا کردووە، زۆر گرنگییان پێداوە، چەندەها ئایەتی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە، ئەو زانایانەش زۆر بە وردی هەنگاویان لەژێر تیشکی ئەو ئایەتو فەرموودانەدا هەڵگرتووە.

ناهەقت نییە کە مێشکت پێوەی پەشۆکاوە، چونکە چەندەها کارەساتی دڵتەزێنو چیرۆکی سەیر سەبارەت بە تەلاقکەوتن ئەبیستین. لەوانە: وێرانبوونی هێلانەی بەختیاریی خێزان، ئاوارەبوونی ژنو منداڵ، مەرافەو هەرای ژنو پیاو، گەلێ جار پەنابردنە بەر رێگەی ناڕەواو تاوانکاریی. بۆیە دادگاکانیش بەو مەسەلەیەوە پەشۆکاون، تا کۆمەڵێ بەڕێ ئەکەن، دوانیتر وان بەڕێوە بۆ دادگا، ئەمە جگە لەو گیروگرفتانەی کە ناگەیەنرێنە دادگاکان.

ئاواز: بەلاَم تەلاق لە ئیسلامدا هەرزۆر ناسکە، لەخۆیەوە ئەکەوێ!.

دڵپاك: نا، خوشکە گیان بەو جۆرەش نییە کە تۆ ئەیڵێیت، بەڵێ ناسكو هەستیارە، بەلاَم هەروا بە سووكو ئاسانی ناکەوێ، زانایان هەموو شتێکیان بە درێژیی‌و بە قووڵیی تێدا شیکردۆتەوە، باوکم بە وانە پێی خوێندووم (خوا پاداشتی بداتەوە)، باسەکە هەر زۆر دوورو درێژەو لقو پۆپدارە، کاتێکی زۆری ئەوێ تا هەمووی باس بکرێت، جا منیش هەوڵ ئەدەم بەکورتی شتێکتان بۆ باس بکەم، بەو هیوایەی لێی تێبگەنو کەڵکی لێوەر بگرن، جا لە هەر لایەکیشدا پرسیارتان هەبوو بیکەنو بەپێی توانا وەلاَمتان ئەدەمەوە.

سکالاَ: خوا چاکت بۆ بکات، ئەمە ئەوپەڕی ئاواتی من بوو، وا هاتەدی. خوشکە گیان، خەڵك درۆو دەلەسەی زۆرە لەڕووی ئەم مەسەلەیەوە، جا حەزئەکەم بێ بناغەیی ئەو درۆو دەلەسانەم بۆ دەرکەوێ.

## تەلاقی رەواو ناڕەوا (السني و البدعي)

دڵپاك: تەلاق بەشێوەیەکی گشتی ئەکرێت بە دوو بەشەوە، رەواو ناڕەوا، تەلاقی رەوا: ئەو جۆرەیانە کە لەو رێگەیەوە بێت شەریعەت بۆی دیاریی کردووە (هو الواقع على الوجه الذي ندب إليه الشرع)، ئەویش ئەوەیە کە پیاو یەك تەلاقی ژنەکەی بدات، لە پاکییداو نەشچووبێتە لای ژنەکەی، خوا ئەفەرمووێ: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، بەمجۆرە تەلاقی شەرعی جارێك ئەدرێ، ژنەکە ئەهێنرێتەوە، جارێکی تر دیسان تەلاق ئەدرێ، هەمدیسان ئەگێڕرێتەوە بۆ لای مێردەکەی، پاش ئەوە پیاو بۆی هەیە بە یەکجاریی کە بە چاکی بیهێڵێتەوە، یاخۆ بە چاکی‌و مەردانە دەستی لێ هەڵبگرێت.

ئاواز: ئادەی پێم بڵێ، بۆچ ئەبێ لە پاکییدا (في طهر)، تەلاقی بدات؟

دڵپاك: بێگومان حیکمەتی ئەوە زۆرەو ئێمە هەمووی نازانین، بەلاَم با ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئارەزووی پیاو لە کاتی پاکیدا بەهێزترە لە ئافرەت لەوەی کە لە خوێن (حیض) دابێ، جا ئەگەر پیاو سووربوو لەسەر تەلاقدانی

ژنەکەی‌و لە پاکییدا نەچووە لای ئەمە بەڵگەی ئەمەیە کە دوورە پەرێزیی‌و قین‌و یەکتر نەویستن زۆر بەهێزن لە نێوان ژن‌و مێرددا.

خوای پەروەردگار داوا ئەکات لە پێغەمبەر ﷺ کە مسوڵمانان لەو کاتەدا ژن تەڵاق بدەن کە سەرەتای پاکبوونەوەیان بێ . واتەپاش کەوتنە خوێنەوە، زەیسانییەوە کە پاك ئەبنەوە .و پێش ئەوەی بچنە لایان، چونکە ئافرەت گەر لەکاتی کەوتنە خوێنەوە تەڵاقدرا، لەم کاتەدا لەبار نییە بۆ ماوەی چاوەڕوانی (العدة)، بەوەش ئەو ماوەیە درێژە ئەکێشێ بەسەر ئافرەتەکەوە، خۆ ماوەی کەوتنە خوێنەکە بە چاوەڕوانی ناژمێردرێت، دیارە ئەوەش زیان لە ئافرەت ئەدات، یان ئەگەر لە پاکییدا تەڵاقیدا کەچی چووبووە لای، ئەوسا نازانرێت ئایا سکی هەیە یان نەء؟، ئیتر نازانێ چاوەڕوانییەکەی هی چی ئەبێت؟!، ئایا چاوەڕوانی ژمارەی کەوتنە خوێنەوە بکا یان دانانی سکەکەی؟! خوا ئەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)، بیر لە وشەی (لعدّتهن)و (لام)ەکە بکەنەوە.

لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ لە (نافع بن عبدالله بن عمر) ئەگێڕنەوە، (لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەڵێن إبن عمر بووە) "کە ژنەکەی خۆی لە حەیزدا تەڵاق ئەدات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (فەرمانی پێبدە با بیگێڕێتەوە لای خۆی، لای خۆی بیهێڵێتەوە تا پاك ئەبێتەوە، پاشان ئەکەوێتەوە خوێن، لەپاشا پاك ئەبێتەوە، ئەمجا دوای ئەوە ئەگەر ویستی لای خۆی بیهێڵێتەوە (واتە بەهاوسەریی) ئەگەر ویستی تەڵاقی ئەدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەمە ئەو چاوەڕوانییەیە کە خوا لە تەڵاقدانی ژندا فەرمانی پێکردووە)" أخرجه الامام أحمد وأبو داود والنسائي.

ئەوەی کە دەرکەوتووە لەم گێڕانەوەیەدا، تەڵاق لەو پاکییەدا کە بەدوای کەوتنە خوێندا بێ، ئەگەر بدرێت بە تەڵاقی ڕەوا (السني) ئەژمێررێت، ئەمەش ڕاڕەوی ئیمام ئەحمەدی پێشەوامانە.

سکاڵا: بەخوا زۆربەی خەڵك تەنانەت سەرو ریش سپییەکانیش ئەمەیان، ڕەنگە هەر نەبیستبێ‌و هەر نایشیزانن!.

دڵپاك: بەڵام تەڵاقی ناڕەوا (البدعي) ئەو تەڵاقەیە کە پێچەوانەی تەڵاقی ڕەوا بێت، وەك ئەوە: ناوی سێ تەڵاقە بە یەك وشە (کلمة) ببرێت، یان دانە دانە لەیەك کۆبوونەوە (مجلس)دا سێ تەڵاقەی بدات، تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، یان لەکاتی زەیسانی یاخۆ کەوتنە خوێندا، یان لەکاتی پاکییدا تەڵاقی بدات، کەچی چووبێتە لای. زانایان کۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە تەڵاقی ناڕەوا (البدعی)حەرامەو تەڵاقدەر گوناهبارە.

لەم ڕووەوە جیاوازی فیقهیی زۆرە، جەماوەری زانایان وای بۆ ئەچن کە ئەکەوێ، بەڵگەشیان ئەوەیە ئەڵێن: تەڵاقی ناڕەوا لەژێر ئایەتە گشتییەکاندا دائەنرێت، کە ئیبن عومەر دەری خستووە کاتێ ژنەکەی لە حەیزدا بووەو تەڵاقی داوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بیگێڕێتەوە لای خۆی، ئەوەی بە یەك تەڵاق کەوتن ژماردووە.

کەچی هەندێ زانایان (لەوانە إبن علية کە لە مسوڵمانانی سەردەمی یەکەم (السلف) ە، إبن تيمية، إبن القيم، إبن حزم) وای بۆ چوون کە تەڵاقی ناڕەوا ناکەوێ‌و بەرهەڵستی ئەوە ئەکەن کە لەژێر ئایەتە گشتییەکاندا دابنرێت، چونکە ئەو جۆرە تەڵاقە نییە کە خوا فەرمانی داوە بۆی، بەڵکو لەو تەڵاقەیە کە خوا فەرمانی بە پێچەوانەی ئەوەوە داوە و فەرموویەتی: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ). ئەمەو پێغەمبەر ﷺ بە ئیبن عومەری فەرموو: (مُره فليراجعها)، کاتێ هەواڵی تەڵاق دانەکەی بیست تووڕەبوو، وە پێغەمبەریش بەرامبەر بەوەی خوا حەڵاڵی کردبێ تووڕە نابێت، ئیسنادی ئەو گێڕانەوەی عەبدوڵلا، یان نافیعی کوڕی ڕاستەو کەس نەهاتووە دەمدرێژیی لەسەر بکات، بە ڕاشکاوی ئەیگەیەنێ بەوەی کە ئەو کەسەی هیچی تێدا نەدیووە .لەوەی بۆی زیادئەکەن‌و ئەیدەنە پاڵی . پێغەمبەر بووە ﷺ.

ئەوەی کە دەستمان ئەکەوێ ئەمەیە: رێککەوتن وا دامەزراوە کە ئەو تەڵاقەی پێچەوانەی تەڵاقی رەوایە پێی ئەوتریێ تەڵاقی نارەوا، تەڵاقی داهێنراو (البدعة)، لە پێغەمبەرەوە (د.خ) بە سەلماندوویی پێمان گەیشتووە: (أنَّ کلّ بدعة ضلالة)، ئەمەش جیاوازیی تێدا نییە، دیسان فەرموویەتی: (کُلّ عملٍ لیس علیه أمرنا فهو رد) (متفق علیه).

ئەوانەی کە بۆچوونیان وایە کە تەڵاقی نارەوا ناکەوێ ئەمانەن (عبدالله بن معمر، سعید بن المسیب، طاووس. لەهاورێیانی إبن عباسه .، خلاس بن عمرو، أبو قلابه . لەتابیعینه .، هەروەها پێشەوا إبن عقیل . کە لە پێشەوایانی حەنبەلییان و ئالوبەیتە . الظاهریة، یەکێك لە دوو روو (الوجهان)ی رارەوەکەی پێشەوا ئەحمەدە، إبن تەیمیەش ئەوەی هەڵبژاردووە).

ئیتر نازانم ئاوازخان بە چ بەڵگەیەکەوە ئەفەرمووێ (تەڵاق لە ئیسلامدا هەر زۆر ناسکە، لەخۆیەوە ئەکەوێ)! نازانم بەتەمای ئەوەیە کە وەك ئاسنی ساردی لێبکرێت و بەهیچ شتێ نەکوترێ؟!، دەی ئەوەش بە کارێکی چاك دانانرێت، خوا خۆی لە هەموو زانایەك زاناترە.

سکاڵا: من لێرەدا سەرزەنشتی مامۆستا ئاواز ناکەم، زۆربەی مسوڵمانانیش ئەم دوو جۆرە تەڵاقەیان نەبیستووەو ناتوان لەیەکتر جیایان بکەنەوە، لەوەش زیاتر تەڵاق بەکوێرانە زۆر زۆر ئەدرێت، پیاو بەبێ بیرکردنەوە وەك ئەڵێن: (شەلم، کوێرم، ناپارێزم)، کوتەکی خۆی ئەوەشێنێت، کەچی ذرخەکەی ئافرەتی بەسەزمان و منداڵە هەژارەکانی ئەیدەن.

دڵپاك: مەرج نییە کە مسوڵمانانان هەموویان ئەوە بزانن، ئایا هیچ وڵاتێك بووە، یان ئەبێ کە هاوڵاتیانی هەموویان یاساکەی بزانن؟ یاسا ئەبێ پیاوانی یاسا بیزانن، شەریعەتیش هەر بەو جۆرەیە، دیارە زانایانی ئیسلام ئەوەیان زانیووەو هەر بەوەش حوکمیان کردووە، لەبەر ئەوەش ئافرەت و منداڵەکانی بەتەنیا نرخی هەڵەی پیاویان نەداوە، بەڵکو پیاوەکە خۆی بەشی هەرە گەورەی داوە و دووچاری مەینەت بووە.

ئەها پێشەوا (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: "فەقیهان لێرەوە ئەحکامی تەڵاقیان کردووە بە دوو بەشەوە، تەڵاقی سوننی و تەڵاقی بیدعی".

ئیبن حەزم بە ئیسنادێکی راستەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ئەگێرێتەوە کە تەڵاقی بیدعی، پێغەمبەر لەبارەیەوە فەرموویەتی: (لایعتد بطلاقه). ئەلشەوکانی لە (نیل الأوطار)دا ریوایەتی ئەوانەی کە ئەڵێن تەڵاقی بدعی ناکەوێ بە راستتر ناوبردووە. دیسان (الصنعاني)ش لە (سبل السلام)دا داکۆکیی بۆ ئەم مەبەستە کردووە، زایایانی ئیسلام لەم هەموو گەنجینەیە بێ ئاگا نەبوون، خوشکە گیان.[١]

## یاسای قورئانیی ژمارە ( ٢٢٩ )

سکاڵا: ناوی یاسایەکت برد، باسی ئەوەی ئەکرد کە تەڵاق دووانە، ئەوە یانی چی؟، چۆن تەڵاق دووانە، ئەی سیان نین؟

دڵپاك: باش تێنەگەیشتوویت، من وام نەگوت، ئەوە یاسای ژمارە (٢٢٩)ی سوورەتی (البقرة)یە کە بەشێکی ئەفەرمووێ: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

سکاڵا: دەی من هیچ لە مەبەستەکەی تێناگەم، خۆزگە تێتدەگەیاندم.

1 – بۆ ئەم باسە تەماشای فقه السنەی سید سابق، المرأة في القرآن والسنەی دروزه، الاسلام وقضایا المرأة المعاصرەی بهي الخولي بکە.

دڵپاك: ئەفەرمووێ: (تەڵاقدان دوو جارە، ئیتر گلدانەوە بەچاکی، یان دەست لێهەڵگرتن بە باشیو مەردانە).

سکاڵا: دوو جارە؟! ئەی تەڵاق ژمارەیان سێ دانە نییە؟!

ئاواز: ئای چەند لەسەر شت ئەڕۆی! ئەوە چیتە؟!

دڵپاك: لێی گەڕێ، پرسیارەکەی زۆر جوانو بەجێیە، لەم رووەوە (طبري) لە (إبن زيد) ئەگێڕێتەوە: "کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا فەرموویەتی تەڵاق دوو جارە، ئەی سێیەمیان کوا؟ پێغەمبەر پێی فەرموو (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)"، وەڵامەکە حیکمەتێکی زۆر کاریگەری تیایە، ئەگەر ئەو ریوایەتە راست بێت، لاریش لە راستییەکەیدا بەدی ناکرێت، واتە سێیەمیان بریتییە لە گلدانەوە بەچاکیی، یان دەست لێهەڵگرتن بە باشیو مەردانە،(فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

رستەی (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ)، خاوەنی کاکڵەو مەغزایەکی گرنگە لە بواری جێبەجێکردندا، لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم یاسایەوە هاتووە: کە لە سەرەتای دەستپێکردنی ئیسلامەوە تەڵاق لە جاردا سنووردار نەبوو، پیاو بۆی هەبوو لەماوەی چاوەڕوانی کردنی ژنیدا بیگێڕێتەوە ژێر بەنی خۆی، دیسان تەڵاقی بداتەوەو بیگێڕێتەوە، بە ئارەزووی خۆیو چەند جار بیویستایە ئەیکرد، ئەمجا پیاوێك لە پشتیوانان (الانصار) لەگەڵ ژنەکەیدا ناکۆکییان ئەبێتو رق ئەچێتە دڵیەوەو پێی ئەڵێت: بەخوا نە لای خۆم ئەتهێڵمەوەو نە جیایش ئەبمەوە لێت (بەو نیازەی سزای بداتو وەڕەسی بکات)، ژنەکەی گوتی: چۆن؟ پیاوەکە وتی: تەڵاقت ئەدەم، جا هەر کە کاتی تەواوبوونی چاوەڕوانییەکەت خەریك بوو تەواوببێ، ئەتگێڕمەوە بۆلای خۆم، ژنەکە ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئیتر (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ) هاتە خوارەوە، پیاوی لەو فڕو فێڵە خستو چەکی کرد، ئافرەتی قوتارکرد لەو یاساو باوو نەریتە.

سکاڵا: ئەی بەقوربانی ئەو خوایە بم کە ئەو یاسایەی ناردە خوارەوە.

دڵپاك: ئەم سنووربۆدانانە بەڕاستی شۆڕشێکی گەورە بوو، مافی زەوتکراوی ئافرەتی گێڕایەوەو وای لە پیاو کرد کە نەتوانێ یاری بە تەڵاق بکاتو بەدرێژیی ئەو چەکە بەکاربهێنێ.

ئاواز: من تا ئێستاش بەتەواوی لەم باسە تێنەگەیشتووم!

دڵپاك: پیاو ژنەکەی تەڵاقێك ئەدات، لەکاتی چاوەڕوانیکردندا (العدة)، ئەتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە ژێر بەنی خۆی، بەبێ ئەوەی پێویستی بە هیچ ئەرکو هەڵسوکەوت (إجراء)ێك بکات، بەڵام ئەگەر لێی نەپرسێتەوە هەتا ئەوکاتەی کە چاوەڕوانیی (العدة)ی تەواو ئەبێ، ئەوا لێی بێگانە (بائنة) ئەبێتەوەو بەبێ مارەکردنەوەو مارییەکی تازە ناتوانێ بیگێڕێتەوە ژێر بەنی خۆی، جارێکی تر لەبەر هەمان هۆو هەمان شێوە پیاو هەمان بۆ لوانو دەسەڵاتی هەیە، بەڵام ئەگەر جاری سێیەم تەڵاقیدا ئەوە ئیتر بە یەکجاریی لێی بێگانە ئەبێتو پێی ئەوترێ (البينونة الكبرى)و هەرگیز ناگێڕدرێتەوە ژێر بەنی، سا مەگەر شوو بکاتو مێردەتازەکەی تەڵاقی بداتو خۆی بە ڕەزامەندی خۆی شوو بکاتەوە بە مێردی یەکەم، بە مارەبڕینو مارەییەکی تازە.[1]

ئاواز: لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو یاسایە (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ...) شۆڕشێکی گەورە بووەو بۆ ئافرەت هەموو دنیای هێناوەو ئەیهێنێ..، بەڵام تا رادەیەکی زۆر دەسەڵاتی پیاوی هێشتووەتەوەو پاراستووە.

دڵپاك: ئەزانم مەبستت چییە، بەڵام بە هەڵەدا چوویتو وانییە، هەروەك پیاو مافی ئەوەی دراوەتێ کە لە تەڵاقی یەکەمو دووەمدا بۆی هەیە ژنەکە بگێڕێتەوە ژێر بەن (نیکاح)ی خۆی، هەر بەو جۆرەش بگرە لەوە زیاتریش ماف بۆ ژنەکە دابین کراوە، یاسای ئیسلام هەمووی دادگەرییو ئینصافو رەحمەتە، چ بۆ پیاو، چ بۆ ئافرەت، وەك یەك.

[1] في الظلال القرآن، تفسير قوله تعالى (الطلاّق مرّتان).

پێش هەموو شتێك پیاو ئەبێ مەبدەئی (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) پەیرەو بكات، ئەگەر نەیكرد ئەوە وەك ئەڵێن (پۆلیس نەخەوتووە)، ئەمە لە دنیادا، خۆ سزای دواڕۆژ لە هی دنیا مسۆگەرترو توندو تیژو سەختترە، خوا بە نیازی مێردەكە ئەزانێت، جا ئەگەر نیازی خراپ بوو، بەپێی بڕیاری خوا ئەوە ستەم لە خۆی ئەكاو گاڵتەش بە یاسای خوا ئەكات (وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُواً...).

رستە قورئانییەكە ئەیخاتە دڵەوە كە ئەگەر هاتوو ژنەكە لە چاكی نیەتی پیاوەكە دڵنیا نەبوو، لە گێڕانەوەكەیدا مەبەستی كارچاكیو ژیانێكی نوێی باشتر لە هی پێشوو نەبوو، ئەتوانێ گێڕانەوەكە ڕەد بكاتەوە، بەواتایەكی تر هەروەك پیاوەكە مافو سەربەستیی هەیە لە نەگێڕانەوەی ژنەكەیدا تا ماوەی چاوەڕوانیی تەواو ئەبێتو گێڕانەوەی ئاسایی بەسەر ئەچێو تەڵاقەكە ئەكەوێ، هەر بەوجۆرەش ژنەكە مافی ڕەدكردنەوەی گێڕانەوەكەی هەیە.

جگە لەوەش، ژنەكە هەڵوێستی باڵاتری دێتە بەردەست لە مێردەكەی لە حاڵەتی ئەو گێڕانەوەیەدا، چونكە پیاوەكە منەتبار ئەبێتو دووچاری تەنازول ئەبێت، ئەوەی خەرجی كردووە هیچو ئەبێ بچێتە ژێر باری مەسرەفو مارەبڕینو مارەییەكی تری تازەوە، خۆ ئەگەر ئەمانەی بەدڵ نەبوو، ئەوا ئەو ڕێگەیەی ئەڵێت: (بۆرە نەبێت بازە بێت، یەكێكی تری تەڕو تازەبێت) لەبەر دەستیایە، ها ئاوازخان، ئێستا چی ئەڵێیت؟ بێ پێچو پەنا بیڵێ.

ئاواز: لەڕاستیدا من قەت ئەمەم بەبیردا نەئەهات، وادیارە چاك لە ئیسلام شارەزانیم، داوای لێبوردنت لێئەكەم.

دڵپاك: خوا لێت ببورێ، إنشاء الله چاك شارەزا ئەبیت.

## ژمارە یان جار؟

سكاڵا: من ئێستاش هەر لەم باسە ناحاڵیم، بۆچ تەڵاق بە ژمارەیە، یاخۆ بە جار (المرّة)ەیە؟!

دڵپاك: وەك ئەزانین ژمارەی تەڵاق لەنێوان ژنو مێردێكدا سێ دانەیە، بەڵام ئایا ئەم سێ دانەیە بەیەك قسە، لەیەك جاردا كە بڵێ (سێ تەڵاقەت كەوتبێ)، ئەكەوێ یان نا؟ ئەمەیان جیاوازیی زۆری لەسەرە لەنێوان زانایانی ئیسلامدا، تەنانەت لەم ڕووەوە ئەبن بەدوو بەشەوە:

بەشی یەكەمیان، جەماوەری زانایان ڕایان وایە كە سێ تەڵاقە بەیەك وشە، لە یەك جاردا ئەكەوێ. هەر ئەمانە هەندێكیان ئەڵێن ناكەوێ. ئەوانەش كە بە كەوتووی دائەنێن جیاوازییان لەنێواندا هەیە، هەندێكیان ئەڵێن هەر سێ تەڵاقەكە ئەكەوێ، هەندێكی تریان ئەڵێن تەنها یەك تەڵاق ئەكەوێ. هەندەكەی تریشیان ئەڵێن، ئەگەر تەڵاقدراو مێردی چووبێتە لای هەرسێ تەڵاقەكە ئەكەوێ، ئەگەر نەچووبێتە لای، تەنها یەك تەڵاق ئەكەوێ.

ئەوانەی كە هەرسێ تەڵاقەكە بە كەوتە دائەنێن، هەشت بەڵگەی قورئانو حەدیسیان بە دەستەوەیە، هێنانیان درێژە بە باسەكەمان ئەدات، ئەمەش مەزهەبی جەماوەری تابیعینو گەلیك لەیاران (الصحابة)و پێشەوایانی هەرچوار ڕاڕەو (مذهب)ەكەیە.

بەڵام ئەوانەی كە سێ تەڵاقە بەیەك تەڵاق ئەژمێرن، لە بۆچوونەكەیاندا پەنا ئەبەنە بەر چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺو چەند هەڵوێستێك، كە لەوكاتەدا ڕوویانداوە كە (مسلم، أحمد، أبوداود) ئەو فەرموودەو هەڵوێستانە ئەگێڕنەوە.

ئەمانە ئەڵێن لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، لەسەردەمی (ئەبوبەكر)و تا دوو ساڵی خەلافەتی (عومەر)یش، سێ تەڵاقە بە یەك جار بەیەك تەڵاق دانراوەو مامەڵەی پێكراوە. (الشوكانی) ئەڵێت: (صاحب البحر ئەمەی لە أبي

موسا گێڕاوەتەوە، ریوایەتێکە لە علی کوڕی أبوطالب، إبن عباس، طاوس، عطاء، جابر، إبن زید، الهادي،القاسم، الباقر، أحمد بن عیسی، عبدالله بن موسی بن عبدالله، ریوایەتێکیشە لە زید بن علی یەوە).

کۆمەڵێك لە (متأخرین) هەر بۆ ئەم رایە چوون، لەوانە: إبن تیمیة، إبن القیم، کۆمەڵێك لە لێکۆڵەرەوەکان. (إبن مغیث) لە پەڕاوی (الوثاق)دا، ئەوەی لە محمد بن وضاح وەرگرتووە، ئەو فتوایەی بەو جۆرە لە کۆمەڵێك لە مامۆستایانی (قرطبة)وە وەرگرتووە، لەوانە: محمد بن بقي و محمد بن عبدالسلامو چەندانی تر. (إبن المنذر)یش ئەوەی لە یارانی ئیبن عیسا وەرگرتووە، لەو یارانە: عطاء، طاوس، عمر، إبن دینار، دیسان إبن مغیث ئەوەی لە علي، إبن مسعود، عبدالرحمن بن عوف و زبێرەوە وەرگرتووە.

ئەوانەش کە جیاوازی ئەکەن لەنێوان ئەوەدا کە مێردەکە چووبێتە لای ژنەکە، یان نەچووبێت، کۆمەڵێکن لە یارانی إبن عباس إسحاق بن راهویة.

ئاواز: ئەوانەی کە سێ تەڵاقە بەیەك وشە بە کەوتوو دائەنێن، مادام هەشت بەڵگەی قورئانیو حەدیسییان بەدەستەوەیە، راکەی ئەوان ئەخوا، کەواتە ئەوانەی کە بەیەك تەڵاقی ئەژمێرن هەڵەنو ئەبوایە هەر قسەیان نەکردایە.

دڵپاك: نەخێر هەڵە نەبوونو هەقیانە کە قسە بکەن، چونکە ئەمانیش خاوەنی بەڵگەنو بیری خۆیانیان لەسەر رۆشنایی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺو بێژە قورئانییەکان خستۆتە کار، خۆیان ماندوو کردووە بۆ خزمەتی ئایینی ئیسلام، خوا پاداشتیان بداتەوە.

االنسائي لە محمود بن لبید ئەگێڕێتەوە: (پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دایێ لەبارەی پیاوێکەوە کە سێ تەڵاقەی بەسەر یەکەوە داوە، پێغەمبەر بە تووڕەییەوە هەڵسایەوەو فەرمووی: ئایا گاڵتە بە کتێبی خوا بکرێت، لە کاتێکدا کە لە ناوتانذدام؟!، تەنانەت پیاوێك هەڵسایەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیکوژم؟).

إبن القیم لە (إغاثة اللهفان)دا ئەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ پیاوەکەی بە گاڵتەکەر بە کتێبی خوا (قورئان) دانا"، چونکە پێچەوانەی یاساکەی جووڵایەوە، ئەوەی کە خوا نەیئەویست ئەو وەهای کردبوو، خوا ویستوویەتی هەر کە پیاو تەڵاق بەدەمیدا هات، ماوەی گێڕانەوەی ژنەکەی هەبێت، ئەگەر بیەوێ، کەچی ئەو کابرایە تەڵاقدانی وای گرتەبەر کە مۆڵەتی گێڕانەوەی تێدا نەبێت.

دیسان خستنی سێ تەڵاق بەیەکجار پێچەوانەی فەرموودەکەی خوایە (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ). دووجارو جاران (المرتان والمرات) لە زمانی قورئانو حەدیسدا، بەڵکو لە زمانی عەرەبیدا، بەڵکو لە زمانی هەموو نەتەوەکانی ردا، لەبەر ئەوەی جار لەدوای جارە، ئەگەر دوو جارو جارانی لەیەکجاردا کۆکردەوە، بێگومان لە سنووری خوا (حدود الله) دەرچووەو لەوە کە کتێبی خوا ئەیگەیەنێ دەرچووە، جا بەو بێژەیەی کە خوا حوکمێکی پێ رێکخستووە، چۆن ئەبێت حوکمێك لەدژی بکرێت؟".

أبا الصهباء بە ئیبن عەبباسی گوت: "ئەی نازانی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ سێ تەڵاق بە یەك دانە ئەژمێررا و لە ژیانی ئەبوبەکرو سەرەتای خەلافەتی عومەریشدا؟ ئیبن عەبباس گوتی: بەڵێ ئەزانم) (رواه مسلم). دیسان لێی ئەگێڕنەوە: "لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکرو دوو ساڵی خەلافەتی عومەردا سێ تەڵاق بە یەك تەڵاق دائەنرا، عومەر فەرمووی: خەڵکی پەلە ئەکات لە کارێکدا کە هێواشیی تێدا بوو بۆیان، لێیان دابڕ نەکەین (فلو أمضیناه علیهم)؟ ئیتر لێی دابڕکردن.

سکاڵا: ها! ئێستا تێگەیشتم، خوا پاداشتت بداتەوە، تۆ گوتت زانایان ئەبن بە دوو بەشەوە، یەکەمیانت بە خۆیو بەشەکانیەوە باسکرد، ئەی بەشی دووەمیان ئەڵێن چی؟.

دڵپاك: بەشی دووەمیان ئەڵێن، بەهیچ جۆرێك سێ تەڵاقە بە یەکجار ناکەوێ، چونکە ئەو تەڵاقە داهێنراوە، (بدعە)یە، جا لای ئەمان تەڵاقی داهێنراو ناکەوێو بەتاڵە.

ئەم راڕەوە لە هەندێ لە تابیعین ئەگێڕدرێتەوە، لە ئیبن عەلیة، هیشامی کوڕی حەکەم. ئەبو عوبەیدە، هەندێ لە (أهل الضاهر)یش هەر وا ئەڵێن، وە ئەوە راڕەوی (ئەلباقر، ئەلصادق، ئەلناصر)و ئەوانەیە کە ئەڵێن تەڵاقی داهێنراو ناکەوێ.

باسەکە دوورو درێژو زۆر قووڵە، چاك وایە لەمە زیاتر لەسەری نەڕۆین.

ماوەی چاوەڕوانیی (مده العده) سکاڵا: گەلێ جار ناوی ماوەی چاوەڕوانیت برد، ئەو ماوەیە چەندەو لە بنەڕەتدا چییە؟

دڵپاك: بەو ماوەیە ئەگوترێ کە ئافرەت لە نێوان تەڵاقدانا، یان مردنو شووکردنا ئەیکات، زاناکان بە کۆمەڵ لەسەر ئەوەن کە پێویستە (واجب)ە، چونکە خوا ئەفەرمووێت: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ) (البقره : ٢٢٨ ).

ماوەکەشی بەمجۆرەیە: ئەو ئافرەتەی کە ئەکەوێتە خوێنەوە، سێ کەوتنە خوێنەوە چاوەڕوانی ئەکات، ئەوەی لەکەوتنەخوێنە وەستاوەتەوە سێ مانگ، مێرد مردوو ئەگەر سکی نەبێت، چوار مانگو دە رۆژ، سکپڕ ئەبێ سکەکەی دانێ.

ئاواز: بەڵام بوونو نەبوونی ئەو ماوەیە چ کەڵکێکی هەیە؟.

دڵپاك: ئەوە ئەڵێی چی؟! بوونی ئەو ماوەیە ئێجگار گەورەو گرنگە، چونکە:

أ. خاڵییەتیو ناخاڵییەتی رەحم (مندالْدان) دەردەکەوێ، بەمەش بنەچەی خەڵك لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ نابن.

ب. سازدانی هەلْویستێکە بۆ ژنو مێرد تا سەرلەنوێ ژیان دەستپێبکەنەوە، ئەگەر زانییان خێری تێدایە.

ج. وریاکردنەوەیەکە سەبارەت بە مەزنی مارەبڕین تا بزانرێ کە کارێکی رێکوپێكو بێ کۆبوونەوەی چەند پیاوێك سەرناگرێتو بێ چاوەڕوانییەکی درێژ نابێت، ئەی خۆ یاری منداڵان نییە.

د. کەڵکی مارەبڕین نایەتەدی هەتا ژنو مێرد دەرس دانەدرێن لەسەر بەردەوامیدان بەو پەیوەندییەی لەنێوانیاندایە.

سکاڵا: الله! یاسایەکی چەند وردو دووربینە، هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووەچ گەورەو چ بچووك، بەڕاستی یاساو بەرنامەیەکی بێ وێنەی خواییەو گەواهیی راستیی خۆی هەر خۆی ئەیدات.

دڵپاك: خوشکەگیان، ئەوە بە سەیر مەزانە، بەرنامەی خوا دیارە ئەبێ رێکوپێكو تێرو تەواوبێ، چونکە دانەرەکەی خوایە.. خوا. خالقیی ئادەمیزادەو بە هەموو گیروگرفتو کونو قوژبنێکی دەروونی ئادەمیزاد شارەزایەو چارەسەریشی بۆ دیاری کردووە. بۆیە ئەگەر ئافرەت بیەوێ بەرەو بەختیاریی خۆی بڕوات، ئەبێ پەیڕەویی یاسای ئیسلام بکات.

سکاڵا: مامۆستاگیان، من حەزم لە نموونە هێنانەوەیە، ئافرەتێك چۆن لەسەر یاسای ئیسلام تەڵاق ئەدرێ؟، دیارە تەڵاقدانی رەوا (سنی)یم مەبەستە.

ئاواز: ئۆهۆو.. دیسان دەستت پێکردەوە.

## تەڵاقدانی جاری یەکەم

دڵپاك: پاش هەنگاوەکانی ئامۆژگاریکردن، جێگالێجیاکردنەوە، لێدان، کەوتنە نێوانەوە، پیاو یەك تەڵاقی ژنەکەی ئەدات . تەڵاقی شەرعی بەمجۆرەیە .، خوای میهرەبان کاتێکی دیاریکردووە کە ئەبێ ئافرەت بەسەری بەرێت کە پێی ئەوترێ کاتی چاوەڕوانی(العدة)، کە وەك قۆناغی تێپەڕبوون (فترة الإنتقال) وەهایە، لەم ماوەیەدا ئافرەت لە گرێی ژیانی مێردداریی و ئەرکەکانی دوور ئەکەوێتەوەو ئەکەوێتە ژیانێکی ترەوە، ئەرکی ئەو پیاوەی بەسەرەوە نامێنێ، پێویست ناکات کە باسی ماوەکە بە درێژی بکەینەوە.

ئەوەی کە شایەنی باسە، ئەبێ ئافرەت ئەو ماوەیە لە ماڵی پیاوەکەیدا بەرێتەسەر، دروست نییە بۆ ژنەکە کە بچێتە دەرەوە . ماڵەکە بەجێبێڵێ .و دروست نییە پیاوەکە دەری بکات: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ) (الطلاق:١).

ئەم دەرکردن و دەرنەچوون و چوون و نەچوونە دەرەوەی ئافرەتە لە رۆژدا، یان لەشەودا، جیاوازییەکی فیقهی زۆری لەسەرەو ئێمەش با لێی دووربکەوینەوە چاکترە، ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە هەموو خەرج و مەسروفێکی ئەو ئافرەتە لەسەر پیاوەکەیە . جگە لە مێرد مردوو . لەو ماوەیەدا، هەرچەندە لەوەشدا جیاوازییەکی زۆرو کەم لە نێوان فەقیهاندا هەیە. ئەویش لەجێگەی مانەوەی ئافرەتەکەدا.

سکاڵا: بەڕاستی ئەوپەڕی پاراستنی مافی ئافرەتی رەچاو کردووە.

دڵپاك: جا ئەگەر بەرنامەی خوا مافی ئافرەتی رەچاو نەکردبێ، ئەبێ چ بەرنامەیەکیتر رەچاوی کردبێت، یان رەچاوی بکات؟! ئەوانەی کە داوای مافی ئافرەت ئەکەن، بەکوێریی هەنگاو هەڵئەگرن، بگرە هەر خۆیان ئەیچەوسێننەوە، لەڕاسیشدا ئیسلام ناناسن، شارەزای نین، هیچی لێنازانن، ئەوەی کە ئەیڵێن لە بارەی ئیسلامەوە لە بارودۆخ و هەڵەکاریی و ژیانی ئەوانەوە وەریان گرتووە کە تەنها بە ناو، یان بە پێناسی باری کەسێتی (جنسية احوال شخصية) مسوڵمانن، خۆ ئەگەر لە ئیسلام شارەزا ببوونایە رەنگە ئەو گاڵەگاڵەیان نەکردایە، رەنگە دەمدرێژییان دەربارەی ئیسلام نەکردایە، حوشکەکانم، هەوڵبدەن تا شارەزای ئیسلام بن، بەڕاستی بە ناسین و شارەزابوونی، رێگەی بەختیاریی ئافرەت ئەدۆزنەوە.

## تەڵاقدانی جاری یەکەم تاقیکردنەوەیە

ئاواز: لەو ماوەیەدا . وەك لەباسەکەدا دەرئەکەوێ . ژنەکە تەڵاقی کەوتووە کەچی دەرناکرێت و نابێت بچێتە دەرەوەو لێی جیاببێتەوە، من ئەمەم بەلاوە وەك بەستنەوەی ئافرەت وایە، ئەگینا یانی چی؟

دڵپاك: نا، وا نییە کە تۆ بۆی ئەچیت، ئەوە کەڵك و حیکمەتی تایبەتی خۆیی هەیە، بێگومان مانەوەی ئەو ژنە لە ماڵێ مێردەکەدا، لەنزیکیەوە، کاریگەری زۆرە، هیوای گەڕانەوەی پەیوەندی بۆ سەر حاڵەتی سرووشتی لێ ئەکرێت، ئایا ئەوە بەکەم ئەزانن؟.

بەڵێ نابێ ژنەکە لەو ماڵە بچێتە دەرەوەو ئەگەر بچێت تاوانبار ئەبێ، سا مەگەر پێویستی ناچاری بکات.

سکاڵا: دەی مامۆستا دڵپاك، وەك ئەڵێن: (شەیتان زۆرداره) ئەی ...؟

دڵپاك: ئەزانم مەبەستت چییە، گوێ بگرە بۆ ئەبو حەنیفە کە ئەفەرمووێ: "بۆی هەیە خۆی ئارایش بدات بۆ ئەو پیاوە مادام لە عیددەی ئەوایە، بۆی هەیە خشڵ بدات لەخۆی، جلی جوان لەبەر بکات، بۆنی خۆی خۆش بکات بۆی، بەجۆرێك خۆی بنوێنێت بۆی کە دڵی رابکێشێ و ئا ئەو خۆشەویستییەی کە ون بووە، بێتەوە جێگەی خۆی".

پیاو بە یەك وشە (راجعتُك)، یان وشەیەك لەو بابەتە، ژنەکەی ئەهێنێتەوە ژێر بەنی خۆی، بەڵام بەمەرجێ ماوەکە تەواو نەبووبێت، خۆ لەو ماوەیەدا بۆی نییە شوو بکات، بەڵکو لەژێر تەصەڕروفیدا ئەمێنێتەوە، بەهیوای ئەوەی لەو ماوەیەدا ئارەزووی گەڕانەوە، یان گێڕانەوە چەکەرە بکا. ئیسلام ئەوە بە پەسەند ئەزانێ کە ژنەکە بگێڕرێتەوە، یان بگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، نەك شوویەکی تر بکات، (وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحاً) (البقرة: ٢٢٨).

بۆ ئەوەش کە تۆ مەبستتە، راستە شەیتان زۆردارە، بەڵام ئایا ئەزانی گێڕانەوە (الرجعة) هەر وەك بە قسە دێتەدی، هەر بەوجۆرەش بە کرداریش وەك – چوونەلا – الجماع –و پڕوپیتاکەکانی وەك ماچکردن و ئارەزووبازیی دێتەدی؟ هەرچەندە لەمەشدا کەمێك جیاوازی فیقهیی هەیە.

سکالا: زۆر چاکە، دیارە لەو ماوەیەدا ئەگەر پیاوەکە هۆی ناکۆکییەکە بووبێ و پەشیمان بووبێتەوە، ئەوە ژنەکە ئەگێڕێتەوە، ئەی ئەگەر نەیگێڕایەوە تا ماوەکە تەواو ئەبێت، چۆن ئەبێ؟.

دڵپاك: باسی ئەوەمانکرد، دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە، ئەگەر گێڕایەوە، ئەبێ لەڕێگەی مارەبڕینێکی تازەوە بێت، بە مارەییەکی تری تازە بێت، ئەگەر ئەوە رووی نەدا، ئەوا ئیتر ئەتوانێ شوو بکات، خۆ ئەگەر هۆی ناکۆکییەکە لە ژنەکەوە بووو حەزی لە گەڕانەوە کرد ئەوە هەر هەمان شێوەی پێشووە، ئەگەر وەها نەکرا، ئەوە ئیتر هەریەکەیان بەپێی جۆری حاڵەتەکە ئەچن بەلایەکدا، بەبێ ئەوەی کە مافی هیچ کام پێشێل بکرێت.

سکالا: بەڕاستی ئەو ماوەیە بەکەڵکە بۆ هەردوولایان ئەگەر من دەسەڵاتم ببوایە، هەرکامیان سوودی لەو ماوەیە وەرنەگرتایە سەریم پان ئەکردەوە.

دڵپاك: دەی ئیسلام سەریان پان ناکاتەوە، بەڵکو ویست و بەرژەوەندییان رەچاو ئەکا و ئەیپارێزێ.

## تەلاقدانی جاری دووەم و سێیەم

سکالا: گریمان پاش رێککەوتنەوەیان بە ماوەیەك، دیسان هەراو ئاژاوەو ناکۆکی و جەنگ و جڵەبە کەوتەوە نێوانیان، ئەمجارەیان چۆن ئەبێ؟

دڵپاك: ئەمجارەش وەك جاری پێشوو، هەمان هەنگاوەکانی ئامۆژگاریکردن، جێگا لێجیاکردنەوە، لێدان، کەوتنە نێوانەوەی دوو حەکەمەکە ئەگیرێنەوەبەر، ئەگەر رێککەوتنەوەو زانییان ئەتوانن لە سنوور (حدود الله)دا دەرناچن، ئەوا ئەبنەوە بە هاوسەری یەکتر.

بەڵام ئەگەر رێکنەکەوتنەوە، ئەوا یەك تەلاقیتر ئەدرێت، دیسانەوە ماوەی چاوەڕوانی کردنی لەسەر پێویست ئەبێتەوە، بەهەمان شێوەی جاری یەکەم، ئەگەر لەو ماوەیەدا رێککەوتنەوە ئەوا چاکە، خۆ ئەگەر ماوەکە تەواوبوو ئەوجا حەزیان لەیەکگرتنەوە کرد ئەوە بە مارەبڕین بە مارەییەکی تری تازە ئەبێت.

ئاواز: گریمان بە هەرکامیان بوو، رێککەوتنەوە، بەڵام وەك ژیانی پێشوویان هەر گاڵەو هەرا بوو، هەر پشێویی و دژایەتی بوو، ئەمجارە چی ئەبێ؟.

دڵپاك: ئیتر دوا هەل خۆی ئەسەپێنێ، لەم دوو رێگایە زیاتر رێگایتر نییە: (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ)، (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ). وەك (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: "پیاو ئەگەر دووجار تەلاقی ژنەکەیدا، با لە سێیەم جاردا لەخوا بترسێ، با بەچاکە لەگەڵیدا بمێنێتەوە و بجووڵێتەوە، یان بەباشی و مەردانە ئازادی بکات و سەبارەت بەمافی ستەمکار نەبێت".

تەڵاقدانی شەرعیی بەمجۆرەیە کە باسمانکرد مامۆستا ئاواز. ئایا تەڵاق لە ئیسلامدا ناسکەو هەر لە خۆیەوە ئەکەوێ؟

ئاواز: نەخێر، ناسك نییە، بەڵام ئەو دوو ماوەیەی چاوەڕوانی کردنە ئافرەت تووشی پەژارەیەکی دەروونیی گەورە ئەکات.

## ئەو پەژارەیە دەرمانە

دڵپاك: خوشکی بەڕێزم، بەڵێ ئەو ماوەیە پڕ لە پەژارەیە، بەڵام نەك هەر بۆ ژنەکە بە تەنیا، بەڵکو بۆ مێردەکەشی هەمان شتە، بەڵام ئەگەر ئەو ماوەیە نەبێت، ئەو ژن و مێردە هەست بە تاڵیی و ناخۆشیی ژیانی تەنیایی و لێکجیابوونەوە (فراق) ناکەن. بیر لە خێرو خۆشی ژیانی هاوسەرێتی ناکەنەوە، ماوەکە خۆی بۆ ئەوەیە کە پەژارە هەردوولایان . بەتایبەتی تاوانبارەکە . دابگرێت، ویژدانی وریا ببێتەوەو ئازاری بدات، پەژارە دڵ‌و مێشکیان دابگرێت‌و حەسانەوەیان لێ دووربکەوێتەوە، سا بەشکو بەوە ئاوەزیان بکرێتەوە، هەست بە پەشیمانیی بکەن، ڕێگای یەککگرتنەوە بگرنەوە بەر، بەمجۆرە پەژارەکە ببێتە دەرمان بۆیان.

ئاواز: بەڵام پەژارە نابێتە دەرمان، چۆن دەرد ئەبێتە دەرمان؟

دڵپاك: نا، وانییە، هەراو ناکۆکی ژن و مێرد نەخۆشییەکی سایکۆلۆژییە و ئەتوانێ ببێتە دەرمانێکی بەکەڵك بۆی.

زۆربەی ئەو ژن‌و مێردانەی کە قڕەو هەرایان ئەبێت، لەسەرەتادا بیر لە ئەنجامی تاڵیی جیابوونەوە ناکەن، یان بە سووك‌و ئاسانی ئەزانن، بەڵام کە لێکتر دووردکەوتنەوە، جیابوونەوە یەخەی گرتن‌و تامەکەیان چەشت، ئەوسا هەست بە تاڵییەکەی ئەکەن، ئەمجاپەژارە روویان تێئەکاو پەندەکەش (قەدری قەدرزان وەختێ مزانی، جە بیابانی چۆڵ بە گیر بمانی) کاری خۆی ئەکات لە دەروونیاندا.

سکاڵا: ئەو ماوەیە هەر زۆر پێویستە، بەڵام یەکجار بەس نییە؟

دڵپاك: نەخێر یەکجار بەس نییە، چونکە هەندێ کەس سرووشتی وەهایە بە تەنیا جارێك، لە هیچ شتێکا راستی بۆ دەرناکەوێ، کەڵك لە تاقیکاریی وەرناگرێت، بە چاکیی لەشت ناگات، لەبەر ئەوە خوای گەورە ماوە و ماڤ دووجاری داوەتێ، بەشکو جاری دووەم بگاتە ئەو رادەیە کە فام بەڕاستیی بکات‌و ڕێگەی راست بدۆزێتەوە.

ئەوکاتە ئادەمیزاد دووجار بەو تاقیکردنەوەیە خۆی هەر ئەناسێت، جیابوونەوە لە هاوسەری ژیان گاڵتە نییە، گران‌و زەحمەتە، ئیتر حاڵی دڵی خۆی ئەزانێ، بیر لە مەسەلەکە ئەکاتەوە، ئەگەر زانی خێرو چاکە لە هێنانەوە و گەڕانەوەدایە، ئەوا ئەیکات‌و شێوازی خۆی ئەگۆڕێ، خۆ ئەگەر خێرو چاکەی لە جیابوونەوەدا دێ، بەشێوەیەکی پاك‌و چاك لە هاوسەرکەی جیائەبێتەوە،

لەمەشدا ئەوپەڕی میهرەبانی خوای گەورە بەرامبەر بەندەکانی خۆی ئەنوێنێ‌و دەرئەکەوێ.

ئابەم شێوە جوانە مامناوەندیی‌و واقیعییە، پەروەردگار ڕێگەی گونجاندنەوەو پێکەوەسازان‌و ڕێککەوتنەوە یان جیابوونەوەی ژن و مێردی داوە، هیچ لایەنێکی لەم رووەشەوە فەرامۆش نەکردووە، هەموو ژیرییەکی ساغ‌و پاك ئەم بەرنامە جوانە تەواوە پەسەند ئەکات‌و ملی بۆ کەچ ئەکات، لە یەککگرتنەوەو جیابوونەوەشدا یاساکانی مامناوەندیی (وسط)ن، نە تەسك‌و تروسکییەکی وەڕەسکەر، نە فراوانییەکی بێمانای پڕ لە بەرەڵڵایی بێسنوورە.

کەچی ناحەزان – سا لەبەرهەر هۆیەك بێ – هەموو درۆو دەلەسیەك بەبێ شەرمانە هەڵ ئەبەستن، هەروەك هەست بەوە نەکەن کە (پەتی درۆکردن کورتە)! بە درۆوە فرمێسك ئەڕێژن، گوایا ئافرەت هەژارو چەوساوەیەو

ئیسلامیش لەو چەوساندنەوەیەدا بەشدارە، جا ئەوان داوای پاراستنی ماڧ ئەکەن، هەروەك ماڧ ئافرەت لە بەرەڵڵاییدا بێ، بە تەنها بەرەڵڵاکردنی دەستی بکەوێت، لە باوەشی بێگانەدا ماڧ ئافرەت خۆی شاردبێتەوە! هەروەك خێزان و خێزانداریی نەنگیێ بن و ماڧ ئافرەت قووت بدەن!!

بەڵێ، ئیسلام ڕێگەی بەرەڵڵایی نادات، چ بۆ پیاو، چ بۆ ئافرەت، بەڵام ڕێگەنەدان بە بەرەڵڵایی مافخواردن و چەوساندنەوە نییە، بەڵکو سەربەرزی و شکۆیی و مەردایەتیی و مرۆڤایەتیی و بێگەردییە بۆ ئافرەت و پیاو وەك یەك، هێشتنەوەی مرۆڤە لە پلەی بەرزی مرۆڤایەتییدا، هێشتنەوەی کەرامەت و ئابڕووو بڵندییە بۆ نێرومێ، دیارە ناحەزانیش ئەمەیان ناوێ، بۆیە دژی دەوەستن.

ئەگەر سەربەستیی بەرەڵڵایی بێ

یان مافپەروەریی گەر گومڕایی بێ

دەك هەر پیرۆزی بێ باوەڕان بێ

دەك بەرگ و کاڵای هەڵەوەڕان بێ

## کات و کەسی خۆی ئەوێ

سکاڵا: کەواتە کەوتنی تەڵاق کاتی دیاریکراوی تایبەتیی خۆی هەیە، بەڵام دڵنیام کە زۆربەی خەڵك تەنانەت خوێندەوارانیش، نازانن کە تەڵاق لەکاتی کەوتنە خوێنەوەی ژندا، هەروەها لەکاتی پاکبوونەوەشدا مادام مێردەکەی چووبێتە لای، ناکەوێ.

دڵپاك: زانین و نەزانینی ئەوانە زۆر گرنگ نییە، چونکە ئەوە وەك گوتمان کاری زانایانە، دیارە زانایان ئەیزانن، ئەی هەر خۆیان (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)ەیان بەمجۆرە (فطلقوهنّ في الطهر الذي لم يجامعن فيه) لێکنەداوەتەوە؟ ئەگەر تەماشای پەڕاوە فیقهییەکان بکەی ئەبینی (ل) لامەکەی (لِعِدَّتِهِنَّ)ە بەمانای (في) لێکدراوەتەوە.

خوشکە ئاواز گلەیی لە ماوەکە هەبوو، ئیتر بیر لەوە ناکاتەوە کە لەوانەیە هۆی ڕێککەوتنەوە لەو ماوەیەدا لەلایەن خواوە برەخسێت، هۆیەکی وا کە هەرگیز بە بیری مرۆڤدا نەیەت، یاخۆ ڕەنگە بیری لەوە نەکردبێتەوە کە ژیانی ئافرەت لە نێوان کەوتنە خوێنەوەو پاکبوونەوەدا دەساودەس ئەکات و لە حاڵەتی یەکەمدا تەڵاق حەرامەو لە دووەما ئەگەر پیاوەکەی چووبێتە لای هەم تەڵاق حەرامە، بەهۆی ئەوەیشەوە پیاو پێویستە چاوەڕوانی یەك حەیزو یەك پاکبوونەوەی تەواوو حەیزێکی تر بکات بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی، ئەو ماوەیەش کەم نییەو عادەتەن لە مانگێك کەمتر نابێت، لەوانەیە لەو ماوەیەدا گەلێ کارو ئیعتیباراتی وا، یان گەلێ بە بیردا هاتن و جۆشی دەروونی بێنە پێشەوە کە ببنە هۆی گۆڕینی بیروڕای ژن و مێردەکە، بۆیە خوا ئەفەرمووێ: (لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً).

ئەی کێ ئەڵێت لە ماوەی ئەو چاوەڕوانییەدا سکپڕیی ژنەکە دیاریی نادات؟ ئایا ئەو سکپڕییە بیروڕای ئەو ژن و مێردە ناگۆڕێت؟، ئەی کێ ئەڵێت لەسەر منداڵ هەراکەیان رووی نەداوە؟

بەڕاستی ئیسلام لە مەسەلەی تەڵاقدانا ئەتوانم بڵێم زیاتر لایەنی ئافرەتی گرتووە، ناحەزان هەرچی بڵێن وەك ئەوە وایە کە تفەنگ بە تاریکییەوە بنێن.

تەڵاق هەروەك کاتی خۆی ئەوێ هەر بەوجۆرەش کەسی خۆی ئەوێ، خۆ منداڵ بازاڕ نییە.

سکاڵا: پیاوی خۆی ئەوێ؟! مەبەستت چییە دڵپاك گیان؟

دڵپاك: ئاخر خۆ تەڵاقی هەموو کەسێك ناکەوێ، هی وا هەیە گەر ژن تەڵاق بدات تەڵاقەکەی بە هیچ دائەنرێت.

زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە تەنها مێردی ژیر، باڵق، خاوەن ویست (المختار) ئەگەر ژن تەلاق بدات، تەلاقی ئەکەوێ، ئەویش دیارە لە کاتی شیاودا . وەك گوتمان .

کەواتە شێت، منالی نابالق، زۆرلێکراو، تەلاقیان ناکەوێت: (رفع القلم علی ثلاثة: عن النائم حتی یستیقظ، وعن الصّبي حتی یحتلم، وعن المجنون حتي یعقل) (عن علي کرّم الله وجهه عن النبيّ ﷺ).

سکالا: ها، خەوتووو منالو شێت، خۆ زۆرلێکراوی تێدا نەبوو.

دڵپاك: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (رُفع عن أمتي الخطأ والنسیان وما آستکرهوا علیه) (أخرجه إبن ماجة وإبن حبان والدار قطنی والطبراني والحاکم وحسنه النووي).

سکالا: جوانە! هەڵەکردن، لەبیر نەبوون، زۆرلێکردن.

دڵپاك: جەماوەری فەقیهان لەسەرئەوەن کە سەرخۆش (السکران) تەلاقی ئەکەوێ، بەلام قەومێك ئەڵێن ناکەوێت، چونکە سەرخۆش وەك شێت وایەو ژیریی خۆی لەدەستداوە، حەزرەتی عوسمان بە نەکەوتووی دائەناو هەندێ لە (أهل العلم)یش ئەڵێن، هیچ یارێکی پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی عوسمانی لەوەدا نەکردووە .

ئەو کەسەی تووڕە ئەبێ، لەکاتی تووڕەبوونەکەیدا ئەگەر تەلاقی ژنەکەی بدات، ناکەوێ، چونکە ئەوەی کە ئەیڵێ تەصەووری ناکات، نازانێ چی ئەکاتو چی ئەڵێت، ویستی لەدەست دەرئەچێت (لا طلاق ولاعتاق في إغلاق) (رواه أحمد وأبوداود، وإبن ماجة والحاکم وصححه). ئیبن تەیمییە لە (زاد المعاد)دا بە تووڕەیی ناوبردووە لە جۆرو پلەی تووڕەییەکەدا جیاوازی هەیە.[1]

هەروەها ئادەمیزادی بێئاگاو سەهووکەر (الغافل والساهی) هیچکامیان تەلاقیان ناکەوێت، هەروەك بیر شێواو (المدهوش) کە ئەمیش دیسان تەلاقی ناکەوێت، مەدهووش کەسێکە بەهۆی سەدەمەکەیەوە ژیریی ئەشێوێ، بیری سەرگەردان ئەبێت.

ئەو کەسەش کە بووراب‌ێتەوە، یان وڕێنە بکات، یان لەبەر پیریی، یاخۆ بەسەرهاتێك ژیریی لە شوێنی خۆیا نەمابێ، تەلاقی ناکەوێ.[2]

ئەمەش کورتەیەك سەبارەت بە کاتو کەس هەندێکم ڕوونکردەوە بۆتان، جا ئەگەر ئارەزووتان کرد کە بە درێژیی باسەکە بزانن تەماشای پەڕاوە فیقهییەکان بکەن.

سکالا: بەڕاستی مەسەلەکە زۆر بە وردیی توێژینەوە کراوە، کونو قوژبنی خراوەتە بەر لێکۆڵینەوە، کەچی نازانم خەڵك لەسەر چ بنەڕەتێك ئەو هەموو هێرشە ناڕەوایانە ئەهێنێ بۆ سەر ئیسلام!

دڵپاك: ئای.. ئای! سەرچاوەی نەگبەتیو بەدبەختییەکە لەوەدایە کە هێشتا زۆربەی مسوڵمانان نازانن ئەم هەموو هێرشو درۆو دەلەسە زۆرو پەلاتە جۆربەجۆرانە لە کوێوە ئەکرێنو دێن، تەنانەت بیریشی لێناکەنەوە.، وا ئەزانن هیچ کەس ناحەزیان نییەو کەس لە مەلاسدا نەبووەو نییە بۆیان، جا ئەگەر مسوڵمانان ئەوەیان بزانیایەو کەمێ وریا بوونایە، ڕۆژیان ئەگەیشتە ئەمڕۆ؟ حاڵی ئافرەت بەمجۆرەی ئێستە ئەبوو؟. ئەوەش ئەزانی خوشکە گیان، إن شاء الله ئەگەر ماین گەلێ شاراوەت بۆ دەرئەکەوێ.

---

1 – تەماشای فقه السنة ، ج٢ بکە، دانانی (السید السابق).

2 – إبن القیم لە (اعلان الموقعین)و ابوداود لە (سنن)ەکەیدا (إغلاق) بە تووڕەیی ئەژمێرن.

# ئەوەندەش گۆترەکاریی نییە

ئاواز: دڵپاك خان! ڕێزم هەیە بۆت، هەرچەندە باسەکان ژێریی ئادەمیزاد ئەدوێنن‌و قایلیشی ئەکەن، بەڵام گیروگرفتی تەلاق ئێجگار گەورەیەو زیانی گەورەی بەدەمەوەیە، لەبەرئەوە دڵم ئاو ناخواتەوە، پیاو.. پیاوی نەگبەت، تەلاقی کردووە بە بنێشتە خۆشەی ژێر ددانی، لەسەر شتێکی پڕوپووچ: تەلاقم کەوتبێ فلان شت ئەکەم، تەلاقم کەوتبێ نایکەم، یان بە ژنەکەی ئەڵێت: فلان شت بکەیت تەلاقت کەوتبێ، فلان نەکەی تەلاقت کەوتبێ، ئاخر ئەمە چەندی بەچەند؟ ژنی بەسەزمان لە کەوتنی ئەو تەلاقانەدا چ تاوانێکی هەیە؟!

دڵپاك: منیش لەگەڵتام‌و ژن لە زۆربەی ئەو حاڵەتانەدا بێتاوانە، بەڵام بەو گۆترەیەش ئەو جۆرە تەلاقانە هەموویان بە کەوتوو دانانرێن.

سکالا: چۆن؟ بەقوربانت بم ئادەی قسە بکە!

دڵپاك: هەندێ عیبارات هەن‌و بوون وەك: (الطلاق يُلزِمُني)، یان (عليَّ بالطلاق) کە ئەوە بکەم یان ئەوە نەکەم، پیاو بەوانە تەلاقی ناکەوێت، (ئیبن قەییم) لە (اعلام الموقعين)دا ئەڵێت: (ئەمە ڕاڕەو (مذهب)ی ئەبوحەنیفەیە، کۆمەڵێ لە مامۆستایانی ڕاڕەوەکەی فەتوایان بەوە داوە، هەر بەوەش (قفال) لە کوتنەکەیدا فتوای داوە).

حیکمەت‌و نهێنی لەوەشدا ئەمەیە: گۆیندەی ئەم عیبارەتە (عليَّ بالطلاق)، یان (الطلاق يُلزِمُني)، پەیمان ئەدات لە دواڕۆژدا (ئەگەر فلان شتی کرد یان نەیکرد) ژنەکەی تەلاق بدات، کەچی حوکمی تەلاق وایە بڵێت: پێویستە لەسەرم تەلاقت بدەم، جا ئەگەر ئەمە هات بەدەمیا ئەوە تەلاقی نەداوە، لەمەشدا (خلاف) جیاوازیی نییە). دیسان (ئیبن حەزم) ئەڵێت: (تەلاق ئەگەر لەکاتی خستنیدا نەکەوێ، ئەستەمە (مەحاڵە) دوای ئەوە بکەوێ، لەکاتێکا لەکاتی خۆیا نەکەوتبێ).[1]

ئاواز: مەسەلەکە لەمە زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەوێ!

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، لە پەڕاوە فیقهییەکاندا ئەم مەسەلیە زۆر بە وردیی‌و دوورو درێژیی باسکراوە، بەڵام ئێمە کەمێکی لێوەرئەگرین وەك نموونە.

تەلاق سێ شێوەی هەیە: دەس بەجێیی، پێوەبەندکردن، بۆ دواڕۆژ زیادکراو (المنجزة، المعلقة، المضافة الى المستقبل). یەکەمیان بە بوونی مەرجەکانی خۆی ئەکەوێ (هەندێکیانمان باسکردن)، دووەمیان بەستراوە (المعلق) بە شتێکەوە، ئەو شتە نییەو ئەگونجێ دوایی بێت، وەك ئەوە بڵێت: کە ڕۆژ بووەوە تەلاقت کەوتبێ، بەڕۆژبوونەوە ئەکەوێ، ئەمە دەسبەجێیە بەڵام داڕشتنەکەی پێوە بەندکراوە، خۆ ئەگەر بەسترابێت بە شتێکی موستەحیلەوە ئەوە هەر بەهیچ دائەنرێت وەك ئەوە کە بڵێت: ئەگەر حوشتر چوو بە کونی دەرزیا تەلاقت کەوتبێ.

پێوەبەندکراو دوو جۆرە: یەکەمیان، مەبەست لێی سوێندخواردنە بۆ کردنی کارێك یان نەکردنی، یاخۆ بۆ تەئکیدی هەواڵێکە، ئەمەیان پێی ئەگوترێ (التعلق القسمي). وەك: ئەگەر لەماڵ بچیتە دەرەوە تەلاقت کەوتبێ، ئەیەوێ بەوە نەهێڵێ بچێتە دەرەوە، نەك مەبەستی تەلاقدان بێ. دووەمیان، مەبەستی کەوتنی تەلاقە، لەکاتی هاتنەدیی مەرجەکەدا پێی ئەگوترێ (التعلق الشرطي) وەك: ئەگەر لە مارەییە قەرزەکەت ئازادم بکەیت تەلاقت کەوتبێ، ئەم دوو جۆرە لای جەماوەری زانایان ئەکەون، کەچی (ئیبن حەزم) ڕای وایە ناکەون.

---

1 – (فان كان كل طلاق لا يقع حين اقاعه، فمن المحال أن يقع بعد ذلك في حين لم يوقعه فيه). تەماشای ئەم پەڕاوانە بکە: المرأة في القرآن والسنة، قضايا المرأة المعاصر، فقه السنة، ج٢.

هەروەها (ئیبن قەییمو ئیبن تەیمییە) لەسەری ئەڕۆنو ئەڵێن: "تەڵاقی پێوەندکراو کە مانای سوێندخواردن بگەیەنێ ناکەوێ، بەڵکو کەفارەتی ئەکەوێ کە خۆراکی دە هەژار یان بەرگیانە، یاخۆ ڕۆژووی سێ ڕۆژە، بەڵام تەڵاقی مەرجی بە هاتنەدیی مەرجەکە ئەکەوێ".

دیسان (ئیبن تەیمییە) ئەڵێت: "داڕشتنی پێوەبەندکراو وەك: الطلاق يُلزِمُني (وا ئەکەم)، بە ڕێککەوتنی ئەهلی عیلم، ئەمە سوێندخواردنە وە بە ڕێککەوتنی چەند تایفەیەك لە زانایانو گشتی (العامة)ش هەر سوێندخواردنە، یان ئەگەر وامکرد تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ، ئەمەیان ئەگەر مەبەستی سوێند بێ ناکەوێو فەقیهان لەسەر ئەم رایە ڕێککەوتوون، خۆ ئەگەر گوتی: هەر کە زیناتکرد تەڵاقت کەوتبێو مەبەستی کەوتنی تەڵاق بێت، ئەوە بە هاتنەدی کارە چەپەڵەکە تەڵاقەکە ئەکەوێ.

بەڵام ئەوەی کە مەبەست تیایا هەڵنان، قەدەغەکردن، باوەڕپێکردن، بەدرۆخستنەوە، بە ناچارکردن لەسەر شتێ کە حەز نەکا ژنەکەی بیکات، ئیتر ئایا بە داڕشتنی سوێندخواردن یان جەزا (الجزاء) بێ، ئەوە سوێندخواردنە، لای هەموو خەڵکی، چ عەرەب بن، یان عەرەب نەبن) (فقه السنة ج٢).

ئەمجا ئەبێ ئێستا بزانی کە سوێندخواردن بە تەڵاق قسەیەکی بێجێیە، ئەی لە بیرتان نییە کە بۆم گێڕانەوە پێغەمبەر ﷺ چەندێ لە سوێندخواردن بە تەڵاق تووڕەبوو (من حلف بالطلاق ومن إستحلف به فهو منافق). نەك هەر تەڵاقەکە ناکەوێ بەڵکو کەفارەتیشی ناوی.، (ئیبن قەییم) لە (اعلام الموقعين)دا ئەڵێت: (ئەوە ڕاڕەوی خەڵکی بووە لە کۆنو تازە (السلف والخلف)، بەڕاست زانراوەو گێڕراوەتەوە لە گەورەی مسوڵمانانەوە (عەلي بن أبي طالب) كرم الله وجهه.

هەندێ لە فەقیهان (مالكي)و (أهل الظاهر) ئەڵێن: "کەس لە یاران دیارنییە کە لەوەدا پێچەوانەو بەرامبەری عەلی وەستابێت، ئەمەش گفتی (أبي القاسم اليمني)ە لە (شرح أحكام عبدالحق)، پێش ئەمیش (أبو محمد بن حزم) ئەمەی گوتووە، لەلایەن (طاووس)یشەوە . کە دیارترین یاری ئیبن عەبباس بووەو زاناترین کەس بووە لە ڕووی تەڵاقەوە . بەڕاست زانراوە".

عەبدوڕڕەزاق لە (مصنف)ەکەیدا ئەڵێت: ئیبن جەریج هەواڵی داینێو گوتی: ئیبن تاووس لە باوکییەوە هەواڵی دامێ کە گوتوویەتی: "سوێندخواردن بە تەڵاق هیچ نییە". لەسەرئەوەش زیاتر لە چوار سەد زانا لەگەڵیا ڕێککەوتوون، کە ئەوانە فیقهی خۆیان لەسەر دەقی قورئانو سوننەت دامەزراندووە، بەبێئەوەی نزیکی قیاس بکەونەوە، کە دوای هەموویان (أبو محمد إبن حزم)ە.

سکاڵا: واتە هەندێك سوێندخواردن بە تەڵاق بە شتێکی پووچەڵ دائەنێنو بەشەرعیی داینانێن، بەوجۆرەش تەڵاقی پێناکەوێت، ئەوپەڕی کەفارەتی لەسەرئەبێت، بەخواشتێکی چاکە!

بێگومان ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئایینی پاکی ئیسلام ژیانی ژنو مێردو پەروەردەکردنی منداڵانو دروستکردنی خزمایەتیی و خەڵك بەیەکەوەبەستنی بەلاوە زۆر گەورەو گرنگو پیرۆزە، ئەیەوێ ئەوەندە بەتینو چەسپاو بێت کە شتی سادەو لاوەکی نەتوانێ بیجوڵێنێو پێی تێبکوتێ. ئەیەوێ ئەوەندە بەرزو پتەو بێت کە سوێندی بێ ئەقڵێك لە دوکاندا، یان لەماڵەوە، یاخۆ لەلایەکی تردا کە ئەیخوات، نەبێتە هۆی ڕووخاندنی ئەو پایە بەرزو بەنرخە، لەکاتێکدا ئافرەت لەماڵەوە خەریکی ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری ناوماڵە، یان بە منداڵەکانییەوە پەشۆکاوەو ئاگای لە هیچی تر نییە. چۆن بەو جۆرە تەڵاقی ئەکەوێ؟ بۆچ کەلوپەلێکی بێ نرخە بەبێ هۆ، یان بەبێکەڵکرین هۆ فڕێ بدرێت؟

دڵپاك: بەڵێ، قسەکانت ڕاستو جوانو چاك بۆی چوویت.

ئاواز: من بیرم لەم باسە کردۆتەوە. بەڵێ ئەزانم کە ئەوەی تۆ باستکرد بۆمان هەمووی راستە، بەڵام بەرهەمی چاك هەرگیز نادات بەدەستەوە، ئەگەر بمانەوێت بەرهەمێکی چاکمان دەست بکەوێت، پێویستە یاسا دەست بخاتە کارەکەوەو زۆر (عنف) بەکاربهێنێ.

دڵپاك: ئێستا خۆ شەوەو کاتی ئەوەمان نەماوە، سبەینێ دوانیوەڕۆیش ئەچینەوە. إن شاء الله، راستیو ناڕاستیی ئەوەشت بۆ دەردەکەوێ.

## تەلەفۆن کردنێك

ئامینەخان: عومەرگیان! گوێم لە زڕەی تەلەفۆنەکەیە، بڕۆ بزانە کێیە.

عومەر: دایەگیان! دەنگی ئافرەتێکەو نایناسم، داوای دڵپاك ئەکات.

ئامینەخان: ئادەی کچم، بڕۆ بزانە کێیە.

{دڵپاك پاش ماوەیەك گەڕایەوە}

دڵپاك: بابەگیان! سکاڵای هاوڕێمە، ئەوەی کە باسمکرد بۆت، پێی گوتم کە ئاوازو پرشنگو نەشمین و جوان کە مامۆستان.، رووناك کە مودەڕریسەیە وان لەلایو داوایان لێکردووە کە بێن بۆ ماڵی ئێمەو شەو گفتوگۆو یەکترناسینیان ئەویٚ. جا نازانم تۆ رات چییە؟

مامۆستا ساڵح: ئەی وەڵامی تۆ چی بوو؟

دڵپاك: پێمگوت تا باوکمو دایکم ئاگادار نەکەمو رایان وەرنەگرم، ناتوام وەڵامێکت بدەمەوە.

مامۆستا ساڵح: بەڕای تۆ بۆچی دێنو مەبەستیان چییە؟

دڵپاك: وەك بۆم باسکردی، سکاڵا روو لەخێرە، ئەوانی تر لە دەستەوپێڕی سەربەستەکانن(!!). دیارە بێمەبەست ایەن، مەگەر خوا خۆی بەدڵیان بزانیٚ.

ئامینەخان: خوا بەزەیی بێتەوە پێیاندا، خوا بیانخاتە سەر رێی راست.

مامۆستا ساڵح: بەهەرحاڵ، گرنگ نییە، ئەگەر ئەزانیت لەوانەن کە گویٚ لە ئادەمیزاد ئەگرن با بێن، ئەگەر خوا یارمەتیی داین ئەوا بەپێی توانا دوو قسەی خێریان بۆ ئەکەین. وەریان گرتن ئەوە زۆر چاکە، ئەگەر وەریشیان نەگرن خۆ ئێمە هەر ئەرکی سەرشانی خۆمانمان بەجێهێناوە، خۆ ئێمە بانگکەرین، نەك تێلا وەشێن (نحن دعاة ولسنا قضاة).

دڵپاك: بەڵام بابەگیان! داوات لیٚ ئەکەم کە تۆ وەڵامی پرسیارەکانیان بدەیتەوە نەك من، ئەی جگە لەوەی کە جگەرگۆشەتم، قوتابیشت نیم؟ زۆر زۆر حەز ئەکەم کە تۆ سەرپەرشتیی کۆڕەکە بکەیت.

مامۆستا ساڵح: بۆچ بەخۆتا راناپەڕمی کە بتوانی بەرامبەریان بوەستی؟ ئەی من لەسەر راستو رەوانیی رامنەهێناوی؟ ئەوپەڕی سەربەستیی راستەقینەم پێنەداویت؟

دڵپاك: بابەگیان! مەسەلەکە ئەوە نییە، بەڵام من ئەوەم پێخۆشە کە منیش لەو باسانەی ئەیانکەیت سوودمەند ببم، دیارە من بەتۆدا ناگەمەوە، داننان بەم راستییەدا خۆ تاوان نییە.

مامۆستا ساڵح: دەی فەرموو بڕۆ پێیان بڵیٚ با بێن، خێری پێوەیە إن شاء الله.

{دڵپاك ئەڕواتو هەواڵیان پێڕائەگەیەنیٚ کە بێن}

## پەروەردەکردن، نەك زۆرلێکردن

دڵپاك: بابەگیان! تکایە وەڵامی ئەم پرسیارو رایەی مامۆستا ئاواز بدەرەوە، ئەڵێت: "ئەگەر بمانەوێت بەرهەمێکی چاکمان دەست بکەوێت – لە قەدەغەکردنو کەمکردنەوەی تەڵاقداندا –، پێویستە یاسا دەست بخاتە کارەکەوەو (توندیی) بەکاربهێنیٚ.

مامۆستا ساڵح: منیش ئەوە ئەزانم کە یاسا توانای بەکارهێنانی ئاگرو ئاسنی هەیە، ئەزانم کە زۆرو دەسەڵاتی هەیە.، بەڵام ئەمانە هیچکامیان ناتوانن باری ژیانی خەڵك لە بنچینەدا بگۆڕن، نەك هەر لە تەڵاقدا، بگرە لە هیچ کارو بیروڕایەکدا، وا بزانم هەموو کەسێکی ژیر پەی بەم راستییە بردووە.

ئاواز: واتە تۆ ددان بە کاریگەریی یاسادا نانێیت، ئەی چیی تر ئەتوانیٚ ئەوە بکاو چۆنی ئەکات؟

ماموستا ساڵح: هیوادارم کە بە هەڵە لێم تێنەگەیت، من مەبەستم ئەوە نەبوو کە یاسا کاریگەریی نییە، نەخێر، یاسا کاریگەریی هەیە، بەڵام لەسەدا سەد نییە. پەروەردەکردنی چاکو پاك لە یاسا کاریگەرترە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو پەروەردەکردنە ئیسلامیی بێت.، مێژووو واقیع گەواهی لەسەرئەم راستییە ئەدەن، کچی بەڕێزم.

ئیسلام لەڕووی پەروەردەکردنەوە خاوەنی یاسای بێوێنەی تایبەتیی خۆیەتی، یاسایەك کە لەگەڵ سرووشتی ئادەمیزاددا زۆر چاك ئەگونجێت. مسوڵمان کاتێ خۆی بە مسوڵمان ئەزانێ کە پەیڕەویی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ بکاتو بەجێیان بهێنێ، لەهەمان کاتدا ئەوە ئەزانێ کە بە بەجێهێنانی ئەو فەرمانانە خۆی لە خوا نزیك ئەکاتەوە، خۆی خۆشەویست ئەکات. بە بەجێنەهێنانیشیان لە سنووری خوا دەرئەچێ، بەو دەرچوونەش لە سنووری خوا دوور ئەکەوێتەوە، بەوەش قینو قاری خوا بۆ خۆی ئەسازێنێ، لەبەر ئەوەش موسڵمانی پەروەردەکراو هەوڵی بەجێهێنانی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ ئەدات.

ئاشکرایشە کە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمان بە ستەمکردن بە هیچ کەس نادەن، چ جای ستەمکردن لەنێوان ژنو مێرددا کە نزیکترین کەسن بۆ یەکتر، کە هاوبەشی ژیانی یەکترن لە هەموو سەرێکەوە، بۆیە سەدان ئایەتو حەدیس رێنموونیی مسوڵمانان ئەکەن، وریایان ئەکەنەوە کە ستەمکار نەبن، ستەم لە یەکتر نەکەن، ئەوەشیان ستەم بکات، ئەوە ستەمی لەخۆی کردووە و تۆڵە لەلایەن خواوە چاوەڕوانی ئەکات. (تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة: ٢٢٩)، (تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ.. وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ) (الطلاق: ١)، (تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢٣٠)، (ولاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لَّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُواً) (البقرة: ٢٣١).

ئەمە هەر بۆ نموونە، نەك بۆ هەڵدان، دەی سەداو کاریگەریی ئەمانە لەدڵو دەروونی موسڵمانی پەروەردەکراودا، هەزار ئەوەندەی هێزو دەسەڵاتی یاسای زەمینی بەتینترە، مسوڵمان لە ستەمکاریی ئەگێڕێتەوەو فێری چاکیی هەڵسوکەوتی ئەکات. باوەڕبوون بەو فەرمانە خواییانە چنگ ئەچەقێنێتە دڵو دەروونو گیانو مێشكو ویژدانی مسوڵمان، بەجۆرێك هەرکە هەستی بە ستەمکردن کرد، یەکسەر ئەو فەرمانانە پاڵەپەستۆ ئەخەنە سەر ئەو چنگانەو ئازاری ئەدەن، تەنیا دەرمانێك کە ئەو ئازارەی بۆ لابەرێت، پەشیمان بوونەوەیەتی لە ستەمردنەکەی، ئەویش بە تەوبەکردنو دووپاتنەکردنەوەی ستەمەکە، ئایا یاسا بەمجۆرە ئەتوانێ خۆی بگەیەنێتە ناو ناخی ئادەمیزاد؟

ڕووناك: نەخێر ناتواتێ، بەڵام ئەو پەروەردەکردنەی کە تۆ باستکرد کارێکی یەك دوو ڕۆژیو سووكو ئاسان نییە.

ماموستا ساڵح: ئافەرین ئەوە زۆر ڕاستە! ئێمەش ئەوە ئەزانین، زۆر چاك ئەزانین کە هەروا بە هەوانتەو لە ماوەیەکی کەمدا ناکرێ. لەبەرئەوە ئەبێ خۆمان زۆر ماندوو بکەین، هەوڵێکی بەردەوامی بۆ بدەین، بێر لە وەڕس بوون نەکەینەوە، پەلەش نەکەین.

ئەزانین کە ڕێگەی پەروەردەکردن بە گوڵو گوڵاڵە نەڕازاوەتەوە، کورت نییە، بەڵام ئەبێ کۆڵنەدەین. ئەی نەتبیستووە پێشینان گوتوویانە: (لەتۆ حەرەکەت لەخوایش بەرەکەت)؟ هەر کە وا بووین خوای میهرەبان دەسبارمان ئەدات.

ئەوەیش ئەزانین کە ئەرکی پەروەردەکردن لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیدا وەك ئێستا قورسو گران نییە، چونکە ئەوکاتە بۆ ئەو مەبەستە هەموو هۆیەکی چاکی ڕاگەیاندن ئەخرێتە کار، لە: سینەما، رادیۆ، لە تەلەفزیۆنو گۆڤارو ڕۆژنامەو پەڕاو... هتد. چ لەماڵەوەدا، یان لە قوتابخانەداو چ لەناو کۆمەڵگەدا. جا بۆ ئەوەی بمانەوێت کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی بڕەخسێنین.، نابێ گوێ بە دوورییو سەختیو زەحمەتی ڕێگا بدەین، بەبێ

پەروەردەکردنی مسوڵمانانەش هەرگیز بارو ژیانێکی مرۆڤانە بەخۆمانەوە نابینین، کە نەشماندی، یاسا هەرگیز لە راستکردنەوەماندا دەوری تەواو نابینێ، کەمبوونەوەی تەڵاقدانیش مەحاڵ ئەبێت، چونکە سەدان فڕوفێڵ هەن کە یاسا خۆی تەنیا دەستی ناگاتە لایان.

## ئێمە خاوەنی ڕێگەین، بەلام ئێوە ناهێڵن

ڕووناك: مامۆستاگیان! با ڕاستەوڕوو ڕاشکاو (صريح) بین. ئافرەتێ لە ماڵەکەیا بۆ خۆی دانیشتووە، کپ و هێمن و بێدەنگ، یان خەریکە شیر بە ساواکەی ئەدات، یان خەریکی ئیشوکاری ماڵ و منداڵەکانیەتی، ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ ئەکات، دوور نییە کە خەریکی ئامادەکردنی ئەو شتە بێت کە خۆشیی ئەخاتە دڵی مێردەکەیەوە، (ئاگای لە حەمەی بێ زەواڵ نییە)، کەچی لەناکاودا ڕاستەوخۆ پیاوەکەی تەلاقی ئەدات، یان تەلاقنامەیەکی ئەدرێتە دەس بەناهەق! دەی ئەمە بۆ؟ ئەی نابێت بیر لە مافی ئەو ژنە، منداڵەکانی، هەوڵ و ڕەنجی لەو ماڵەدا، بکرێتەوە؟! پاشەڕۆژو چارەنووسیان بە چ ئەگات؟!

ئای مامۆستا گیان! ئافرەت زۆر کلۆڵ و بەدبەخت کراوە! ئۆف لەدەست پیاو.. ئۆف!! خۆ ئەگەر ئادەمیزاد لە هۆی ئەو تەلاقدانە بکۆڵێتەوە، ئەبینێ لەسەر شتێکی زۆر پووچەڵ و بێبایەخە.، لەوانەیە بەهۆی گومانێکەوە بووبێت کە تەنها بە دڵ و مێشکی ئەو پیاوەدا هاتبێ، یان ئەو ڕۆژە ئافرەتێکی بەرچاو کەوتبێ کە لە وەی خۆی جوانتر بووبێت، یان بەهۆی ئەوەوە بێت کە چەند ساڵێکە ژنەکەی ژنیەتی و لێی وەڕس بووە و حەز لە گۆڕینی بکات. دوورنییە داوای ئامادەکردنی پەیکێکی کردبێت، بەلام درەنگ بۆی ئامادەکردبێت.

دەی ئەوە کەی شایانی ئەوەیە کە ئافرەتی لەسەر تەلاق بدرێت و بەدبەخت بکرێت؟ ئایا نابێت ڕێگایەك بدۆزرێتەوە بۆ لابردنی ئەو چەکەی دەستی پیاو، کە لە ساتێکی ستەمکارییدا بەکاری نەهێنێ؟ بۆچ ڕێگای بەکارهێنانی ئەو چەکەی لێنەگیرێت؟ بۆچ هێلانەی شادیی و بەختیاریی ئافرەت و منداڵەکانی بشێوێنرێت؟ بۆچ چارەنووسی ئەو خێزانە بدرێت بەدەم گەردەلوولی ئەو چەکەوە؟!!

مامۆستا ساڵح: سەرنجەکانت . ئەگەرچی تێکەڵ و پێکەڵن . تا ڕاددەیەك وردو بەجێن، ڕاستییشیان تێدایە، چونکە بەشی زۆریان ڕوویان داوەو ڕوویش ئەدەن. بەلام بۆچ بەرپرسیارێتی بدرێت بە کۆڵی ئیسلامدا؟ ها؟ ئایا ئیسلام فەرمانی بەوەکردووە؟ حەزی پێ ئەکات یان دژی ئەوەستێ؟ هانی خەڵکی لەسەر ئەدات؟، لە چ ئایەت و حەدیسێکدا ئەوانەت بەرچاو کەوتووە؟ بەواتایەکی تر تاوانی ئیسلام لەوەدا کامەیەو چییە؟ کچم! ئەگەر لەخوا ناترسی دەی لە ویژدان و زەمیر بترسە کە خۆتان باسی ئەکەن!.

جگە لەو کەسانەی کە لە ڕێبازو بەرنامەی خوا دوورن، کێ ئەڵێ ئافرەت ئادەمیزاد نییە؟ ئادەی یاسایەکی ئیسلامیم بۆ بێنە کە مافی ئافرەت پێشێل بکات! کێ ئەڵێ ئیسلام چارەنووسی ئافرەت و منداڵەکانی فەرامۆش ئەکا؟ بەڵگەی کامەیە؟ ئەبێ بۆچ ئەو جۆرە تەلاقدەرانە بەڕۆڵەی ئیسلام و پەیڕەوییکەرانی بەرنامەی خوا بژمێردرێن؟!

ڕووناك خان! ئایا تۆ ئەتوانی بیسەلمێنی کە ئیسلام ددان بە گوماندا ئەنێ؟ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (دع ما يريبك إلى ما لايريبك).[1] ئەمە گومان دروستکردنە، یان گومان ڕەواندنەوەیە؟ خوا ئەفەرمووێ: (إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ) (الحجرات: ١٢). کەچی تۆ ئەتەوێت مۆری گومانداریی بنێیت بە ناوچاوانی ئیسلامدا!

1 – حديث حسن، رواه الترمذي.

کچی بەڕێزم! ئەگەر لە ئیسلام تێبگەیت، ئەوسا زۆر باش بۆت دەرئەکەوێ کە جوانیی راستەقینە بەلای ئیسلامەوە، لە مرۆڤایەتیی مرۆڤدایە، پێش ئەوەی لە لەش و سەرو شکڵدابێت. موسڵمانی خاوەن باوەڕ، بەجوانیی لەش و رووەت دەسخەڕۆ نابێت و هەڵناخەڵەتێ، چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەری ﷺ دێتەوە بیر، کە کابرایەك هاتە خزمەتی، سێ جار داوای لێکرد کە فلان ئافرەت جوانەو دڵی گرتوویەتی و ئەیەوێ مارەی بکات، بەڵام نەزۆکە، بەتەمای ئەوەبوو کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەر بدات، کەچی پێشەوا فەرمووی: (تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم) المسلم والبخاري وغيرهما.

رووناك: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ نەڵێت، هەموو عەقڵێکی ساغ ئەزانێت کە جوانیی خۆی تەنها هەموو شتێك نییەو نابێ بە هەموو شتێ دابنرێت.

مامۆستا ساڵح: ئەوە تۆ ئەوە بۆ خۆت ئەڵێیت، بەڵام ئێمەی مسوڵمان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ، چڵەپۆپەیە بەلامانەوە، دوای ژیریی رووت ناکەوین، چونکە ژیرییش قابیلی هەڵەکردنە، لەکاتێکا کە بڕیاری خواو پێغەمبەر ﷺ لەڕادەی ژیریی بەرزترن بەلامانەوە.

هەروەها، ژن و مێرد ئەگەر لەسەر یاساو رێبازی پاکی ئیسلام بووبن بە هاوسەر، لەسەر ئەو یاساو رێبازە بژین، زۆر زۆر کەم رووئدات کە بێزاریی و وەڕەسیی روویان تێبکا. خۆ ئەگەر رووشیان تێبکا ئەوا یاسای (تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)یان لەبەر دەستایە. لەبەرئەوە هەوەس و ئارەزووی گۆڕین، لای موسڵمانی راستەقینە نییەو نابێت، کارێکی ئیسلامیی نییە، بەڵکو هی نامسوڵمانە، پیشەی زوڕناقییەکانە. گۆڕین لە ئیسلامدا بۆ ئەو مەبەستە نییە کە جەنابت بۆی ئەچیت، بەڵکو ئەگەر ببێ لەبەر هۆیەکی پاکی رەوایە، نەك بۆ لەزەتپەرستی، چونکە ئیسلام دژی لەزەتپەرستییە. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (تزوجوا ولا تطلقوا، فإن الله لايحب الذواقين ولا الذواقات) کچی شیرین! رەنگە نەزانیت کە ئیسلام ددان بە پەیك و مەیکدا نانێ، چجای زوو، یان درەنگهێنانی. لەوەش زیاتر ئەو کارە بە کردەوەی شەیتان ناودەبات: (... إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ ...) (المائدة : ٩٠ ). ئیتر ئەگەر پیاوێك ژنەکەی لەسەر پەیکێك بشکوژێت، بۆچ ئەو تاوانە بدرێتە پاڵ ئیسلام؟! ئەی بۆچ تاوانەکە نادەیت بەسەر ئەو کۆمەڵ و کۆمەڵگەیەدا کە بەدکاریی و ستەمکاریی و تاوانباریی بە هەموو شێوەیەك، بەناوی پێشکەوتن و سەربەستیی و ئازادیی و سەربەخۆیی و یەکسانیی و شارستانییەتەوە بڵاوئەکاتەوە؟! ئەی بۆچ ناوی ئەو پەروەردەکردنە گەنیوە نابەیت کە لەو جۆرە کۆمەڵگە بۆگەنانەدا باوەو هەندێکیش بە کوێرانە دوای ئەکەون؟! تەنانەت شانازیی پێوە ئەکەن، پڕوپاگەندەی بۆ ئەکەن، ئەیانەوێ بڵاوی بکەنەوە!!.

مامۆستا رووناك! تۆ بەیەك چاو تەماشای گێروگرفتەکە ئەکەیت، بۆیە تەنها بیر لە یەك لایەنی ئەکەیتەوەو هەموو تاوانەکە ئەدەیت بە کۆڵی پیاودا. ئەی ئافرەت فریشتەیەکی بێتاوانە؟ ئایا لەو کێشەیەدا ئەو هیچ دەورو دەستێکی نییە؟ ئەی بۆچ باسی داواو بەهانووی هەمەڕەنگی نابەجێی ئافرەتت نەکرد؟ بۆچ ئاوڕێ بەلای مۆدێل گۆڕین و شوێنکەوتنی مۆدێل لەلایەن ئافرەتەوە نادەیتەوە؟ بۆچ باسی خێرا هەڵچوونی بێجێی ئافرەت ناکەیت؟ بۆچ باسی لووت بەرزیی، شانازیی کردنی ئافرەت بە (مێیەتی)یەکەیەوە ناکەیت؟ وائەزانێ هەر مێیەتییەکەی ئەو شتەو ئیتر نێرێتیی پیاو هیچ نرخێکی نییە! دیارە ئەمانە هەموویان ئەبنە هۆی ناڕەحەتکردنی پیاو و گەلێ جار ناچاری ئەکەن کە دەنگی ناڕەزایی هەڵبڕێت و چەکی تەڵاقیش . وەك تۆ ناوت لێناوە . بەکاربهێنێ.

ئەگەر تۆ ئێستا بیر لە رێگەیەك ئەکەیتەوە بۆ بەربەستکردنی بەکارهێنانی ئەو چەکە، تا لە رێگەی ستەمکارییەوە بەکارنەهێنرێت، خۆ ئێمەی مسوڵمان هەر زوو بیرمان کردۆتەوە لێی. هەر زۆر زوویش ئەنجامی خراپ و نالەباریمان لە کاتی بەکارهێنانیدا بە ناڕەوا زانیووە، ئێمە رێگەکەیمان هەیەو ئاشکراو روون و دیاریشە،

هەوڵمان داوە بۆیو هەوڵیشی بۆ ئەدەین، بەڵام ئێوە ناهێڵن، دژمان ئەوەستن، کۆسپ ئەخەنە بەرمان، دوژمنایەتیمان لەگەڵا ئەکەن.

رووناك: ئێمە! نەء، شتی وا نییە، ئێمە چیمان کردووە؟!

مامۆستا ساڵح: با پێت بڵێم: ئێمە موسڵمانین، ئیسلام پرۆگرامی ژیانمانە، رێگەی ژیانمانە، جوانترین شێوازی پەروەردەکردنی هەیە، تۆوی پاکی خووڕەوشتی جوان لەناخی مسوڵماندا ئەچێنێ، تەنانەت یەکێك لە کارە گەورەکانی پێغەمبەرمان ﷺ ئەو رەوشت جوانکردنەیە: (إنّما بُعِثتُ لأُتمّمَ مكارم الآخلاق). جا بەهۆی ئەو پەروەردەکردنەوە، لەسەربناغەیەکی ئیمانیی، ئادەمیزاد وای لێدێت کە هەموو شتێك لەکاتی خۆیداو بە لێزانینەوە بەکاربێنێ، لەوانەش بەکارهێنانی تەلاق.

بەڵام ئێوە لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکدا، دژی ئایینەکەمان درێغیتان نەکردووەو نایکەن، چ بە خۆتان بزانن یان نەزانن.

رووناك: مامۆستا! هێرشێکی گەورەو گرانت کردە سەرم.

مامۆستا ساڵح: رۆڵەی شیرینم! دەرخستنو دەربڕینی راستی هێرشکردنە سەر نییە، ئێمە ئایینەکەمان فێری کردووینو تێیگەیاندووین کە تەلاق گەورەو گرانە، بەکارهێنانیشی گەورەو سامناکە، نەخوازەڵلا ئەگەر بە خراپییو ستەمکاریی بەکاربهێنرێت. ئەوەش ئەزانین کە یەك رێگە هەیە بۆ بەربەستکردنی بەکارهێنانی لە رێگەی ستەمکردنەوە، ئەو رێگەیەش پەروەردەیە، پەروەردەکردن بە بەرزکردنەوەی باوەڕبوون بەخوا، بە پاداشتو سزای رۆژی دوایی، بە بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییو دەروونییو گیانیی گەلو کۆمەڵگە بەتێکڕا. بە خاوێنکردنەوەی هەستو بیرو هۆش، هەتا بەوە خێرو چاکە سەرکەوتووبن، خۆشەویستی ببێتە بناوانی جۆگەی ژیانی ژنو مێرد، هەتا پەیوەندی نێوانیان ئەوەندە بە پیرۆز بزانرێت کە تێکدانی بە گەورە تاوانێك بزانرێت، بە ستەمکارییو لەخوا یاخیبوون دابنرێت، بەڵام ئێوە ناهێڵن، هەتا وەهاشبن بەختیارییو کامەرانیی ئافرەت رەنگە بە خەویش نەبینن.

پرشنگ: ئەبوایە ئیسلام رێگەی تەلاقدانی نەدابایە لە سەرەتاوە، چونکە ئەگەر رێگەی نەدابایە ئیتر جیابوونەوە نەئەبوو، بەوەش پیاو لەو چەکە چەك ئەکراو نەیئەتوانی بەکاری بێنێ.

دڵپاك: ئەم باسەمان بە درێژایی شیکردۆتەوە با نەچینەوە سەری.

مامۆستا ساڵح: قەید ناکات کچم، حەزئەکەم بە کورتەیك وەڵامی بدەمەوەو تێی بگەیەنم کە ئەو قسەیەی راست نییە، بەو پێیەی ئەو ئەیڵێت ئەبێ تەلاقدان قەدەغە بکرێت.، جا با بیدەینە بەر تیشکی ژیریی تا بزانین ئایا قەدەغەکردنی تەلاقدان چاکە یان خراپە.

## قەدەغەکردنی تەلاق زیانی لە کەڵکی زیاترە

رووناك: قسەکەی پرشنگ زۆر راستەو ژیرییش پشتگیریی ئەکات!

نەشمین: ئەگەر ئیسلام رێگەی پێنەدابایە، پیاو نەیئەتوانی ستەم بکات.

جوان: قەدەغەکردنی چاکترین چارەسەرە بۆ ئافرەت.

مامۆستا ساڵح: ئایا ئێوە دڵنیان کە بە قەدەغکردنی تەلاق گیروگرفتی ژنو مێرد ببڕێتەوە؟

رووناك: بێگومان.. بێگومان. ئەی ئەوسا ئیتر جیابوونەوە ئەبێت؟

مامۆستا ساڵح: ئەگەر وابێت نەء، بەڵام دەوڵەتە کاسۆلیکییەکان کە ڕێگەی تەڵاق نادەن، لەوانەیە لە ئێمە زیاتر هەست بە زیانو مەترسیی ئەو بابەتە بکەن، چونکە دیویانەو چەشتوویانە. جا منیش نموونەیەکتان بۆ ئەهێنمەوە، ئەمەویٚ خۆتان حوکمی لەسەر بدەن.

یەکێك لە ئێوە شوو ئەکات بە پیاوێك، مەبەستم ئەوەیە لەسەر بناغەی خۆشەویستیو دڵدارییو پەیمانبەستن، ئەوپەڕی خۆشەویستیو دڵسۆزیی ڕاستەقینەی خۆی بۆ مێردەکەی ئەنوێنیٚ، زۆر ڕێزی ئەگریٚ، نابەدڵیی ناکات، ئایا ئەم ئافرەتە خراپی کردووە؟

جوان: نەخێر خراپی نەکردووەو زۆر چاکی کردووە.

مامۆستا ساڵح: بەڵام مێردەکەی هەر ماوەیەك بە ئاسایی لەگەڵیا ئەژی، دوای ئەوە ئەکەوێتە بڕوبیانووی جۆربەجۆر، قسەی پێئەڵێت، جنێوی پیٚ ئەدات، لێی ئەدات، دەریدەکات، لەگەڵیا ناخەوێت، رووی خۆشی ناکات بەلاوە، مەسرەف بۆ ناکا، دەستدرێژیی ئەکات بەسەریا، ناپاکیی لەگەڵدا ئەکات، زۆربەی شەوان لە نادییو مەیخانەو (......)کاندا ئەمێنێتەوەو نایەتەوەماڵەوە. ئەم گوفتارو ڕەفتارە درێژە ئەکێشێتو بەهیچ شتێك دەستی لێهەڵناگرێت. دەی لەم حاڵەتەدا . هەرکام لە ئێوە بێت . چی ئەکات؟

جوان: چاوی دەرئەهێنم، گیانی لە قوڕقوڕاگەیەوە ئەهێنمە دەرەوە، کوڕە مشتیٚ ژەهر ئەکەمە خواردنێکەوە و ئەیدەمیٚ.

نەشمین: بەخوا خۆ پیاوی وا دوورنییە ببێت، خوا بمانپارێزیٚ لێی!

ئاواز: ژنەکەش شێوازی خۆی ئەگۆڕێتو توندوتیژی بەکارئەهێنیٚ.

مامۆستا ساڵح: گیروگرفتەکە بەچاوو گیان دەرهێنان، یان شێواز گۆڕین چارەسەر ناکرێت، لەوانەیە کڵپەی گڕەکەی زیاتر بەرزبێتەوە. ئایا ژیان لەو ماڵەدا ئیتر لە ژیان ئەکات؟ گریمان یاسا پیاوەکەی ناچارکرد کە هەر ئەبیٚ لەگەڵ ئەو ژنەدا ژیان بەرێتە سەر، ئەوکاتە ئەو ماڵەی کە ژنو مێردەکە تیایا حەز لە چارەی یەکتر نەکەن، ئەبیٚ چۆن ماڵێك بێت؟، بەتایبەتی ئەگەر بزانن ڕێگەی جیابوونەوەیان هەرگیز بۆ نییە! ئایا ئەوە خۆی لەخۆیا تاوان دروست ناکات؟، پیاو بۆ خۆی ئەگەڕێت بەدوای تێرکردنی ئارەزوویدا، ژنەکەشی بۆ هەمان مەبەست ماشقەیەك ئەدۆزێتەوە، منداڵە بەسەزمانەکانیشیان گیرۆدە ئەبن، گیرئەخۆن، لەسەر دایکیان بکەنەوە یان باوکیان؟! ئەو منداڵانەی کە لەپەنای دایكو باوکێکی وەهادا پێئەگەن، ئەبیٚ چۆن دەربچن؟! دڵو دەروونیان چەند گرێی ئاڵۆزی تێدا ئەڕوێت؟.

کچە بەڕێزەکانم! بڕۆن سەرچاوەکانی زانیاریی دەروون (علم النفس) سەیر بکەن لەم ڕووەوە، ئەوسا سەرتان سووڕئەمێنیٚ، بۆشتان دەرئەکەویٚ کە بەشی زۆری تاوانبارو خراپکارو دەروون ئاڵۆزەکانی ناو کۆمەڵگە لەناو ئەو جۆرە خێزانانەدا درووست بوون کە دایكو باوکیان ژیانیان ناکۆکیو هەراو دەمەدەمیٚو ئاژاوە بووە.

نەشمین: کەواتە . مامۆستا . تۆ باوەڕت بە بەکارهێنانی تەڵاق هەیە!

مامۆستا ساڵح: بەڵیٚ.. بەڵیٚ کچم. چونکە خوای پەروەردگارو پێغەمبەرمان ﷺ، ڕێگەی بەکارهێنانی تەڵاقیان داوە.، بەڵام نەك بەشێوەی ستەمکاریی، بەڵکو لە شێوەی (إحسان)دا، هاوسەرییو جیابوونەوە، هەردووکیان لە ئیسلامدا ئەبیٚ بەچاکی بکرێنو دەستیان بۆ ببرێت. وەك قورئان ئەفەرمووێ: (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) (البقرة: ٢٢٩).

لە هەندیٚ وڵاتدا کە ڕێگەی تەڵاق نەئەدرا، بە تاقیکردنەوە دەرکەوت کە زیانی لە چاکەی گەلیٚ زیاترە. بەجۆرێك کە چەندەها کارەساتی سەیر سەیری ناهەمواری دڵتەزێن پەیدا ئەبوو لەناو ئەو وڵاتانەدا، لەوانە: نەخۆشیی دەروونیی منداڵانی ئەو خێزانانە کە دایكو باوك تیایانا ناکۆکن، ئەو منداڵانە هەر بە بچووکی دووچاری دووڕوویيو درۆو فێڵبازییو دڵڕەقیی.....هتد دەبن.

هەروەها داوێن پیسیی –چ بۆ پیاو چ بۆ ئافرەت –، کوشتن و خۆکوشتن، راکردن و سەرهەڵگرتن بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لە هاوسەرو بەجێهێشتنی، چەندان فرۆفێڵی تر کە باسکردنیان درێژە ئەکێشێ بینراوە و بیستراوە، ئێوەش رەنگە گەلێکتان لەم رووەوە بیستبێت، ئەگەر نەشتان دیبێت.

رووناک: ئەوە گومانی تێدا نییە، شتێکی سرووشتییەو هەر ئەشبێت.

مامۆستا ساڵح: هەر ئەوەش پاڵی بە زانایەکی خۆرئاواییەوە ناوە کە بڵێت: "تەڵاقدان شەرێکە کە پێویستە، چونکە چاککردنی کۆمەڵگەی پێوە بەندە، دەرمانێکەو شەرێکی گەورەتری پێ لەناوئەبرێت".[1]

هەروەها رۆژهەڵاتناسی فەرەنسیی (ئیتین دینیە) لەم رووەوە ئەڵێت: "کەنیسە لە مەسەلەی تەڵاقدا هەروەک لە کارو مەسەلەی یەکتایی بە نەزانیی و خراپیی جووڵایەوە، تەماشاکە: چی لەوە خراپترە کە دوو گەنج، ناتوانن لەگەڵ یەکتردا ئارام بگرن، هاوسەرییان سەرکەوتوو نییە، ئەو بەختیارییەی کە لە پەنایدا. واتە پەنای هاوسەریتی. چاوەڕوانیان ئەکرد، چنگیان نەیگرت، چی لەوە خراپترە کە حوکمیان بەسەرا بدرێت بەوەی هەتا ماون پێکەوە بمێننەوەو ئەو تەمەنەیان کە ماوە بە تاڵاوچەشتن و دژایەتی یەکترو بەدبەختی بەرنەسەر؟ هەروەها ئەگەر یەکێکیان نەزۆک بێت، یان هاوشانی هاوسەرەکەی نەبێت، ئایا رەوایە ئەوی تریش بێبەش بکرێت لەوە کە بە هاوسەرێکی تر خۆی لەوە بپارێزێ و خێزانێک سەرلەنوێ پێکبهێنێ".

ئەم دوو وتەیەم بە نموونە، نەک بۆ هەڵدان، بۆ هێنانەوە، هەتا بزانن کە واقیعی ژیان، ژیریی، مێژوو، هەموویان گەواهی ئەدەن لەسەر زیانی قەدەغەکردنی تەڵاق. خۆ خوا لە هەموو کەس زاناترە، پێغەمبەری ئیسلامیش لەسەر رۆشنایی قورئان هەنگاوی هەڵگرتووە، جا شتێک کە خواو پێغەمبەر ﷺ رێگەیان پێدابێت و مێژووو واقیعی ژیان گەواهی بدەن لەسەر راستیی ئەو شتەو ژیریی و ژیربێژیی پەسەندی بکەن، من چۆن باوەڕی پێنەکەم!

رووناک: نازانم بڵێم چی! بەهەرحاڵ سوپاست ئەکەم.

## تەڵاقی ئیسلامیی و نائیسلامیی جیاوازییان زۆرە

نەشمین: مامۆستا! جەنابت ئەتەوێت بڵێیت، تەڵاقدان لە ئیسلامدا چاکەو ستەمکردنی تێدانییە. بەڕاستی بەکارهێنانی ئەو چەکە لە هەر ئایین و یاسایەکدا ببێ، بۆ ئافرەت هەر تەڵاقدان و دڵتەزێنە!

مامۆستا ساڵح: نەخێر کچم، بەوجۆرە نییە کە تۆ ئەیزانی، تۆ بە پێچەوانەی ژیریی و بەرژەوەندی ئافرەتەوە بیرئەکەیتەوە. گەلێجار ئەو تەڵاقە رزگارکەرو قوتارکەری ئافرەتە، سەربەستیی و ئازادیی و ژیانی خۆش و شیرینی بۆ ئافرەت بەدەمەوەیە، بگرە زیندەگی ئافرەتی تێدایە. توخوا لەو نموونەیەی کە هێنامەوە هی ئافرەتە چاکەکەو مێردە سەرسەختەکەی، تەڵاق چاکترین دەرمان نییە بۆی؟ لە تەڵاق بەولاوە چیتر ئەتوانێ لە دەستی ئەو مێردە نالەبارە رزگاری بکات و ژیانی پێ ببەخشێتەوە؟

رووناک: راستە، ئەو تەڵاقە شادیی و بەختیاریی ئافرەتی تێدایە.

مامۆستا ساڵح: لەلایەکی ترەوە، تەڵاقدان و تەڵاق لێسەندن لە هەموو ئایین و رێبازو یاسا زەمینییەکاندا یەک شێوە نین.، بەڵکو جیاوازیی زۆریان تێدایە.

1 – سلسلة دراسات الإسلامية د. احمدة محمد الحوفي ل٢٢٠.

ئەبێ ئەوە بزانین، تەڵاقێك كە پاش هەوڵو تێكۆشانێكی دوورو درێژ، پاش پەنابردنەبەر چەند هۆو رێگەیەكی جۆربەجۆر بۆ ئاشتكردنەوەو ناكۆكی نەهێشتنی بەینی ژنو مێرد، دەستی بۆ ئەبرێت، جیاوازە لەو تەڵاقەی كە لەسەرشتێكی بێ واتای پڕوپووچو لاوەكی رووئەدا.

كچە شیرینەكانم ! ئەو پلانو شاڵاوو هێرشانەی كە لەلایەن رۆڵە رۆشنبیرەكانمانەوە(!!) ئەكرێنە سەر ئیسلام لە زۆر رووەوە، بەزۆری لە خۆرئاواوە نێرراون، سەرچاوەكەیان ئەوێیە، هینەكانی ئێمە تەنها وتنەوەیان لەسەرە، وەكو تووتی، تەنها قسە ئەڵێنەوەو ئەیڵێنەوە. جا لە راستیدا خۆرئاواییەكان زۆربەیان بەهانووی بەجێیان سەبارەت بە تەڵاق هەیە، بەڵام ئەوەش تەنها بە نیسبەت ئایینی دەستكاری كراوو یاسای خۆیانەوە، نەك بە نیسبەت ئیسلامەوە، تەڵاق لەناوئەواندا كارەساتی سامناكی زۆری پێوەبوو، تەنانەت هۆیەكی گرنگی تێكچوونو نائاسایشی كۆمەڵگەكەیان بووە، بۆیە هەر لەو رووەشەوە تەماشای ئەكەن.

خۆ ئەگەر یاساو شەریعەتی ئیسلامیان بە چاوی بێلایەنی . نەك دوژمنایەتی . سەیر بكردایە ئەو هەڵوێستە پڕ لە شاڵاوو هێرشانەیان واز لێئەهێنا، بگرە ئەبوونە دۆستو پاڵپشتیكەری رێبازی ئیسلام، ئەو رێبازەی كە تێئەكۆشێ بۆ هێنانەدی بەختیاریی ژنو مێرد.

بەڵێ، تا ئێستاش پیاوی خۆرئاوا بەهۆی سووكترین شتەوە ژن تەڵاق ئەدا، وەك ئەو هۆیانەی كە لە سەرەتای باسەكەدا مامۆستا رووناك هەندێكی هەڵدا لێیان، لەبەر ئەوە ژیانی هاوسەریی هەندێ جار لە چەند سەعاتێك زیاتر لەناویانا ناخایەنێ. ئەم حەقیقەتە گەلێ لە توێژەرەوەكان (الباحثون) چ ژنو چ پیاو باسیانكردووە، یەكێ لەوانە، ئافرەتێكی توێژەرەوەیە كە لە ساڵی (١٣٨٢)ی كۆچیدا سەری لە قاهیرەداو ئەنجامی چاوپێكەوتنو سەرنجی خۆی لە میسرو وڵاتە خۆرئاواییەكان نووسی، لەوەی كە ئەو توێژەرە سەبارەت بە ئافرەتی ئەمریكاو خۆرئاوا نووسیویەتی: "ئافرەت لەوێ . خۆرئاوا . لە چەند خولەكێكدا شوو ئەكاو پاش چەند سەعاتێك تەڵاق ئەدرێت، ئەمەش لەوە زیاتری تێناچێت بۆی كە قرشیك بدۆڕێنێو ببێتە بووكی شەوێك، یاخۆ چەند شەوێك، ئیتر هەر بەم بەزمە ئافرەت لە شووكردنو تەڵاقدراندایە جار بۆ جار!".

ئەو كەسەی كە بە بەردەوامیی هەندێ رۆژنامەو گۆڤار ئەخوێنێتەوە شتی ئێجگار سەیر لەو هۆیانەی كە ئەیانسازێنن بۆ تەڵاقدانو تەڵاق سەندنەوە، ئەبینێ. بەڵام ئێوە (بەداخەوە) ئاگاتان لەهیچ نییە.

دڵپاك: هەندێكم لەو هۆو بەهانانە . بەنموونە . بۆ مامۆستا ئاوازو مامۆستا سكاڵا، پێش چەند رۆژێك باسكرد.

جوان: ئەی بۆچ خەڵك باسی خۆرئاوا بەمجۆرە ناكات؟

مامۆستا ساڵح: چونكە یان نایزانێت، یاخۆ ئەیزانێتو بە شتێكی چاكی ئەزانێ، یان شیرەخۆرەی خۆرئاوایەو نایەوێ خەڵك بە كەموكوڕیو نەنگیی خۆرئاوای رووگە (قیبلە)ی بزانێت!!. ئەی تۆ نازانیت كە ئادەمیزاد هەر كەسێك یان هەر شتێكی خۆشویست، بەزۆریی چاو لە كەموكوڕییو نەنگیی ئەو شتە، یان ئەو كەسە ئەپۆشێت، یان هەر نایبینێ (حُبّك للشيئ يُعميك). ئەوەتا ئێوە بەهۆی ئەوەوە كە رۆژئاوا، یان هەندێ شوێنی ترتان خۆش ئەوێت، هیچ شتێكی خراپی نەك هەر لێنابینن، بەڵكو نەشتان بیستووە.

پرشنگ: هەرچۆنێك هەبێت گرنگ نییە، بەڵام ئەی بۆچ رادەی تەڵاقدانو تەڵاق لێسەندن لەناو مسوڵماناندا لە هەموو میللەتانو تەنانەت لە ئایینو رێبازەكانی تر بەرزترە؟ ئایا ئەمە هۆیەكەی ئیسلام نییە؟

# چاوخشاندنێك بە تەلاقدان لە هەندێ دەوڵەتدا

مامۆستا ساڵح: ئای کچی بەڕێزم! تۆ وێنەی حەقیقەتەکان وەك لەناو ئاوا ببینی وایە، بە هەڵگەڕاوەیی دێنە بەرچاوت.چەند سەرم سووڕئەمێنێ کە رۆشنبیرێکی وەك تۆ، کە پەروەردەی بەرەیەکی تەواوی لە ئەستۆدایە، بە وتەی ئەمو ئەو، بە داواو پڕوپاگەندەی هەندێ شیرەخۆرەکانی ناحەزانی ئیسلام باوەڕ ئەکەی! ئەوەی ئەیبیستی بەڕاستییەکی بڕاوە لای خۆت، بەبێ تەتەڵەکردن، گلی ئەدەیتەوە، تۆ چۆن ئەبێت ئەوەندە سادەو بێئاگا بیت؟.

لەوەش زیاتر پرسیارەکانت هەموویان، شێوەی گفتوگۆکردنت، بۆچوونەکانت، بەجارێکا بێئاگاییت ئەنوێنن، ئەمەیشت بەداخەوە . نەك بەشانازییەوە . پێئەڵێم، ئەبوایە زۆر شارەزا بوویتایە، چونکە بەناو بەچکە موسڵمانی، هەر هیچ نەبێت لە وڵاتێکا ئەژیت کە بە وڵاتی مسوڵمانان ناسراوە، مامۆستایەکیش کە خۆی بە مامۆستا بزانێ، ئەبێ هەندێ شت هەر بزانێ.

سکاڵا: مامۆستا! بەڕاستی من لەم رووەوە هیچ نازانم، حەزیش ئەکەم بزانم.

دڵپاك: بابە گیان! نامیلکەکەی (إبراهيم النعمة) بەناوی (الطلاق بين الفقه والقانون)، باسی رادەی تەلاق لە هەندێ وڵاتدا، بەکورتی ئەکا.

مامۆستا ساڵح: پەڕاو لەم بارەیەوە زۆرە، ئادەی لەو کتێبخانەیەدا پەڕاوێك بەناوی (ماذا عن المرأة)، دانانی دوکتۆر (نورالدين العتر) هەیە، بیهێنە بۆم، جا با بزانم رادەی تەلاق لەکوێدا بەرزە.

لە ئەمریکادا: ئەم وڵاتە هەرچەندە وڵاتێکی زۆر پێشکەوتووە، وڵاتێکی (نصراني)یەو ئایینەکەی رێبەستی تەلاق ئەکات، کەچی یاساکەی لە ناچارییدا رێگەی تەلاقی داوەو بەستوویەتی بە ئاگادارکردنو حوکمی دادوەرەوە.، لەگەڵ ئەوەشدا نیسبەتی تەلاق لە ساڵی (١٩٤٨)دا گەیشتە لەسەدا چل (٤٠٪)، ئێستاش گەیشتۆتە زیاتر لەسەدا شەست (٦٠٪)، کەچی هیچ کەستان ناوی ئەمریکا نابات!

ئەڵمانیای خۆرئاوا: لەو وڵاتەشدا، لەوانە کە تەمەنیان لە بیستو پێنج ساڵ کەمترە رێژەی تەلاق گەیشتۆتە (٣٥٪)، لە ساڵی (١٩٤٦)دا ئەڵمانیا یاسایەکی سەبارەت بە تەلاق دەرکرد، تا ئێستاش ئەو یاسایە پەیڕەوی ئەکرێ. بەپێی ئەو یاسایە لەم حاڵەتانەدا رێگەی تەلاق دراوە:

پەیڕەو نەکردنی مەرجەکانی هاوسەریی، نالەباری ژیانی هاوسەریی بەجۆرێکی سامناك، شێتی، نەخۆشییەکی درم، بەجێهێشتنی هێلانەی هاوسەریی بۆ ماوەی سێ ساڵ لەلایەن ژن یان مێردەوە.

پاریس: لە پاریسدا (لانەی سەربەستییو ئازادیخوازان)!! نیسبەتی تەلاق گەیشتۆتە (٢٠٪)، لە شارەکانی تری فەڕەنسادا گەیشتۆتە (١١٪). هەروەها لە ١٢/٤/١٩٤٥دا یاسایەك لە فەڕەنسادا دەرچوو بۆ رێگەدان بە تەلاق لەم حاڵەتانەدا:

زیناکردن – لەلایەن هەرکامیانەوە بێت –، حوکمێك کە سزایەکی لاشەیی عەیبداری تێدابێت، خراپوونی تەواو لەلایەن یەکێکیانەوە بەرامبەر ئەویتریان، یان ئیهانەیەکی لاشەیی کە ببێتە مایەی شێواندنی ژیانی هاوسەریی.

بەڵام دوورکەوتنەوەی پیاو لە ژنەکەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، یان تووشبوونی بە نەخۆشییەکی درمو شێتی، هەروەها ناکۆکییەکی دوورو درێژ.، یاسای فەڕەنسیی لەم حاڵەتانەدا رێگەی تەلاق نادات. ئەوەی کە شایانی باسە تا ئێستاش ئەم یاسایە پەیڕەویی ئەکرێت.

سکاڵا: یاسایەکی کۆنەپەرستانەی پڕ لە ستەمە، مافی ئافرەت ناپارێزێ! لەوانەبە پیاوەکە سیل یان رشانەوەی بێ، بۆچ ژنەکەشی بیگرێت؟

کۆمەڵگەی ئینگلیزیی: کۆمەڵگەیەکی پرۆتستانتییە، رێگەی تەلاق ئەدات، دوایی رێگەشیان فراوانو پانتر کرد، بەتایبەتی کاتێ زانییان ئەنجامی رێبەستیی چاك نییەو خراپەو فڕوفێڵی زۆری تێدائەکرێت.

لەوەوپێش تەنها بەهۆی زیناکردن، یان زیاندانی یەکێك لە ژن و مێرد کە لە هاوسەرەکەی بیدابایە، ڕێگەی تەلاقی ئەدا، بەلام دوایی بۆیان دەرکەوت کە فراوانکردنی ڕێگەی تەلاق کەڵکی لە زیانی زۆرترە.

ڕووناك: ئەو فرۆفێڵەی کە ئەیانکرد، چییەو چۆن بوو؟

مامۆستا ساڵح: کاتێ کە خەڵك زانی تەنها لە ڕێگەی زیناکردن و زیاندانەوە ڕێگەی تەلاق ئەدرێت.، هەندێ ژن و مێرد کە حەزیان لە جیابوونەوە ئەکرد، لەناو خۆیاندا ڕێکئەکەوتن، شایەتیان دروست ئەکرد، ئەهاتنە دادگا، هەتا گەواهییان بۆ بدەن کە یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تردا خراپە، یاخۆ داوێن پیسیی کردووە، بۆئەوەی دادگا ڕێگەی تەلاقدان و جیابوونەوەیان لێنەگرێت.

جوان: ئای لەو ئابڕووو شەرەف و مرۆڤایەتییە!!

مامۆستا ساڵح: ئەمەش دەم هەڵبەستنی من نییە، بەڵکو لە فەیلەسووفی ئینگلیزیی (برتر اندرسل) وەرگیراوە کە ڕۆڵەی ئەو کۆمەڵگەیە.ئیتر لە ساڵی (١٩٣٧)دا یاسایەکی تری فراوانتریان دەرکردو تەلاقیان فراوانترکرد، تیایا بەپێی ئەو یاسایە لەم حاڵەتانەدا ڕێگەی تەلاق درا:

داوێن پیسیی، بەجێهێشتن بۆ ماوەی سێ ساڵ، کردنی هەندێ تاوان کە بەدڕەوشتی بنوێنن، نەخۆشی عەقلّی گەر پێنج ساڵی خایاند.

دوای ئەوەش لە ساڵی (١٩٥٠)دا یاسایەکی تر دەرچوو، کە پێی ئەگوترێ یاسای ڕێکخستنی سکالانامەی هاوسەریی (قانون تنظیم دعاوي الزواج)، ئەم یاسایە جگە لە بەشێکی کەم، هیچی لە یاسای تەلاق نەگۆڕی، هەتا وای لێهات ئەگەر ژن و مێرد لەسەر تەلاق ڕێك بکەون، یاسا یەکسەر فەرمان دەرئەکات بۆ بەجێهێنانی تەلاقەکەیان.

نەشمین: بەلام.. بەلام، ئەڵێن خۆرئاوا تەلاقکاریی تێدا هەر نییە! ناوی تەلاق هەر ناشبیستریێت، ئەی ئەمەیان چۆن.. چۆن؟!

مامۆستا ساڵح: بەڵێ، تۆ وایان پێگوتوویت، بەوجۆرەی کە خۆت ئەڵێیت بیستووتە، ناهەقت نییە کە سەرت سووڕ ئەمێنێ، چونکە دوو شتی زۆر پێچەوانە، لە ئیسلام و خۆرئاوا، لەبیستنی لەمەوبەرو ئێستا، خەریکە لەلات کۆئەبێتەوە.

**لە ئیتاڵیادا:** لەم وڵاتەدا چ یاسای ئایینی و چ یاسای زەمینی ڕێگەی تەلاقیان نەئەداو تەنیا ڕێگەیەك مەگەر مردن بووایە بۆی. کەچی دەوڵەت لە (١٩٧٠/١٢/٢)دا ناچاربوو ئەو ڕێگەیە بدات. لە (١٩٧٠/١٢/١٢)دا، دەست بە جێبەجێکردنی یاساکە کرا. ئیتالیا لەڕووی ڕێگەدانی تەلاقەوە زۆر لالووت (متعصب) بوو. بەلام هەر لەو ڕۆژەدا کە ڕێگەی کردەوە ژمارەی تەلاقدراوان گەیشتە یەك ملیۆن!.

پێش دەرکردنی ئەو یاسایە لەملاو لەولای ئەو وڵاتەدا خۆپیشاندان ڕێکخراو داوای دانانی یاسی ڕێگەدانی تەلاقیان ئەکرد، یەکێ لەو لافیتانەی کە خۆپیشاندەران لەو کاتەدا بەرزیان کردبووەوە ئەمەی لەسەر نووسرابوو: (ئاژەڵ تەلاقدانی بۆ نییە، بەلام گەلە پێشکەوتووەکان هەیانە). هەروەها خۆپیشاندەرەکان ئەیانگوت، لە ئیتالیادا پتر لە پێنج ملیۆن هاوسەریی ناشەرعی هەیە، هۆی ئەمەش تەنها ڕێنەدانی تەلاقە.

سکالا: خۆزگە ئەمەم زوو ئەبیست، ئای من چی و چۆنم بیستووە!

دڵپاك: بەلام ئەوەتا ئێستا ئەیبیستی و زیاتریش ئەبیستی.

مامۆستا ساڵح: کچم! هەرکەس بیەوێ دوای ڕاستی بکەوێ، ئەتوانێ لەوکاتەوە دەستپێبکات کە ڕاستییەکەی بۆ دەرئەکەوێ، (عفا الله عما سلف).

**له سویدا:** لەم وڵاتەدا لە شەش تا حەوت هاوسەرییدا تەڵاقدانێکی بەدەمەوەیە. ئەمەش لەو سەرژمێرییەدا هاتووە کە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیی سوید پێی هەڵسا. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە سوید دەست ناهێنێتە بەر ڕێگەی ئەو ژن و مێردەی کە حەز لە جیابوونەوە ئەکەن، بەڵکو ژن، یان مێرد هەرکامیان داوای تەڵاق بکا، یەکسەر داواکەی بۆ ئەچێتەسەر.

**له یۆناندا:** له ساڵی ١٩٢٠ زاییندا ئەو وڵاتە ڕێی بە تەڵاقدا، لەپاشدا لە ساڵی (١٩٤٦) یاسایەکی تر دەرچوو کە تاکو ئێستاش ئیشی پێ ئەکرێت. ئەو یاسایە لەم حاڵەتانەدا ڕێگەی تەڵاقی ئاچۆغ کردووە:

داوێن پیسیی، تاوانی چەند ژنێتیی (!!)، دەستدرێژی کردنە سەر ژیان، بەجێهێشتنی بە ئەنقەست، دژواریی ژیانی ژن و مێرد، نەخۆشیی عەقڵیی، نەخۆشی گولیی، بزریی و نادیاربوون.

**له ئیسپانیادا:** حکومەتی ئیسپانیا لە گەلاوێژی (١٩٧٨)ی زاییندا، بڕیاری ڕێگەدانی تەڵاقی بەشێوەی یاسایەك دەرکرد. ئەمجا ئەو یاسایە لە دەنگدانێکی گشتییدا، لە کانوونی دووەمی (١٩٧٩)ی زاییندا بەسەرکەوتووانە بردیەوە. تەنانەت لە ئیسپانیادا دەرکردنی ئەو یاسایە بە یەکێك لەو کارە چاکانە تەماشاکرا کە بووە هۆی لایەنگیریی کردنی دەوڵەت لەلایەن گەلەوە. نەتەوەی ئیسپانی دەستی نەهێنایە بەر ئەو یاسایە، چونکە ئەیزانی کارەساتی تەڵاق بەستن چ کارەساتێکی بەدەمەوە بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو گرەنتییە (الضمانات)ی کە ئیسلام بۆ ئافرەت دایناون، هیچکام لەو دەوڵەت و وڵاتانە پەییان پێنەبردوون. ئەو هەندە بەستنەوانە (القیود)ی کە دایانناون بۆ نەکەوتنی تەڵاق، پاش ماوەیەك ئەبنە مەرەکەبێکی رووت لەسەر کاغەز.

ئاواز: مامۆستا! جیهانی سەرمایەداریی هەرچییەکی پێبڵێیت و چۆنی باس بکەیت، باوەڕم هەیە کە ڕاست ئەکەیت، لەوەی کە باستکرد زیاتریشی پێوەیە، ئەوانە پارە پەرستن، هەموو شتێك ئەکەنە قوربانی پارە، ئەی بۆچ پێیان ئەگوترێت سەرمایەدار؟

**له یەکێتی سۆڤیەتدا:**

مامۆستا ساڵح: لەم وڵاتەدا سەیرترو غەریبتر مەسەلەکە بەر گوێ ئەکەوێت، ڕۆژنامەی (الاهرام)ی میصری لە ژمارەی ڕۆژی (١٩٦٦/٤/٢٦)ی زاییندا بە وەرگرتن لە (پراڤدا) کە زمانحاڵی پارتی شیوعی سۆڤیەتە، وتاری زانایەکی گەورەی کۆمەڵایەتیی رووسی کە دکتۆر (خارشێڤ)ە بڵاوکردەوە، خارشێڤ تیایا گوتبووی: "هەر نۆ هاوسەریی (من کل تسع زواج)، لە یەکێتی سۆڤیەتدا یەکێکیان تەڵاقی پێوەیە، هۆی سەرەکی ئەوەش بەدرەوشتییە، بەتایبەتی عەرەق و مەرەق خواردنەوە".

دیسان خارشێڤ ئەڵێت: "ژمارەیەکی زۆر لە ژن و مێرد کەمتر لە سێ ساڵ ئەتوانن پێکەوە بژین، بەڵکو هەندێکیان لە چەند هەفتەیەك زیاتر پێکەوە هەڵناکەن، یاخۆ چەند مانگێك ئەژین".[1]

هەروەها لەپێش ئەوەدا ڕێژەی تەڵاق لە سۆڤیەتدا ئێجگار بەرزبووە.، بەرزییەکی سامناکی وەها کە کاربەدەستانی ناچارکرد یاساکانی ساڵی (١٩٤٤)ی زاینی دەربکەن، کە لەو یاسایانەدا داوای کەوتنە نێوانەوەیان ئەکرد لەکاتی دەرکەوتنی ناکۆکیدا لەنێوان ژن و مێرددا و تۆمارکردنی پەیمانی هاوسەرییشیان واجب کرد.

لەپاشاندا لە ساڵی (١٩٤٦)دا دەوڵەت چەند یاسایەکی تری هەر لەسەر تەڵاق دەرکرد، کە تیایاندا باسی ئەوە هاتبوو ڕێگەی تەڵاق نەدرێت، تا هەموو هۆیەکانی ڕێککەوتنەوە و ئاشتکردنەوەی نێوان ژن و مێرد نەگیرێنە بەر و تاقی نەکرێنەوە.

ئاواز: دیارە ئەوە کارێکی زۆر چاك و سەرکەوتووانەیە.

---

1 – الطلاق بين الفقه والقانون: ابراهيم النعمة.

دڵپاك: سبحان الله! ئەی کاتێ باسی تەڵاقمان لە ئیسلامدا کرد، گوتمان (أبغض الحلال)ە بەلای خواوە، باسی ئامۆژگاریکردنو جیاکردنەوەی جێگا و لێدانو کەوتنە نێوانەوەمان کرد، ئەوە بۆچ نەتگوت کە (کارێکی زۆر چاكو سەرکەوتووانەیە)؟ خۆ ئیسلام زیاتر لە هەزارو سێ سەدو پەنجا ساڵ ئەو ئیجرائاتانەی جێبەجێکردووە.

سکالا: ئاخر گوتنی ئەوە بڤەیە بۆی، قورگی ختووکەی دێت پێی!

جوان: هەرکەسێ بە ڕێبازێك شەیدایە، گوتنی حەقیش قورسو گرانە.

ئاواز: نەخێر، وانییە. ڕێبازی کاروانی سۆشیالیزم پاکە، شتی پڕوپووچ ناگرێتە خۆی، تەڵاق دان هەر باوی نییە لەو ڕێبازەدا.

مامۆستا ساڵح: کچی بەڕێزم! ئێمە پێمان ئەڵێن خوێندەوار، ڕۆشنبیر، پێویست بە هەڵچوون ناکات. ئەبێ سنگمان فراوان بێ لەکاتی گفتوگۆدا.

تۆ ئەڵێیت تەڵاق لە ڕێبازی سۆشیالیزمدا هەر باویشی نییە، بەڵام وادیارە خۆت گێل ئەکەی یان هەواڵ نازانی. وەك ئەزانین یەکێتی سۆڤیەت ئاغای هەرە گەورەی سۆشیالیزمە.، جا لەم وڵاتەدا ژنهێنانو شووکردن بەڕای (لینین) یەکگرتنێکی سەربەستانەیە. بگرە لینین خۆی لەسەر ئەو بناغەیە لەگەڵ (کروبسکایا) یەکیان گرتووەو خۆیان کردۆتە سەرمەشقی شەیدایانی ڕێبازی سۆشیالیزم.

ڕەنگە تۆ بێئاگابی لەوەی کە لەو ڕێبازەدا خێزان هیچ نرخێك، یان هیچ شوێنێکی بۆ دانەنرێت، چونکە خێزان لە ڕووانگەی ئەو ڕێبازەوە ژیانگە (بیئە)یەکی مەترسیداری نەگونجاوە لەگەڵ سرووشتی شۆڕشدا!، ئاشکرایە بە نەهێشتنی خێزانو باو نەمانی، باوی تەڵاقیش نامێنێ. جا ئەگەر تۆ مەبەستت ئەمەبێت، دیارە قسەکەت ڕاستەو منیش لەگەڵتام، بەڵام ئەگەر مەبەستت شتێکی تر بێت، ئەڵێم: نەء.

ڕەنگە نەتزانیبێ کە هاوسەریی لە سۆڤیەتدا، سەر ڕێگەییە، منداڵ لەباربردن ئێجگار بڵاوە، تەڵاق کتوپڕییە، سەرژمێریی ساڵی (١٩٣٥)ی زایینیی سەلماندوویەتی کە (٤٤,٣٪) ڕێژەی تەڵاقە لەو گەورە قەڵایەی سۆشیالیزمەدا!!

ئاواز: باشە، ئەو یەکگرتنە سەربەستانەیە چ نەنگو زیانێکی تێدایە؟ ئایا سەربەستیی لە هاوسەرییدا تاوانە؟

مامۆستا ساڵح: نەخێر سەربەستی تاوان نییە. بەڵام ئەوەی کە لینین باسیکردووە، ئەو سەربەستییە نییە کە تۆ مەبەستتە، ئەو مەبەستی ئەوەیە هەر نێرو مێیەك هەرکە ویستیان بلکێنو هەرکە حەزو مەیلیان بوو جیاببنەوە وەك نێرو مێی ئاژەڵەکانی تر کە بەو جۆرە ئەلکێنو جیائەبنەوە، یەکگرتنێکی دوور لە هەموو ڕێکخستنو بنەماو (ضوابط)و ئەرکێکی دیاریکراو.

بەهۆی ئەوەیشەوە لە سۆڤیەتدا تەڵاق وەك هاوسەریی سووكو ئاسان بوو، شەپۆلێکی ئێجگار فراوانی تەڵاقدان لەپێش جەنگی جیهانی دووەمدا ئەو وڵاتەی گرتەوە، بناغەی کۆمەڵگەکەی هێنایە لەرزە، ڕێژەی ئەو کرێکارانەی کە نەفەقەی تەڵاقیان لەسەر بوو گەیشتە (٤٠٪)ی کرێکاران. لە ساڵی (١٩٣٥)دا ستالین هەستی بە مەترسی واقعیی ئەو دیاردەیە کردو کەوتە جموجووڵ بۆ وەستاندنی.[1]

### لە وڵاتی چیندا:

مامۆستا ساڵح: پاش شۆڕشی (ماو تسی تونغ) لە ساڵی (١٩٤٨-١٩٤٩)ی زاییندا ئافرەتی چین تا تەمەنی نەگاتە (٢٥) ساڵ بۆی نییە شووبکات. هاوسەریی لەم وڵاتەدا بەبێ بڕیارلەسەردانی ئەو ڕێکخراوەیەی کە هەریەکەیان وابەستەیە پێوەی، قەدەغەیە. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەت چەندەها کاروباری توندوتیژو کاریگەری

[1] تەماشای پەڕاوی ( المرأة في القرن العشرين) جروان السابق بکە.

لەسەرئارەزووی جنسیی داناوە، ئەمەش نەك لەبەر خاتری خوا، یان چاوی کاڵی ئابڕووو رەوشتپاکیی، نەخێر، بەڵکو ئەم داوێن پاکییە لە پێناوی (هۆی ئابووری)دا ئەبێ پەیڕەویی بکرێت!.

لاوان و گەنجان بە نێرو مێیانەوە ئاخنراونەتە ئەو شوێنانەی خەوتنەوە کە نێرو مێ پێکەوەن، هەریەکە لەوانە بە بچووکرین جموجووڵی دراوسێیەکەی بەئاسانی ئەزانێت و هەرچی شتێکی لەو رووەوە بەرچاو بکەوێت ئەیکات بە راپۆرتێك و پێشکەشی دەزگای هەواڵگریی (مخابرات)ی تایبەتیی ئەکات.

شکاتلێکراوی بەدبەختیش ئەبێ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ کارێکی پڕ لە زەحمەتی دەستیی (لاشەیی) بکات کە حەزو هەوەسی جنسیی بۆ جارێکی تر نەیەت بە بیردا! جا فەرموو سەرنج بدە لە ژیان و گوزەرانی هاوسەریی لە وڵاتی وەهادا! هاوسەرییەك کە لەسەر ئەو بنەڕەتە دابمەزرێت، ئەبێ جیابوونەوەی چۆن بێت؟!

رویر غۆیان، کە لە وڵاتی چیندا ماوەیەك ماوەتەوە و گەلێ بە ناوچەکانیدا گەڕاوە، باسی پووکانەوە (القمع)ی جنسیی لە چینی نوێدا ئەکاو نیشانی ئەدات کە گەنجان (بەنێرو مێ)وە لە حاڵەتی تێکشکاویی هێزە جنسییەکاندا ئەژین، لەژێر پاڵەپەستۆی ئەم قسەیەدا (خۆشەویستی هەوەسێکی گەنیوی نزمی شوێنکەوتووانی بورجوازییەتە) حوکم ئەکرێن، بچووکترین حەز لەگەڵ خۆشەویستی بە کارگەندیی (الرزیلة) ئەژمێررێت.

چاکترین هاوڵاتیی (المواطن)ی چینی ئەو ئافرەتەیە کە سی (٣٠) ساڵی یەکەمی تەمەنی بەرێتەسەر، بەبێ ئەوەی لە خۆشەویستی تێگەیی بێت و باسی کردبێت، توانایشی بخاتەکارەوە بۆ ئەوەی رابێت کە بیریشی لێنەکاتەوە. جا وڵاتێك کە ئەمە جۆرو شێوازی بیرکردنەوەی بێت لە خۆشەویستی و هاوسەریی، ئەی قوڕ بەسەر مەسەلەی تەلاقدا!![1]

جوان: بەخوا برا من ئەم شتانەم بەپێچەوانەوە بیستووە! لەبەرئەوە ئەچمەوە سەر پەندەکە کە ئەڵێت: (نازانم رەحەتی گیانم).

مامۆستا ساڵح: ددان نان بە نەزانییدا کارێکی چاکە، بەڵام ئەبێ هەوڵی زانین بدەیت. گیروگرفتەکە لەوەدایە کە ئێوە نەشارەزای ئیسلامن، کەچی وا تێگەیەنراون کە ئیسلام ستەمکارە دەربارەی ئافرەت، ئەمەش بوختان و درۆیەکی زۆر گەورەیە و تاوانێکی ئێجگار گرانە، داواتان لێئەکەم کە چاوێك بە خۆتانا بخشێننەوە و هەڵەکانتان راست بکەنەوە، هیوادارم خوا بناسن و لێی بترسن، بیرتان بەلای دواڕۆژتانەوە بێ، خوای میهرەبان لەگەڵ بەندەکانیدا ستەم ناکا، بەڵام تاوانبارو گومڕاyانیش لە سزاو تۆڵەی دەرباز نابن، بیر لەو رۆژە بکەنەوە کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، هەموو کەسێکیش بەرهەمی کێڵگەی دنیای دێتەوە دەستی (وَاتَّقُواْ يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ) (البقرة : ٢٨١ ).

کچە شیرینەکانم! ئەوە مەسەلەی تەلاق بوو لە پێشکەوتووترین وڵاتانی سەر زەویی ئەمڕۆدا (کە بۆم باسکردن). ئەو وڵاتانەی کە ئێمە ئاسۆی رزگاریی و پێشکەوتن و بەختیاریی خۆمان ـ کە بەهۆی بێئاگایی و سەر لێشێواوی خۆمانەوە ـ، بەنێو چاوانیانەوە بەدی ئەکەین! چەندەها رۆشنبیری وەك ئێوەیان لە رێگەی شاگردەکانیانەوە فریو داوە، دەسخەڕۆ کردووە، کردوونی بە خوێنخۆرو دوژمنی ئایینەکەتان (ئایینی پاکی ئیسلام)، ئەو ئایینەی کە بەرنامەیەکی خواییە و بە خەڵات ناردوویەتی بۆ گرۆی ئادەمیزاد.

سکاڵا: داوائەکەم لە خوا لە گوناهو تاوانی لەمەوبەرم خۆش ببێت!

پرشنگ: مامۆستا! باسی رادەی تەلاقت لە گەلێ وڵاتی سەرزەوییدا کرد، بەڵام لە وڵاتێکی ئیسلامییدا، ژمارەیەکت بە دەمدا نەهات!

مامۆستا ساڵح: شەوگار درەنگە، إن شاء الله بەیانی ئەوەش باس ئەکرێت.

---

1 – المرأة في القرن العشرين جروان السابق. فصل: الامنتمية

**تەڵاق لە سوریەدا:**

سکاڵا: مامۆستا گیان! بێگومان پەیمانەکەتت لەبیر نەچۆتەوە.

مامۆستا ساڵح: بەڵێ، لەبیرم نەچۆتەوە. بەڵام نازانم باسی کام وڵاتی ئیسلامیی بکەم! بەڕاستی کە باسی ئیسلام ئەکەین، شەرم دامئەگرێت کە وڵاتێك ناو ببەمو بیکەمە نموونەی ئیسلامەتی، چونکە وڵاتانی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیی تەنیا بە ناوو بە یادی ئەوساوە پێیان ئەوترێت ئیسلامییە . ئەمەش بەداخەوە ئەڵێم .

بەڵام بۆ وەڵامی پرشنگ خان باسی سوریە ئەکەم. سوریە وڵاتێکی زۆر مسوڵمان نییە کە بتوانین بڵێین لەسەر یاساکانی ئیسلام ژیانی ئەچێتە سەر، یان بەپێی ڕێبازی ئیسلام گەلو دەوڵەت ڕەفتار ئەکەن.، بەڵام وەك پشکۆیك لەژێر ژیلەمۆدا، تینی مسوڵمانەتی لەناخی زۆربەی گەلی سوریەدا هەر ماوە، تا ڕاددەیەك با بەڕێگەی چاولێکەریی و ویراسییش بێ، ئەو پشکۆیە کاریگەریی ماوەو کاری خۆی ئەکا. دەی تەماشای ئەم خشتەیە بکەن لەم پەڕاوەی (نورالدین العر)دا، (ماذا عن المرأة) کە سەرژمێرییەکانی نیسبەتی تەڵاق لە چەند ساڵێکی ئەو وڵاتەدا نیشان ئەدات:

| ساڵ | وڵات | هاوسەریی | تەڵاق | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | سوریە | ٢٤٨٧٦ | ٢٤٠٩ | ٪٩,٦ |
| ١٩٥١ | سوریە | ٢٦٠٤٤ | ٢٣٣٧ | ٪١١ |
| ١٩٥٢ | سوریە | ٢٢٥٤٧ | ٢٤٧٥ | ٪١٠,٩ |
| ١٩٦٣ | سوریە | ٣٠٣٦٣ | ٣١٩٨ | ٪١٠,٥٣ |
| ١٩٦٤ | سوریە | ٣٤٧٧٦ | ٣٢٧٣ | ٪٩,٤١ |
| ١٩٦٥ | سوریە | ٣٤٦١٩ | ٣١٩٧ | ٪٩,٢ |

شاری (حماه) لە وڵاتی سوریەدا، گیانێکی مسوڵمانانەی هەیە، لەبەر ئەوە ساڵ لەدوای ساڵ نیسبەتی تەڵاق تیایدا بەرەو نزمبوونەوە ئەچێت. بۆ نموونە: لە ساڵی (١٩٦٥)دا (٪٦,٩) بوو کەچی لە (١٩٦٦)دا (٪٥,٧) بوو.

جوان: هیچ ساڵێکی نەگەیشتۆتە (٪١٢)، لەچاو وڵاتانی خۆرئاواو سۆڤیەتدا هەر هیچ نییە. ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر ئەوەی کە ڕادەی تەڵاق لەناو موسڵماناندا نزمترە وەك لە ناموسڵمان.، کەچی ئێمە ئەم ڕاستییەمان زۆر بەپێچەوانەو هەڵگەڕاوەیی گەیشتۆتە لا!.

ئەمەش لەکاتێکدا کە ئیسلام ڕێگەی تەڵاقی بەربەست نەکردووە، کەچی وڵاتانی ناموسڵمان بەربەستو قەدەغەیان کردووە!!.

## بەستنەوە سەرکەوتوو نییە

ڕووناك: مامۆستا! هەنگاوو چارەیەکی تر هەیە، ئەگەر بنرێت و پەیڕەویی بکرێت دڵنیام کە یەکێتی خێزان، بەردەوامیی ژیانی، سەلامەتی دڵ و دەروونیی منداڵ ئەپارێزێت و کۆمەڵگە لە زیانی خراپەی تەڵاقکاریی سەلامەت ئەبێت.، کەسیش توانای ڕەخنەگرتنی نامێنێ.

مامۆستا ساڵح: ئەگونجێ ئەو هەنگاوو چارەیەمان پێبڵێیت؟

ڕووناك: بۆچ نەء! تەڵاق ببەسترێتەوە. مەبەستم ئەوەیە کە تەڵاق ئەگەر لەبەردەم دادوەردا نەبێ، نەکەوێت، ئەویش دوای ئەوەی کە دادوەر قایل ئەبێت بەوەی کە ژیانی ئەو دوو هاوسەرە پێکەوە مەحاڵە.

نەشمین: بێگومان ئەمە چارەسەرێکی بەرزی بێوێنەیە! جوانە!!

پرشنگ: تەنها لەم ڕێگەیەوە ئافرەت دڵنیایی دەست ئەکەوێت.

مامۆستا ساڵح: یەکێك لە پەندەکانی پێشینان ئەڵێت: (دنیا پەڕەنەو مەتیلی کەڕەنە). واتە دنیا پڕە لە هەواڵ و دەنگوباس، بەڵام پوری لەبەر ئەوەی کە کەڕەو نابیستێ ئاگای لە هیچ هەواڵ و دەنگوباسێك نییە.

کچە بەڕێزەکانم! ئەم بیروڕایە داهێنراوی بیروهۆشی ڕووناك خان خۆی نییە، چەندەها کەسی تر پێش ئەم و لەمەوبەر ئەمەیان بیستووەو گوتوویانە، ئەم تازە بیستوویەتی و گەیشتۆتە لای.

هەندێك لە نووسەرە میسرییەکان پێش شەست و حەوت ساڵێك لەمەوبەر ئەمەیان دا بەگوێی خەڵکدا، داوایان کرد کە تەڵاق ئەگەر لە دادگادا نەدرێت، بە کەوتوو دانەنرێت، واتە ئەبێ ژن تەنها لە دادگادا تەڵاق بدرێت. بۆ سەرگرتن و سەرکەوتنی ئەوەش، هەرکەس لە دەرەوەی دادگادا ژن تەڵاق بدات سەد (١٠٠) دینار سزا یان سێ (٣) مانگ بەندیخانەی بەسەردا ئەدرێت. ئەمە لە ساڵی (١٩١٦)ی زاییندا هاتەکایەوە، لە دواییدا لە (تونس)دا بڵاوبۆوە. کەچی هەر لە سەرەتاوە یاساکە بەگۆڕکراو سەرنەکەوت. ئەو یاسایەش لە بنەڕەتدا یاسایەکی بیروهۆشی فەرەنسەیە.

ڕووناك: یاساکە هی هەرکەس و هەر کوێ بێ گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە پڕ لە خێرو چاك و پێشکەوتووانەیە. ئەی نابێت بەرژەوەندیی کۆمەڵ و کۆمەڵگەو ئافرەت بەتایبەتی ڕەچاو بکرێت؟

پرشنگ: بەوە ئافرەت لە ستەم و جەوری پیاو ڕزگاری ئەبێت!

مامۆستا ساڵح: ڕووناك خان! ئەگەر تۆ مەبەستت ئەوەبێ کە تەڵاق تەنها بە هاتنەدەرەوەی لە دەمی پیاودا نەکەوێت و لە دادگادا بکەوێ، ئەویش دوای ئەوەی کە دادوەر ئەنێرێت بەدوای دوو حەکەمدا، یەکێکیان لە کەسوکاری ژنەکەو ئەوی تریان لە هی پیاوەکە، تا پێکەوە لە ناکۆکیی و تەنگ و چەڵەمەی نێوان ئەو ژن و مێردە بکۆڵنەوەو هەوڵی حەلکردنیان بدەن و ڕێکیان بخەنەوە. ئەمە زۆر جوان و بەجێیە، ئیسلام پێشوازی ئەم هەنگاوە پیرۆزە ئەکات، چونکە ئەم کارە خۆی بەشێکە لە شەریعەتی ئیسلام و مسوڵمانان لە کۆن و تازەدا پەیڕەوییان کردووە.

سکاڵا: خوشکە دڵپاك ئەوەی بە درێژیی بۆ ئێمە باسکرد، بەڕاستی ئیسلام لەوەدا گەیشتۆتە چڵەپۆپە، چونکە بە هەنگاوی ورد دەست بۆ مەبەستەکە ئەبات: ئامۆژگاریی کردن، جێگا لێ جیاکردنەوە، لێدان، کەوتنە نێوانەوە، خۆداماڵین، ئینجا دوو جار تەڵاقدان، دوای ئەوە ژیان پێکەوە بە خۆشیی، یان جیابوونەوە بەچاکیی و مەردایەتی.

مامۆستا ساڵح: ئافەرین سکاڵا خان! زۆر چاك تێگەیشتوویت، ماشاء الله زیرەك دیاریت. دەی ئەگەر ژن و مێرد بەو هەموو هەنگاوانە ژێر نەبن و عیبرەت وەرنەگرن، ئەگەر ئەو هەموو هەوڵ و کۆشە بێکەڵك و نەزۆك بێت.، دادوەر چیی پێئەکرێت؟

ڕووناك: چۆن چیی پێئەکرێت؟ ناهێڵێ تەڵاقەکە بکەوێ، کەمە؟

ماموٚستا سالْح: نالْیٚم کەمە، بەلاٚم تەلاٚق هی میٚردە نەك دادوەر، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە، ئایا ئەوە کەلْکی ئیجابیی بوٚ ئافرەت هەیە؟ ئایا ئەو کارە سەرکەوتوو ئەبیٚت؟

ئەوەتا هەندیٚ ولاٚتی پیٚشکەوتووی خاوەن شارستانیەت (لەوانە ئەمریکا) کە دوور لە شەریعەتی ئیسلام ئەژین، تەلاٚقیان تەنیا لە دادگادا ئەکەویٚ، ئەویش لەدوای هەولْو تەقەلادان بوٚ چاککردنی نیٚوان ژنو میٚردەکە بەنیازی قایل کردنیان کە تەلاٚق زیانمەندیی پیٚوەیەو پەشیمانیی بەدواوەیە. ئایا نیسبەتی تەلاٚق بەوە هاتەخوارەوە؟ هەر سەرژمیٚریی خوٚیان دەری نەخست کە رادەی تەلاٚق لە (١٩٤٨)دا (٤٠٪) بووە، کەچی لە سالاٚنی دواییدا بەرزتر بوٚوە تا گەیشتە (٦٠٪)؟! لە رووسیادا لەمەش بەرزتر نەبوٚوە؟ ئایا ئەوە بەکەلْکە؟ دادوەر ئەتوانیٚ بگاتە ناخو ناوکروٚکی هەموو گیروگرفتو تەنگو چەلْەمەیەکی هەموو ژنو میٚردیٚك؟

پرشنگ: بەستنەوەی تەلاٚق ئەگەر کەلْکی نەبیٚت، ئەوە زیانی هەرنییە، بەتایبەتی بوٚ ئافرەت. ئەی بوٚچ دادوەر ناتوانیٚ بگاتە ناخو ناوکروٚکی هەموو گیروگرفتیٚك؟ زوٚر چاك ئەتوانیٚ، چی تیایە؟

جوان: چوٚن ئەتوانیٚ؟ های! واللە هەر پیٚنج ژنو میٚرد دادوەریٚکیان ئەویٚ.

ماموٚستا سالْح: قسەی خوشکە جوان زوٚر جوانەو راسیشە. بەداخەوە! زوٚربەی مەسەلەکان هەروا بە هەرەمەکی حوکمیان بەسەرا ئەدەن، بەبیٚئەوەی لەپیٚشەوە بیری لیٚبکەنەوە. بەلاٚم چاك بزانن کە زیانی بەستنەوەی تەلاٚق ئەوەندە زوٚرە کە کەلْكو سوودەکەی لەچاو زیانەکەیدا هیچ بایەخیٚکی ئەوتوٚی نەبیٚ. بوٚ نموونە:

پیاویٚك ئەیەویٚ ژنەکەی تەلاٚق بدات، یان ئافرەتیٚك ئەیەویٚت تەلاٚق بدریٚت، ئەمەش بەهوٚی نەنگ (عەیب)یٚکی رەوشتی یاخوٚ بەهوٚی نەنگو ناتەواوییەکی لاشەیی ئەوی تریانەوە (واتە هاوسەرەکەی) بەلاٚم نایەویٚو حەزناکا ئەو نهیٚنییە لای هیچ کەسیٚکی تر بدرکیٚنیٚ، بەرای ئیٚوە، ئایا هەلْمالْینی پەردە بەسەر ئەو نهیٚنییەوە کەلْكو سوودی هیچکامیانی تیٚدایە؟ دادگا ئەتوانیٚ بگاتە ناوەروٚکی ناکوٚکییەکە، لە کاتیٚکا هیچکامیان نایانەویٚ لە دادگا بیدرکیٚنن؟

رووناك: لەگەلْتام. لەم حالْەتانەدا دادوەر دوٚش دائەمیٚنیٚ.

ماموٚستا سالْح: بەوپەری دلْنیاییەوە دەیلْیٚمەوە کە دادوەر ناتوانیٚ لە هەموو تەنگو چەلْەمەیەکدا دەستی بگەیەنیٚتە هوٚیە سەرەکییو بنەرەتییەکەی ئەو تەنگو چەلْەمەیە، چونکە خاوەنەکەی نایەویٚ بیدرکیٚنیٚو خوٚ دادوەریش غەیب نازانیٚت، لەبەر ئەوە هەمیشە سەرکەوتوو نابیٚت. واتە بەستنەوەی تەلاٚقیش کاریٚکی بیٚکەلْکە.

رووناك خان! توٚ هەر خوٚت، جار هەیە بوٚ یەکەمجار کەسیٚك ئەبینی، بەبیٚئەوەی کە بیناسیت خوٚشت ئەویٚ. یەکیٚکی تر هەر بەوجوٚرە ئەبینیو هەر لە خوٚتەوە رقت ئەبیٚتەوە لیٚی. بوٚ؟

رووناك: واللە خوٚ راست ئەکەیت! زوٚرجار هوٚیەکەی نەزانراوە، چونکە ئەوە پەیوەندیی بە دەروونو ناخەوە هەیەو مروٚڤ دەسەلاٚتی بەسەر ئەو جوٚرە حالْەتانەدا (بەزوٚریی) نییە.

ماموٚستا سالْح: ئەوەی کە گوتت راستە، وایە. گەلیٚجار گوٚرین، یان لابردنی ئەو حالْەتە ئەگەر مەحالْ نەبیٚت خوٚ زوٚر گرانو قورسە، دەی چی ئەکەی لە پیاویٚك، یان ژنیٚك، کە لەبەر حالْەتیٚکی دەروونیی وەها (کە لەوانەیە زاناکانی دەروونییش نەتوانن چارەی بکەن) ئەیەویٚ لە هاوسەرەکەی جیاببیٚتەوە؟ ئایا ناچارکردنی ئەو جوٚرە کەسانە لەلایەن دادوەرەوە بوٚ جیانەبوونەوە ئەنجامەکەی چاك ئەبیٚت؟

با بلْیٚین دادوەر ناهیٚلْیٚت پیاویٚك ژنەکەی خوٚی تەلاٚق بدات، لەکاتیٚکا ئەو پیاوە ژنەکەی ناویٚتو حەز لە چارەی ناکات. توخوا ژن لەو حالْەتەدا چ کەرامەتیٚك، چ مروٚڤایەتییەکی بوٚ ئەمیٚنیٚتەوە، لە مالْیٚکدا کە ئەو پیاوە بە چاویٚکی سووك تەماشای بکات، بە باریٚکی قورسی بزانیٚت بەسەر شانیەوە، بەیانیو ئیٚوارە لووتەلا بیٚت لیٚی، کەشخەو فیزی بەسەرا بکات، هەمیشە دەریببریٚت کە نایەویٚ، خوٚشی ناویٚتو یاسا ناچاری کردووە ئەگینا ناوی

له دڵیا سڕاوەتەوە، تەنانەت لەگەڵیا نەخەوێت‌و دەستدرێژیی‌و ناپاکیی بەسەرا بکات‌و خۆی ببەستێت بە ئافرەتێکی ترەوە، چ بە نهێنی‌و چ بە ئاشکرا، ئەمجا قسەی تاڵ‌و جنێوی بدات بەڕوودا، لێی بدات... هتد.

توخوا ئەمە کەڵک‌و قازانجی بۆ ئافرەت هەیە؟ بەرژەوەندیی ئافرەتی تیایە؟ توخوا ئەوە بە بەندەکردنی ئافرەت نییە؟ چەوسانەوە لەوە خراپتر هەیە؟ بێنرخکردن لەوە پیستر هەیە؟ چ کەرامەتێک‌و شکۆیەک بۆ ئافرەت ئەمێنێتەوە؟ بە نیسبەت پیاوێکیشەوە کە ژنەکەی رابکات لێی‌و دادوەر ئەو ژنە ناچار بکات کە جیا نەبێتەوە لە مێردەکەی، مەسەلەکە هەر وایە‌و ناگۆڕێت، وەک (عەلی کەچەڵ‌و کەچەڵ عەلی) وەهایە.

نەشمین: ئێمە هەرچی ئەڵێین تۆ یەکسەر ئەمانبەستیتەوە. ئیتر نازانین بڵێین چی!

مامۆستا ساڵح: نا، نامەوێ بتانبەستمەوە. تەنها ئەوەندە هەیە کە وەڵامی پرسیارەکانتان ئەدەمەوە، مەبەستی من بەستنەوە‌و بەزاندن نییە، بەڵکو هەندێ راستیتان لەسەر رۆشنایی ئیسلام لەم رووەوە ئەدەم بەگوێدا، بەشکو کەڵکی لێوەربگرن.

زیانی بەستنەوەی تەڵاق، هەروەک شکۆ‌و نرخ‌و مرۆڤایەتیی ئافرەت ئەهێنێتە خوارەوە‌و ئەیڕووخێنێ، هەر بەو جۆرە. بگرە زیاتریش. منداڵانی ئەو خێزانە بەدبەخت‌و سەرگەردان ئەکا، تووشی زەرەرو زیانی خراپی ژیانی ئەو دایک‌و باوکە ئەبن، وا ئەزانن ژیان هەمووی بەو جۆرەیە، پەروەردەیەکی خراپی لارو خوار وەرئەگرن، هەموو جۆرە گرێیەک لە دەروونیاندا ریشە دائەکوتێ، بەڕاستی نەک هەر دوورخستنەوەیان لەو خێزانە، بەڵکو نەبوونی ئەو جۆرە دایک‌و باوکە چاکترە لەوەی کە بن‌و بەو جۆرە ناهەموارە لەگەڵیانا بژین.

ڕووناک: بەهەرحاڵ، زۆر سوپاست ئەکەم گەلێ شت فێربووم.

نەشمین: بەخوا مامۆستا ئێمە ئەم جۆرە باسە ئیسلامییانەمان نەبیستووە، من وامزانیوە ئیسلام ئەم جۆرە شتانەی هەر تێدا نییە، وامزانیوە کە تەنها نوێژکردن‌و رۆژووگرتنە‌و هیچی تر، ژنیش بە جۆرە دەعبایەک تەماشا ئەکات، من راست ئەڵێم، وەهام بیستووە.

مامۆستا ساڵح: سەد رەحمەت لە دایک‌و باوکت کە ددان بەڕاستیدا ئەنێیت، خوا یارمەتیت بدات‌و بتخاتەوە سەر شارێگە.

## ئیسلام لغاوی پیاوی شل نەکردووە

جوان: مامۆستا گیان! با ددان بە واقیعدا بنێین. هەندێ مێرد لە بەکارهێنانی تەڵاقدا ستەمکارە، لە رێگەی تەڵاقەوە ستەم لە ئافرەت، لە خێزانەکە بەگشتیی ئەکات. نازانم رەوابێ لەوەدا هەوساری بۆ شل بکرێت؟

مامۆستا ساڵح: کچی بەڕێزم! راست ئەکەیت. منیش ئەوە ئەزانم کە هەندێ پیاو هەن بە نەفامانە‌و کوێرانە تەڵاق بەکارئەهێنن.، زیان بە ئافرەت ئەگەیەنن، سەر لە خێزان ئەشێوێنن، تەنانەت ئەو تەڵاقەی ئەبێتە شەڕو ئاشووبە‌و هەراو دژایەتی دروست کردن لەنێوان دوو خێزاندا، بگرە لەنێوان دوو هۆزدا، لەوانەیە هەندێ جار پیاوەکە بەهۆی ئەو هەڵەیەی خۆیەوە سەری تیا بچێت. من ئینکاری ئەم راستییە ناکەم.

بەڵام لەوەدا تاوانی ئیسلام چییە؟ من لەوە سەرم سووڕ ئەمێنێت کە ئێوە وا تێگەیەنراون کە ئیسلام ئەوەی پێکردووە. لەکاتێکا ئیسلام دینی کارچاکیی‌و خۆشەویستیی‌و هاوکاریی‌و هێمنیی‌و برایەتییە، نەک هەر لە چوارچێوەی خێزانێکی بچووکدا، بەڵکو لە چوارچێوەی خێزانێکی گەورەی جیهانییدا. ئیسلام کەی داوای لغاو شلکردنی پیاو ئەکات؟ لە چ ئایەت‌و حەدیسێکدا هاتووە کە داوا بکات لە پیاو ستەمکار بێت بەرامبەر هیچ کەسێ، نەخوازەڵڵا بەرامبەر خێزانی خۆی؟

خوا ژن‌و مێردی بە پۆشاك گێڕاوە بۆ یەكتر نەك بە ستەمكار: (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ) (البقرة: ١٨٧). پێغەمبەر ﷺ كە سەرمەشق (قدوة)ی مسوڵمانانە ئەفەرمووێ: (خیركُم خیركُم لأهله وأنا خیركم لأهلي). تەڵاقدانیشی بەلاوە ناڕەواترین حەڵاڵە: (أبغض الحلال عند الله الطلاق) (أبو داود والحاكم وصححه). ئایا ئەمە لغاو شلكرنە؟

ئاواز: لغاو شلكردنەكە لەوەدایە كە تەڵاقی داوەتە دەست پیاو.

مامۆستا ساڵح: تەڵاقدانە دەست نابێتە بەڵگە بۆ خراپ بەكارهێنانی. وەستا چەقۆی دروستكردووە بۆ شت بڕین، كە من‌و تۆ ورگی خەڵكی پێبدڕین، تاوانەكە هی كێیە، من‌و تۆ، یان وەستاكە؟

رووناك: بێگومان تاوانەكە هی من‌و تۆیە نەك وەستاكە. بەڵام ئەی نابێت من‌و تۆ بە سزای خۆمان بگەین؟

مامۆستا ساڵح: بەڵێ، ئەبێ بە سزای خۆمان بگەین، ئەمە زۆر راستە. جا ئیسلامیش، رێگەی بە (ولی أمر)ی ئافرەت داوە كە تۆڵە (عقوبة)یەكی دارایی بسەپێنێت بەسەر ئەو پیاوەدا كە تەڵاق بە خراپیی‌و ستەمكارانە بەكارئەهێنێ، ئەمە جگە لە چەند جۆرە باج‌و مافێكی تری ئەو ژنە كە ئەكەوێتە سەر پیاوەكە. ئەی ئەمە سزا نییە؟!

## لە تەڵاقدانیشا ئیسلام مافی ئافرەت ئەپارێزێ

رووناك: مامۆستا! گریمان پیاوێك بە ناهەق ژنەكەی خۆی تەڵاقدا، خۆ ئیسلام ئەو پیاوە سەر نابڕێت‌و نایخنكێنێ، ئەی نابێت حیسابێك بۆ ئەو ئافرەتە، بۆ منداڵەكانی بكات؟

مامۆستا ساڵح: ئایا هیچ ئایین، یان یاسایەكی زەمینی لەسەر تەڵاقدان پیاو سەر ئەبڕێت؟ ئەی تۆ بەڵگەت بەدەستەوە هەیە كە ئیسلام هیچ حیسابێكیان بۆ ناكات؟ ئیسلامێك كە بەزەیی بە گیاندارانی سەر زەویدا بێتەوە، تۆ بڵێت بەزەیی بە ئافرەت‌و منداڵەكانیا نەیەتەوە؟

هەروەك زانراوە لە ئیسلامدا مەسروفاتی ژنهێنان ئەكەوێتە سەرشانی پیاو، نەك ژن، ئەو مەسروفاتەش شتێكی كەم نییەو بە هەزاران دیناری تێئەچێت، لەوانە: مارەیی كە یەكێكە لە مافە سەرەكییەكانی ئافرەت. ئینجا ئەگەر پیاوێك بەناهەق ژنی تەڵاقدا، ئەوا ئەو هەموو مەسروفاتەی ئەڕوات‌و بۆی نابژێررێتەوەو ئەبێ مارەییەكەش كە (المهر المؤجل)ە بدات بەو ژنە.

جگە لەوەش پێویستە لە كەلوپەلی ماڵەكە بەشی بدرێت‌و هەرچیش لەو ماڵەدا موڵكی ژنەكە بێت، ئەویش ئەبات لەگەڵ خۆیدا.، تەنانەت هەتا ماوەی چاوەڕوانی تەواو ئەبێت، یان ئەگەر سكی هەبوو ئەو سكەی لێ ئەبێتەوە ئەتوانێ لەو ماڵەدا بمێنێتەوەو هەموو خەرجییەكیش لەسەر ئەو پیاوە بێ. (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ... ) (الطلاق: ١). لە یاسای ژمارە (٢٤١)ی (البقرة)دا ئەفەرمووێ: ((وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ). ئەم مافە پێی ئەوترێت ماڤ (المتعة)، پێویستە لەسەر پیاو كە بیدات بە ئافرەت، هەتا قەرەبووی ئەو زیانەی كە لێی كەوتووە بكرێتەوە بۆی.

نەشمین: مامۆستا! ئەو مەبلەغە ناڵێم خراپە، بەڵام ئەوەندەش گرنگ نییە.

مامۆستا ساڵح: بەپێچەوانەوە، زۆر زۆر گرنگە. چونكە جگە لەوەی گرنگییەكی ماددیی گەورەی هەیەو ئەشكەنجەو پەژارەی جیابوونەوە لەسەر ئافرەت سووك ئەكات، چاكیی‌و دڵپاكییش ئەنوێنێ، بەڵكو گەورەترین گەواهییە لەلایەن پیاوەكەوە بەرامبەر تەڵاقدراوەكە، بەرامبەر پاكیی‌و بێلەكەیی‌و بێتاوانی ئافرەتەكە، ئەوە

دەرئەخات کە ژنەکە بێ نەنگ و لەکە بووە، تەنها ئەوەندە هەبووە ئەو دوو سروشتە نەیانتوانیووە پێکەوە بژین، ئایا ئەمە کاریگەرییەکی ماددیی و مەعنەوی نییە؟

جوان: باشە، ئەو مەبلەغە (المتعة) چەندە؟

مامۆستا ساڵح: فەقیهان لەم رووەوە جیاوازییان هەیە، زیاتر ئەمە کارێکی (إجتهادی)ە، ئەوەندە هەیە نابێت ئەوەندە زۆر بێت کە پیاوەکە لەژێر باریا بناڵێنێ، بەستراوە بە توانای دارایی پیاوەکەوە و بە حاڵەتی ئابووریی ژنەکەوە. واتە بەرزیی و نزمی دارایی، سەرچاوەی ژیانی پیاوەکە ئەو مەبلەغە دیاریی ئەکەن، تەنانەت ئەگەر پێویستی (الضرورة) خۆی سەپاند، ماوەکە بۆ ماوەی یەك ساڵ درێژ ئەکرێتەوە و ژیانی ژنەکە مسۆگەر ئەکرێت.

هەروەها سەبارەت بە منداڵەکانی، ئەگەر شیرەخۆر هەبێت و دایکەکە بیگرێتە لای خۆی، ئەبێ باوکەکە کرێی بەخێوکردنی بۆ ماوەی دوو ساڵ بداتێ، لەکاتێکا منداڵەکەش هی هەردووکیانە، کەچی ماف بەخێوکردنەکەی تەنها لە ئەستۆی باوکەکەدایە. (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ...) (البقرة: ٢٣٣).

ئەو منداڵانەش کە باڵغ نەبوون، ئەگەر دایکەکە بیانگرێتە لای خۆی هەموو جۆرە خەرجییەکیان ئەکەوێتە سەر باوکەکە. دەی توخوا ویژدانی خۆتان راچڵەکێنن، چ یاسایەکی داتاشراو ئەوەندە پەیرەویی ماف ئافرەتی کردووە؟ چ یاسایەك ئەوەندە ورد لەو مەسەلەیەو بەو دادپەروەرییەوە لێکۆڵینەوەی قووڵە؟

{بێدەنگییەکی کورت......}

سکاڵا: خەڵکی نایەوێ تێبگات، بەڵکو هەر مەبەستی دەمەدەمێ و گومان دروستکردنە لە دڵی ئێمەدا.

نەشمین: هیچ وا نییە. تۆ هەر جۆر بیت بە من چی؟ حەز ئەکەی شەوو رۆژ نوێژ بکەو رۆژوو بگرە بۆ خۆت.

مامۆستا ساڵح: پێویست بە توورەبوون لەیەکتر ناکا. رەنگە تۆ وابزانی کە ئیسلام هەر تەنها نوێژکردن و رۆژووگرتن بێت!

## دوو گەواهیدەر (الشاهدان)

رووناك: مامۆستا! قەید ناکات با تەڵاق لە دەرەوەی دادگاشدا بدرێت، بەڵام ئایا فرو فێڵی تێدا ناکرێ؟ تەماشا ئەکەیت کابرایەك ژنەکەی تەڵاق ئەدات و ماوەیك بەرەڵای ئەکا، بەڵام پاش ماوەیەك منەتبار . ئەو پیاوە . ئەبێتەوە، لەبەر ئەوەی کە کەس لەکاتی تەڵاقدانەکەدا لەوێ نەبووە، پیاوەکە زمانەکەی ئەگۆڕێت و تەڵاقەکەی ناکەوێت. دیارە لەم حاڵەتەدا تەنها ژنەکە زیانمەند ئەبێت.

پرشنگ: ئەی بۆچ نەڵێین تەنها ژنەکە قوڕ ئەکرێت بەسەریا و هۆی سەرەکییش لەوەدا ئیسلامە.

مامۆستا ساڵح: هەرچی ئەڵێن سەربەستن، بەڵام ئەبێ لەپێش کردنی قسەدا بیرتان بەلای ژیریی و ژیربێژییەوە بێت. قسە تەنها کردنی مەرج نییە، مەرج ئەوەیە لە تەرازووی ژیربێژیدا سەنگێکی هەبێت.

کچە بەڕێزەکانم! ئیسلام فەرمانی داوە کە لەکاتی تەڵاقداندا . وەك لەکاتی مارەبڕیندا پێویستە . دوو گەواهیدەری دادپەروەری مسوڵمان ئامادەبن: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ) (الطلاق: ٢). (فخر الرازي) لە تەفسیری (وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ)دا ئەڵێت: (واتە فەرمان کراوە کە دوو گەواهیدەر لەکاتی تەڵاقدان و مارەبڕیندا ئەبێ ببن و لەوێ بن).

هەروەها (القرطبي) ئەڵێت: (بۆ تەڵاقدان فەرمان کراوە کە دوو گەواهیدەر و گوتراوە بۆ گێڕانەوە (الرجعة)ش ئەبێ ببن). (الطبري) لە (السدي)دا، لە تەفسیری (وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ)دا نەقڵی کردووە و ئەڵێت: (بۆ

تەڵاقدان‌و گێڕانەوە گەواهیدەر ئەبێ بن). دیسانەوە (الطبرسي) ئەڵێت: (بو رواڵەت (الظاهر) فەرمانکراوە بە بوونی گەواهیدەر لە تەڵاقداندا، ئەوەش لە پێشەوایانی ئالوبەیت (خوا لێیان رازی بێت) گێڕراوەتەوە، ئەوەش بۆ واجیبیەو مەرجێکە بۆ راستیی تەڵاق). (تفسیر الآلوسي/ سورة الطلاق).

دیسانەوە (إبن حزم) لە (المحلي)دا ئەڵێت: (ئەگەر ژنەکەی گێڕایەوەو گەواهیدەری نەبوو، ئەو گێڕانەوە بەپێی فەرمانی خوا نییە). دیسان لەوانەی کە بوونی ئەم دوو گەواهیدەرە لەکای تەڵاقدا بەپێویست ئەزانن: (علی کوڕی أبو طالب، عمران بن حصین، محمد الباقر، جعفر الصادق، عطاء، إبن جریح، إبن سیرین). أبو داود لە (سنن)ەکەیدا لە (عمران بن حصین)ەوە ئەگێڕێتەوە: (پرسیاری لێکراوە لەبارەی تەڵاقی پیاوێکەوە کە ژنەکەی تەڵاق بدات‌و دوایی بچێتە لای، کەچی بۆ هەردوو حاڵەتەکە گەواهیدەری نەبێت. وەڵامەکەی بەم جۆرە بوو: بەپێی سوننەت تەڵاقی نەداوەو بەپێی سوننەتیش نەیگێڕاوەتەوە...).

نەشمین: بەڵام ئایا بوون‌و نەبوونی ئەو گەواهیدەرانە جیاوازیی هەیە؟

مامۆستاساڵح: بەڵێ جیاوازیی هەیە. لەوانەیە بوونیان ببێتە هۆی روونەدانی تەڵاقەکەو چاککردنی نێوان ئەو ژن‌و مێردەو گەڕانەوەی ژیانی سرووشتی لەو خێزانەدا، چونکە گەواهیدەرەکان بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵی تەفرەدان‌و دواخستنی تەڵاقەکە ئەدەن، تەنانەت ئایەتەکە وردە ئیشارەو داکۆکییەکی بۆ ئەم مەبەستە کردووە، چونکە ئەفەرمووێ: (وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجا...) (الطلاق:٢).

جا ئەو قوتاربوون‌و دەرووە لەوانەیە لە روونەدانی تەڵاقەکەدا بێت، بەوەی تەڵاقەکە نەدرێت، چونکە ماناکەی لە تەڵاقدانا، لەکاتی بوونی دوو گەواهیدەردا بەوەوە رێکترە. ئەو ئامۆژگاریی‌و رێنموونی کردنەی ژن‌و مێرد لەلایەن ئەو گەواهیدەرانەوە کەم نییە. لەوانەیە دڵ‌و بیری ژن‌و مێردەکە بگۆڕێت، هۆشیان بکرێتەوەو ئاوەزیان بجووڵێت. یاخۆ لەوانەیە گیروگرفتەکەیان بۆ چارەسەر بکەن. ئەی ئەوە دەروو (المخرج) نییە؟ دیسان توێژەرەوانیش (لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً) هەر بەو پێیە راڤە ئەکەن، واتە هێنانەوەی ژنەکە.

بەڵێ، بوونی ئەو دوو گەواهیدەرە ئەبێتە هۆی کەمکردنەوەو سووککردنی هەر تەنگ‌و چەڵەمەیەك کە لەوانەیە لە دوای تەڵاقدانەکەدا. وەك گوتتان. روو بدات. ئەوکاتەش ئیتر پیاو، یان ژن، هیچکامیان ناتوانێ زمان بگۆڕێت، ئەی ئەگەر زمان بگۆڕن، گەواهیدەرەکان بە درۆیان ناخەنەوە؟ خۆ شەریعەت گوێ لەوان ئەگرێت، نەك دوو هاوسەرەکە.

خۆ ئەگەر ژنەکەی بە رێگای (الرجعة) هێنایەوە، ئەوسا شەریعەت بۆ ئەو ماوەیەی کە ژنەکەی تێدا تەڵاقدراوە، نەفەقە لە پیاوەکە ئەسێنێ بۆ ژنەکە، دیسان ژنەکەش بۆی هەیە مەبلەغی مارەییەکەی لەسەر مێردەکەی زیاد بکا. ئایا ژنەکە قوڕ بەسەریا ئەکرێت، یان پیاوەکە؟ ئیسلام بەم شێوە دادگەرانەیە لای کردووە بەلای ئافرەتەوە، ئایا رێبازە داتاشراوەکان ئەم دادگەرییەیان تێدایە؟ یاخۆ ئەتانەوێ بەبێ بوونی بەڵگە بگەنە (وهو المطلوب)!!

جوان: ئەی ئەگەر لەو کاتەدا گەواهیدەرەکان لەوێ نەبوون...؟

مامۆستا ساڵح: هەرچەند بە گوێرەی جەماوەری فەقیهان بە کۆن‌و تازەیانەوە ئەو تەڵاقە ئەکەوێ، بەڵام بەڕای هەندێ تر ئەو تەڵاقە داهێنراو (البدعة)ەو ناکەوێ، چونکە (وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ)ی تێدا نییە. بۆ زمان گۆڕینیش سوێند ئەدرێن‌و حەواڵەی خوای خۆیان ئەکرێن. لەوانەیە یەکێکتان بڵێت: "لەوانەیە ئەو پیاوە، یان ئەو ژنە، گوێ بە هەق‌و ناهەقی سوێند نەدات". منیش ئەڵێم: "مارەبڕین‌و تەڵاق بۆ کەسێکە کە لە خوا بترسێت، گوێ بدات بە گوناح، حەڵاڵ‌و حەرام بزانێ. کەسێك لەوانەوە دوور بێت، ئیتر مارەیی‌و مارەبڕینی چی! کەوتن‌و نەکەوتنی تەڵاق چی! دیارە هەرکەس لەخوا نەترسێت، هەرچیی بۆ بلوێت ئەیکات".

وەك ئەزانن، منیش باسی مارەکردن‌و تەڵاقدانی مسوڵمانانەتان بۆ ئەکەم، کە لەخوا ترسانی تێدا بێت. ئەگەر ئەمی تێدا نەبێت ئیتر مسوڵمانانەکەی کامەیە؟ ئەوسا ئیسلامیش بەرامبەر تاوان‌و خراپەکاریی ئەو جۆرە کەسانە لەسەر چ ژێربێژێك بەرپرسیارە؟ وا دیارە ئێوە ئەم هەموو لاریی‌و خراپیی‌و دەردانەی ناو کۆمەڵگە بە موڵکی ئیسلام دائەنێن!!

سکاڵا: مامۆستا گیان! دوێنێ شەو تا نزیکەی سەعات دوانزە نەمانهێشت بخەویت. لە بەیانییشەوە سەرو دڵمان گرتوویت، داوای لێبوردن ئەکەین، هەرچەندە ئەوەش ئەزانم کە تۆ بەتەمای پاداشتی خوایت‌و إن شاء الله ماندووبوونەکەت جێی خۆی هەر گرتووە. ئەی حەسانەوەت ناوێ؟

مامۆستا ساڵح: سوپاسی هەستی بەرزو ناسکت ئەکەم. بەڵێ، خوا ماندوویەتی هیچ کەس بزر ناکات‌و پاداشتیشی زۆرەو بەرزترین شتیشە بۆ مسوڵمان، لەبەر ئەوە من هیچ هەستێك بە ماندوویەتی‌و بێزاریی ناکەم لەم کارەدا. هەموو ئادەمیزادێکیش سەربەستە لە باوەڕهێنان‌و باوەڕ نەهێناندا‌و هەڵبژاردنی دراوەتە دەست. (وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ...) (الكهف: ٢٩). ئەنجامی باوەڕهێنان پەیڕەویی کردنی یاساکانی ئیسلامەو بەرهەمەکەی سەربەرزی‌و کامەرانی‌و بەختیارییە لەم دنیایەداو بەهەشتی بەرینە لەو دنیادا. باوەڕ نەهێنانیش بە پێچەوانەی ئەوەوە، ستەمکردنە لەو کەسە خۆی، پێش هەموو کەسێکی تر ستەمکاریش جگە لە ڕەنگ زەردیی‌و ریسوایی نێو ئەم دنیایە، ئاگری دۆزەخ چاوەڕێی ئەکات. (...إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَاراً أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا...) (الكهف: ٢٩).

پرسیارکردن، توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، داچوون لە باس‌و مەبەستا نەك هەر خراپ نییە، بەڵکو زۆر چاك‌و بەکەڵکە، بەو مەرجە بۆن‌و بەرامەی زانست بدات، گیانی زانیاریی بکرێت بە بەرا، گوێ بۆ گرتنی تێدا بێت، ڕێزلە رای یەکتر بگیرێت‌و مەبەستی سەرەکییش گەیشتن بێت بە راستیٍ نەك بۆ یەکتر بەزادن‌و یەکتر بۆڕدان بێت.

## تەڵاقدانە دەست ژن ( التفويض )

ئاواز: هەموو شتێکم بەلاوە ئاساییە، بەڵام ئەوە بووە بە گرێ بەسەر دڵمەوە کە ئیسلام، هەمیشەو لە هەموو کاتێکا تەڵاقی هەر بەدەست پیاوەوە داوەو هیچ کون‌و بوارێکی بۆ ئافرەت نەهێشتۆتەوە تیایا!

مامۆستا ساڵح: نازانم ئێوە بۆچ ئەوەندە لە تەڵاق ئەترسن! دەی کە ئەوەندە ئەترسن، هەواڵ بپرسن. مسوڵمانانە بژین‌و بە مسوڵمانانە شوو بە موسڵمانانە بکەن‌و لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا بجووڵێنەوە، دڵنیابن تەڵاق دوور ئەبێت لێتان. دەی ئەگەر حەز ئەکەی تەڵاق بکەوێتە دەستت، هەر کە شووت کرد منیش بانگ بکە، لەگەڵ خۆما دیارییەکی چاکت بۆ ئەهێنم‌و کارێکیش ئەکەم کە تەڵاق بەدەستی تۆوە بێت، بەڵام ئەترسم هەر کە کەمێك گەرم بوویت یەکسەر مێردەکەت تەڵاق بدەیت‌و ماڵ وێرانی بکەیت.

{ئاوازو نەشمین‌و پرشنگ‌و سکاڵاو جوان، سەرسامی‌و بێدەنگی دایگرتن‌و بزەش کەوتە سەر لێوانیان}

نەشمین: چۆن.. چۆن؟! هەموومان بە شانازییەوە بانگت ئەکەین. بەڵام چۆن؟ ئیسلام تەڵاق ئەداتە دەست ژن! مامۆستا گیان! خۆ کافر نین، هەر هیچ نەبێت بەچکە موسڵمانین، بە مسوڵمانانەیش شوو ئەکەین. هەرگیز دڵیشمان نایەت مێرد تەڵاق بدەین، بەڵام ئەوە چۆن ئەبێت؟!

مامۆستا ساڵح: لە ئیسلامدا لە دوو حاڵەتدا تەڵاق ئەدرێتە دەست ژن:

أ- تەڵاقدانەدەست (التفويض): ئەمە لە فیقهدا بە درێژیی باسکراوە، بەکورتی بەمجۆرەیە: پیاو بە ژنەکەی ئەڵێت (خۆت هەڵبژێرە بە (إختاري نفسك) یان ئیش‌و کارت لەدەستی خۆتا بێت (أمرك بيدك)، یان گەر ویستت

خۆت تەڵاقبدە (إن شئتِ طلقي نفسك). بەمە ژن ئەتوانێ تەڵاقی مێردەکەی بدات، ئەگەرچی لە کەوتنی ژمارەی تەڵاقدا زانایان لەمەدا جیاوازییان هەیە.

ڕووناك: بەڵام ئەمەم قەت نەبیستووەو نەشمدیووە!

مامۆستا ساڵح: تۆ کە لە ئیسلام خۆت دوور بگریت، چۆن شتی وا ئەبیستیت؟ ئەها کە تالبی ڕەخنەبازیی بوویت لە دژی ئیسلام، ئەوەتا هەموو جۆرو شێوە ڕەخنەیەك بەناهەق لە ئیسلام ئەگریت! بێگومان ئادەمیزاد بەدوای هەرچیدا بگەڕێ ئەوە فێر ئەبێت. قابیلە لەلای دارتاش بەرگدوورین فێر ببیت؟

جوان: تۆ گوتت لە دوو حاڵەتدا تەڵاق ئەدرێتە دەست ژن.، کەچی باسی یەك حاڵەتت بۆ کردین. ئەی ئەوی تریان؟

ب- هەروەها ئیسلام مافی تەڵاقی بە ئافرەت بەخشیووە ئەگەر لەکاتی مارەبڕیندا ژنەکە مەرج بکات لەگەڵ مێردەکەیا، چونکە بۆی هەیە لەو کاتەدا هەموو مەرجێکی ڕاستی شەرعیی لەگەڵدا بکات. جا هەرکە مێردەکە لە یەکێ لەو مەرجە ڕاستانە پاشگەزبۆوە، ژنەکە ئەتوانێ خۆی دابڕێنێت لێی. ئەمەش ڕاڕەوی حەنبەلییەکانەو بەڵگەشیان چەندان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺو بەسەرهاتی ترە کە جێنشینانو زانایان لەسەری ڕۆیشتوون، لەوانە: (أحق شروط أن يوفى به ما استحللتم به الفروج) (حديث صحيح، رواه البخاري ومسلم). وە (المسلمون على شروطهم) (حديث صحيح، رواه البخاري ومسلم). لەوەش بەهێزتر: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ) (المائدة: ١).

ئەم جۆرەیان پێی ئەوترێت تەڵاقی مەرجدار (المشروط)و بە شەرعیی ئەژمێررێت، چونکە حەڵاڵی تێدا حەرام نەکراوەو بەرژەوەندیی ئافرەت ئەپارێزێتو گوتراوە: (ما كان من مصلحة العاقد كان من مصلحة عقده).

هەروەها ئەگەر ئافرەت ناچیزە بووو خۆی ددانی بەو ناچیزەییەدا نا لەلای دادوەرداو داوای تەڵاقی کرد، دادوەر حوکمی بۆ ئەداتو تەڵاق ئەدرێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەبێت خەرج و مەسرووفاتی پیاوەکە ببژێرێتەوە. ئەمەشیان پێی ئەگوترێت خۆداماڵین (الخُلع). ئەمەش بەزۆری مالیکییەکان پەیڕەویی ئەکەن.[1]

جگە لەوەش ئیسلام مافی بە پیاوو ژن لە تەڵاقدانا بەخشیووە لەکاتێکا کە بۆی دەربکەوێت هاوسەرەکەی زیانی پێ ئەگەیەنێت وەك: مەسرەفنەکێشان لەلایەن پیاوەوە، یان نەخۆشییەکی درم کە چاکبوونەوەی نەبێت، یان بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوسا چاکبوونەوەی بۆ ببێ، یان دوورکەوتنەوەو بزربوون بۆ ماوەی ساڵێك یان زیاتر، یاخۆ نەخۆشییەك کە ببێتە مایەی قەدەغکردنی جنسیی. جا نازانم بیروڕاتان چیو چۆنە؟!

سکاڵا: بەڕاستی ئیسلام زۆر زۆر دوورە لەو باسانەوە کە بە ئێمە گوتراون. ئای درۆو پڕو پاڵانتەمان بیست! تەنیا داوایەك کە هەمە، ئەوەیە خوای گەورە لەو قسانەی لەمەوبەرم کردوومن خۆش ببێت!

مامۆستا ساڵح: خوا لە گوناهی نەزان خۆش ئەبێت. ڕابردوو ڕۆیشتو گوێی بۆ شل مەکە. گرنگ ئێستا و لەمەودوایە، گەر بتەوێتو لێبڕێیت، ئەتوانی خوا لە خۆت ڕازیبکەیتو قەرەبووی لەمەوبەریش بکەیتەوە. ئاییندارییش کاتێ بە تامە کە دڵو مێشك پێی قایل بنو شارەزایی ئامێتەی بێت. تۆیش دڵنیابە إن شاء الله بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ئەکەویت: (كُلُ إبن آدم خطاء وخيرُ الخطّائين التّوابون) (رواه الترمذي وإبن ماجة والحاكم عن أنس).

1 – الطلاق بين الفقه والقانون/ ابراهيم لنعمة، فقه السنة ج٢/ السيد سابق، المرأة في القرآن ولسنة/ محمد عزة دروزة.

## فێڵ لەگەڵ خوادا ناکرێت

رووناک: بیستوومە هەندێ پیاو کاتێ نەخۆش ئەکەون، یان پێش ئەوە، بە ئاشکرا، یان بە دزیی ژنەکەیەوە شایەت ئەگرێتو ئەڵێت: سێ رۆژ لە پێش مردنما سێ بەسێ تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ژنەکە لە میرات بێبەش بکرێت. کەچی ئەو فێڵبازە ئەو فێڵەی بۆ ئەچێتە سەر.

مامۆستا سالح: بەڵێ، رووداوی وەها روویداوە، بەڵام ئەو جۆرە پیاوانە ئەوە فێڵ لەخوائەکەن، نەك لە ژنەکەی. چونکە میرات خوا دیاریی کردووە بۆ ئافرەت، نەك ئافرەت بۆ خۆی. (وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ) (آل عمران : ٥٤ ).

جا ئەو پیاوەی کە ئەو فێڵە بکا، ئیسلام بە پێچەوانەی مەبەستی ئەو پیاوەوە ئەجووڵێتەوە. بەپێی راڕەوی پێشەوا (أحمد بن حنبل) ئەو ژنە دوای مردنی ئەو پیاوە ئەگەر شوو نەکات میراتی بۆ دێتەوەو بێبەش ناکرێت. پێشەوا (مالك) لەمەدا هەنگاوی بەرەو پێشتر ناوەو ئەفەرمووێ لەو پیاوەو لە مێردی تازەیش ژنەکە میراتی بۆ دێتەوە.

بەمجۆرە فێڵی ئەو پیاوە پووچەڵ ئەبێتەوەو بە ستەمکاریش دائەنرێت. جگە لەمەش، لەوانەیە ئەو پیاوە دوای ئەو ماوەیە چەند جارێك بکەوێتە لای ژنەکەی، ئایا ئەوە زیناکردن نییە؟ ژنەکەی بێئاگایەو بە هیچ نازانێت، لەبەر ئەوە ئەو هیچ گوناهێکی نایەتە سەرو تاوانبار نابێت لای خوا، بەڵام پیاوەکە تاوانبارەو سزای سەختی دۆزەخ چاوەڕوانیەتی.

نەشمین: جا من هەر لە سەرەتاوە تەڵاق لەدەستی کابرا وەرئەگرمو ئەیکەمەماڵی خۆم، ئیتر لەو فێڵکردنەدا چەك کراوو بێ دەست ئەبێت.

ئامینەخان: مامۆستا نەشمین کاری هێقمە، رێگای خۆت دۆزییەوە!

## ئەگەر کەوتبێ پارە چاکی ناکاتەوە

پرشنگ: خۆمان بە بەختەوەر ئەزانین کە لەگەڵ کەسێکی سنگفراوانی هێمنی وەك تۆدا کۆببینەوەو بتوانین بەم راستەو روویيە ئەوەی ئەیزانین بیخەینەڕوو، لەکاتێکا هەست بە تووڕەبوونێك، یان بێزارییەك ناکەین لە لایەن تۆوە!.

جا بۆیە ئەوێرم لە رووتا بڵێم: دیاردەیەکی ئاشکرا هەیە کە زۆربەی خوێندەوارو نەخوێندەوار هەستیان پێکردووەو لێی ئەدوێن، ئەویش ئەمەیە: کابرایەك تەڵاقی بەدەمدا دێتو ئەکەوێت. ژن ماڵ بەجێ ئەهێڵێ. پاش ماوەیەك ژنەکە، یان پیاوەکە هەست بە پەشیمانیی ئەکات، یان هەردووکیان لە ناخەوە هەست بە پەشیمانی ئەکەنو مەیلی ئاشتبوونەوەو یەکگرتنەوەیان هەیە. بۆ ئەمەیش پیاوەکە ـ گەلێ جار ژنەکەش ـ دەسەوداماني مەلا ئەبێتو ئەکەوێتە کڕوزانەوەو پاڕانەوە، بەڵام مەلا داوای پارەیەکی زۆری لێ ئەکا. گەلێ جار لە توانای ئەو پیاوەدا نییە، لەوانەیە نیوەی ئەوەی بۆ هەڵسووڕێت. کەچی مەلا پێی ئەڵێ بەوەندە چاك ناکرێتەوە. جا لێرەدا ئەپرسم: بۆچ بە ملیۆنێك تەڵاقەکە چاك ئەکرێتەوەو بە نیو ملیۆن چاك ناکرێتەوە؟!

مامۆستا سالح: پێشەکی، ئەم جۆرە قسانە زۆر زیادەڕەوییان تێدا ئەکرێتو زیادەیان پێوە ئەبەستن، من مەلا نیمو مامۆستایەکی قوتابخانەم وەك تۆ، ئەمەش نەك بڵێیت بەرگری لەخۆت ئەکەی، بەڵام ئەبێ بۆچ هەمیشە هەوڵی بەدناوکردنی مەلا بدەین؟ هەر لەبەر ئەوەی کە بۆنی ئایینیان لێوە دێت؟! من ناڵێم مەلا هەموویان پاكو بێ گەردن، فریشتەن، ئەگونجێ خراپیان تێدا بێت، بەڵام ئەبێ بۆچ هەر ئەو خراپەیان ببینینو بیکەین بە نوێنەری

خواو پێغەمبەرو مەلاکانی تر؟ ئەی ئەوە بۆچ باسی چاکەیەکیان نەکەین؟ ئەی هەموو چینەکانی تری کۆمەڵ بێ لەکەن؟

لەلایەکی ترەوە، بۆمبی ئەتۆمی بەرهەمی زانیاریی (علم)ە، ئەمریکا دووانی دا بەسەر شاری (هێرۆشیماو ناکازاکی)ی یابانیداو نزیکەی دوو سەدو بیست هەزار (٢٢٠)هەزار کەس کوژرا، ئایا لەو تاوانەدا کێ تاوانبارە، زانیاریی، یان ئەمریکا؟ زانیاریی گوتی بە ئەمریکا کە ئەو تاوانە بکات؟!

ڕووناک: ئاشکرایە لەو تاوانەدا زانیاریی بێبەشەو تاوانەکە هی ئەمریکایە.

مامۆستا ساڵح: ئەی لە پارە خواردنی ئەو مەلایەدا ئیسلام چ تاوانێکی هەیە؟ ئایا ئیسلام پێی گوتووە بە ملیۆنێك دینار نەبێت تەلاقەکە چاك نەکەیتەوە؟ من نازانم کە ئەم خەڵکە زۆر بە وردی ئەگەڕێت بەدوای نەنگ و کەموکوڕیی مەلادا، جا ئەگەر لە سەدا یەکێکیان خراپ بوو، ئەوە یەکسەر ئەو خراپە ناو ئەنێن ئیسلام!!

بۆ مەسەلەی پارەکەیش، ئەگەر مەلاکە مەبەستی ئەوە بێت وانەیەکی ڕەقی ئەو پیاوە دابدات تا ژیر ببێت و جارێکی تر وشەی تەلاق بەدەمیا نەیەت، ئەمەیان خێری خێزانەکەی تێدایەو خەریکە بڵێم دەك دەستی خۆش بێت.

جوان: بە خوا ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ، حەز ئەکەم دوو ملیۆنیشی لێ بسێنێ.

مامۆستا ساڵح: بەڵام ئەگەر تەنها مەبەستی پارەکە بێت، منیش وەك ئێوەو زۆربەی تری خەڵك گلەیی لێ ئەکەم. دیارە خۆیشی ئەزانێ کارەکەی گوناحەو ڕۆژی دواییش دێتە پێشەوەو کەس ناتوانێ هیچ شتێك لەخوا بشارێتەوە.

بەهەر حاڵ، تەلاق ئەگەر کەوتبێ بەك ملیار دیناریش ناتوانێ چاکی بکاتەوە، ئەگەر نەشکەوتبێ، ئەوا بەبێ پارەیش چاك ئەکرێتەوە. خۆ خانوو نییەو تازە بکرێتەوەو پێویستی بە بەردو چەوو لمو چیمەنتۆو شیش بێت!، بەڵکو هەندێ قسەی شەرعییەو هیچیان تێناچێت.

بەڵام ڕۆڵە گیان! ئەی ئەوە بۆچ هەموو جۆرە نەنگ و شوورەیی و ساختەو فڕوفێڵێك لە هەموو لایەنەکانی تری کۆمەڵداو لە هەموو سەرێکەوە ئەبینین و یەخەمان ئەگرن، کەچی هەر بیریشیان لێناکەینەوە؟ ئەی بۆچ سەبارەت بەم هەموو لاریی و ناهەمواریییەی کۆمەڵگە ڕاناچڵەکێین؟! ئەی بۆچ لە هیچی هیچ نەبوو ئەمانەوێ ئیسلام بەدەستی خۆمان بەدناو بکەین؟!!

لە فڕوفێڵی ڕێوی بێ خەمین

لەگەڵ گەلە گورگ ئاشناو هاودەمین

لە خشەی مێروولە سڵ ئەکەینەوە

بە دیداری ئەو مۆن ئەبینەوە

ئای کە قەومێکی بیر تەسك و سادەین

بۆیە بە گەنجی پیری ئۆفتادەین

سکاڵا: خوا یاربێت لەمەودوا ڕێوی و گەلە گورگ و مێروولە لە یەکتر جیائەکەینەوە. خوا پاداشتی تۆیش بداتەوە. وا بزانم کاتیش درەنگەو خەریکە نوێژی هەینی نزیك بۆتەوە.

## تەنها یەك خوا

ڕووناك: مامۆستا! زۆر سوپاست ئەكەین كە بەشدارییت كردین لە وتووێژەكەدا، بەڵكو بوویتە سەرپەرشتیارو تەوەرە لە باسەكاندا، بێگومان كەڵكمان وەرگرت و سوودمەند بووین، گەلیٚ گرێمان بۆ كرایەوە و چەندان گومان و تاریكایی ڕەوینەوە.، خۆزگە كاتەكەمان زیاتر بووایە! بەڵام تەنها یەك داوام هەیە لەم كۆتایی باسەدا.

مامۆستا ساڵح: فەرموو، حەز ئەكەم بیزانم. هەر ئەوەندە ڕەوا بێت و بە من جێبەجیٚ بكریٚ، إن شاء الله دریٚغی ناكەم.

ڕووناك: وەك ئەزانین نیوەی ساڵ نزیك بۆتەوە، دیارە ئێمەش كاتی بیٚ ئیشیمان دەست پێئەكات، ئینجا ئەگەر تۆ پەیمانمان بدەیتیٚ حەزئەكەم یەكتر ببینینەوە و سوودت لێوەربگرین. خۆ ئەگەر جەنابت و مامۆستایان ئامادەبن، من ئامادەم ئەم كۆڕە بەرینە ماڵی خۆمان و هەموو خزمەتێكیش ئەخەمە سەرشانی خۆم بەوپەڕی شانازییەوە.

{هەموویان پێكەوە: ئامادەین.. ئامادەین}

مامۆستا ساڵح: پێشنیازەكەت بە خراپ نازانم.، خوا ڕێكی بخات، بەڵام بەو مەرجەی مەبەستی هەموو لایەكمان توێژینەوەو لێكۆڵینەوە بیٚ، گەڕان بیٚ بەدوای ڕاستییدا، نەك دەمەقاڵەو گەڕەلاوژیٚ بێت.

نەشمین: توخوا مامۆستا گیان! داواكەمان ڕەت مەكەرەوە.

سكالاَ: ئەو مەرجەشی تێدا بێت هەركەس لە ڕێڕەوی زانیارییانە لایدا ئاگاداری بكەینەوەو ماف قسەكردنی نەمێنیٚ.

مامۆستا ساڵح: پێشنیازەكەی سكالاَ خانیش جوانە. پێویستە لە ئاداب و ڕێگای ڕاست نەچینە دەرەوە.

بەڵام من حەز ئەكەم ئەو كۆڕە هەر لێرەدا، لەماڵی ئێمەدا ببەسترێت، جا داوا ئەكەم لە مامۆستا ڕووناك كە بەگوێم بكات و داواكەم نەسووتێنیٚ.

ڕووناك: داواكەت بەسەر سەرم، بەڵام ئەترسم ببین بە بارو زەحمەت بۆتان، بەڕاستی ئەركێكی كەم نییە ئەوە.

مامۆستا ساڵح: ئەرك لە ڕێی خوادا خەڵاتە، هەقی ئەوەتان نەبێت.

{لەدوای خواحافیزی ئەچنە دەرەوە} .

# ژیان له سایەی ئیسلامدا

ماموستا سالح: سوپاس‌و ستایش تەنیا شایانی خوای پەروەردگارمانە، بارانی سەلاەت‌و سەلامیش بە خوڕ ببارێتە سەر گیانی پاکی پێغەمبەر، لەویشەوە سەرواز بکات بۆ گیانی شوێنکەوتوانی‌و بۆ ئەوانەش کە بە شوێن (ڕاستیی)دا ئەگەڕێن.

ڕۆڵە شیرینەکانم، زۆر چاك ئەزانم کوفرو دامودەزگا زۆرو جۆربەجۆرەکانی ئەوەندە تەڵەو داميان ناوەتەوە کە بتوانن بەشێکی زۆر لە موسوڵمانانیان پێ ڕاو بکەن، خۆ ئەگەر بۆیان نەگیرێن، هەر هیچ نەبێت تۆوی گومان لە دڵیاندا ئەچێنن، جا بمانەوێ‌و نەمانەوێ ئەو گومان دروستکردنە کارێکی کەم‌و سادەو ئاسان نییە، بەڵکو ئاڵۆزو مەترسیدارەو ئەنجامێکی ڕەشی بە دواوەیە، لەبەرئەوە حەز ئەکەم لە دەربڕینی هەموو بیرو گرێیەکدا دۆغریی (صريح) بن‌و لە دڵ‌و مێشکتانا نەیان هێڵنەوە، ئەی گەڵێ جار هۆی کەوتنەوەی ئاگرێکی گەورە دەنکە شقارتەیەکی بچکۆلانە نییە؟ بۆچ بچووکترین گیروگرفت‌و گرێ لە دڵمانا بمێنێتەوە؟

دیارە لێکۆڵینەوە – لە هەر ڕوویەکەوە بێت – ئەبێ ڕێزگرتنی دوولایەنی تێدا ڕەچاو بکرێت، گوێگرتن لە یەکتر پەیڕەویی بکرێت، مەبەست لەو باس‌و لێکۆڵینەوەیە پەی بردن بێت بە ڕاستیی نەك بۆ یەکتر بەزاندن بێت‌و لەسەر شێوازی گەڕەلاوژێ بێت.

حەز ئەکەم پێتان بڵێم، من موسڵمانم، قوتابییەکی قوتابخانەی ئیسلامم، هەموو شتێك بە تەرازووی سەرنەکردووی ئیسلام ئەپێوم، ئەوەی ئەیڵێم لە وەڵامی پرسیارەکانتاندا لە دەریای ئیسلام، بە پێی توانای خۆم هەڵمگۆزیوە.

ڕۆڵە بەڕێزەکانم سەراپای بوونم پاڵم پێوە ئەنێت کە پێتان بڵێم: ژیان لە سایەی ئیسلامدا – بۆ نێرو بۆ مێ – نیعمەتە، نیعمەتێك هەرکەس نەیچێژێ تامی نازانێ، نیعمەتێك تەمەن بەنرخ ئەکات، پیرۆزی ئەکات، ئەیپاڵێوێ‌و فەڕو بەرەکەتی تێ ئەخات.

ئادەمیزاد کە لە سایەی ئیسلامدا ئەژی، خۆی لە بەرزاییەکدا ئەبینی، لەوێوە ئەڕوانێتە خوارەوە، ئەبینێ نەفامیی لەسەر زەوییدا شەپۆل ئەدات، پێکەنینی دێت بەو بایەخدانە وردیلانەی کە کۆمەڵگەی نەفامیی پێوەی پەشۆکاوە، ئەبینێ ئەو کۆمەڵگەیە زانیارییەکەی، بۆچوونی، بایەخدانی بە شت، هەموی منالآنەیە، ئەمجا سەری سوڕئەمێنێ‌و ئەپرسێ، ئەم خەڵکە چیەتی؟ بۆچ بە هەردوو پێ چۆتە ناو ئەوە قوڕو لیتەوەو وەها چەقیوەتە ناوی؟ بۆچ گوێی ناکاتەوە بۆ بیستنی بانگەوازی خوای بەدیهێنەر؟

بەڵی، ئادەمیزاد کە بە موسڵمانانە لە سایەی ئیسلامدا ئەژی، بوون زۆر بە فراوانی ئەبینێ، فراوانتر لەم بەشەی کە بە چاو ئەیبینێ، جیهانی دیارو نادیار ئەبینێ، نەك تەنها جیهانی دیار، دنیاو قیامەت ئەبینێ، نەك هەر تەنها دنیا، هەروەها بۆی دەردەکەوێ کە مردن کۆتایی گەشتەکەی نییە، بەڵکو قۆناغێکی ڕێگای گەشتەکەیەتی، ئەوەی لەم سەرزەوییەدا دەستی ئەکەوێت، هەموو بەشێکی نییە، بەڵکو هەندێکە لەبەشەکەی، جا ئەوەی لێرەدا لەدەستی دەرئەچێ، لەوێ (لە قیامەتا) لەدەستی دەرناچێت. چونکە ستەم‌و مافخوران‌و ئاوەڕووتکردن لەوێدا جێیان نابێتەوە: (فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ) (الزلزلة: ٧).

ئادەمیزاد کە بە موسڵمانانە لەسایەی ئیسلامدا ئەژی، ئەبینێ ئادەمیزاد زۆر زۆر بەڕێزترە لەو هەموو نرخ و ڕێزانەی کە یاسا داتاشراوەکانی سەردەمی کۆن‌و ئێستا بۆیان دیاری کردووە. گیانلەبەرێکە، ڕێزی نەفخەی خوایی گرتۆتە خۆی، خاوەنی گیانێکی تایبەتی پاکە، ئاژەڵانی تر لەو گیانە بێبەشن، هەر لە سەرەتای بەدیهاتنیەوە ڕێزی لێگیراوە، فریشتەکانی ئاسمان بەپێی فەرمانی خوا کڕنووشیان بۆ برد. (فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ) (الحجر: ٢٩).

بەڕاستی باسەکە ئەوەندە گەورەو بەرز و گرنگە، زمان لەباسکردنیا، خامە لە نووسینیا، دەستەوسان ئەوەستن. ژیان لە سایەی ئیسلامدا مەگەر کەسێك بیزانێ کە چەشتبێتی، تامی کردبێ، داوا ئەکەم لە خوای میهرەبان دڵتان بکاتەوە، ویژدانتان راپەڕێنێ، مێشكو بیرو هۆشتان بێدار بکاتەوە، تا بە موسڵمانانە، لە سایەی ئیسلامدا بژینو تامی ڕاستەقینەی ژیان بزانن.

## جاشکردنەوە (التحليل)

نەشمین: لە پرسیارکردنا، من ئەمەوێ دەست پێش بخەم، ڕاستییەکەی دەمێکە پرسیارێك لە مێشکما گینگڵ ئەدات.

بیستوومەو ئەڵێن: هەندێ جار ژن و مێرد تەڵاقیان ئەکەوێت، پەیوەندیی شەرعییان بەتەواویی ئەپچڕێت، بەڵام پاش ماوەیەك هەست بە پەشیمانی ئەکەن، حەز لە یەکگرتنەوە ئەکەن، بۆ ئەمەش ئەچنە لای ئەم مەلاو ئەو مەلا. کاتێ زانیان تەڵاقەکەیان چاك ناکرێتەوە، پەنا ئەبەنە بەر ڕێگەیەکی قێزەون کە پێی ئەوترێت جاشکردنەوە، بەو جاشکردنەوەیە ئەبنەوە بە هاوسەر؟

مامۆستا ساڵح: ڕاستە، ئەوە هەیەو ئەکرێت. بەڵام بۆچ قێزەونە؟

نەشمین: ئەی باوکە گیان! بۆچ قێزەونە!! بەڕاستی هەرچی بیر لەو کارە ئەکەمەوە، خەریکە لە شەرما ببم بە یەك دڵۆپە ئاو و بچم بە ناخی زەویدا، ئای کە کارێکی ناشیرینو ناپەسندە.

مامۆستا ساڵح: سەیرە! تۆ بۆچ ئەوەندە بە هەڵچوونەوە باسی ئەکەیت؟ چۆن ئەو حوکمە ئەدەیت بەسەر باسەکەدا؟ ئەو کارە چ نەنگێکی تێدایە، تا بە قێزەونو ناشیرین ناوی ببەیت؟

نەشمین: مامۆستا گیان سەرزەنشتم مەکە، ئەوە کەی چارەسەرە؟ تۆ هەر خۆت بیهێنەرە بەرچاو، بیری لێ بکەرەوە، ئەبێت مێردە بەدبەختەکەو ژنە قوڕبەسەرەکە، کەسوکاریان قایل بکەن یاخۆ بە دزییەوە، هەردووکیان بگەڕێن بە شوێن کابرایەکی شێتۆکە ڕەنگی چڵکنی کوڵکنی بێ قابلییەتدا، ئینجا ئەو ژنە بەدبەختەی بۆ ماوەی شەوێك یان دوو شەو لێ مارە بکەن، هەقی مارەبڕینەکەشی بدەن، شەو بچێتە لای، لەولایشەوە بزەی چاوی مێردەکەی بێت، لەوەش زیاتر پارەی بدەنێو زۆر مەمنوونی بن. مەرجیشی لەگەڵ بکەن کە بەیانی تەڵاقی بداتەوە، جا دوای ئەم هەمووە مێردە ملشۆڕەکەی مارەی بکاتەوە، ئۆی کە کارێکی گەندە! ئۆی کە قێزی لێ ئەکەمەوە، نازانم ئیسلام چۆن ڕێگەی بەم کارە داوە، نازانم!

ئاواز: باوەڕ ناکەم ژیری سەدەی بیستەم ئەم کارە پەسەند بکات.

پرشنگ: بەڵام ئەوەتا ئیسلام پەسەندی کردوە.

مامۆستا ساڵح: پرشنگ خان، لەدەریایەکدا مەلە مەکە کە نقوم بوونت مسۆگەر بێت، قسەی خەڵکی نابێت بە موڵك بەسەر ئیسلامەوە.

هەڵکەوت: مامۆستا گیان! ئەوەی کە نەشمین گوتی، قسەی خەڵك نییە، بەڵکو لە قورئانا هەیەو بەچاوی خۆم دیومە، بەڵام دەقەکەیم چاك لەبەر نییە، بێگومان خۆت لەبەرتە. ئەی ناڵێت حەڵاڵ نابێتەوە بۆی هەتا شوو نەکات بەپیاوێکی تر؟

مامۆستا ساڵح: لاإله الا الله! ئەزانم کام ئایەت ئەڵێیت.. ئەزانم. دانی پیادا ئەنێم کە موژدەدەران (المبشرين)ی گاور زۆر چاك پەیڕەویی وتەکەی ئۆسقۆف (دی میستیل)یان کردووە کە لەم ڕووەوە گووتوویەتی: "ئەو ئامانجەی کە پێویستە لەسەر موژدەدران بەدی بهێنن، ئەوەیە ئەو یەکگرتنە بەهێزەی کە ئیسلامی پێوە

بەناوبانگە، وردو خاش بکرێت . یان بەلایەنی کەمەو . ئەو هێزە لاواز بکرێت. پێویستە لەسەر موژدەدەر کە دیراسەی قورئان بکاتو لێی تێبگات."[1].

بەڵێ، موژدەدەران دیراسەیان کردو لێی تێگەیشتنو چەندەها ڕاستییان هەڵگێڕایەوەو پێچەوانەیان کردنەوەو ئەمجا خستنیانە بەردەستی بەچکە موسڵمانان، ئەمانیش بە کوێرانەو بێ دیراسەکردن خستنیانە "گەنجینە"ی بیریانەوە. هەروەك ئەگەر بێتو خۆیان دیراسەی قورئان بکەن، تووشی سکێشە بن! سەیرە! خەڵکی لای ئێمە قسەی کابرایەکی گاور، جولەکە، یان خوانەناس یەکسەرو بێ چەندو چۆن ئەقۆزێتەوە، بەڵام فەرموودەی خوا ئەخاتە پشت گوێو لا ناکات بەلایەوە، لە کاتێکا باوەڕیشی بە خوا هەیە.

هەڵکەوت: مامۆستا! باوەڕم بە خوا هەیە. بەڵام ئەوەش کە گوتم لە قورئانا دیومەو هەیە، ئیتر قسەی گاورو جولەکەی چی؟

مامۆستا ساڵح: کاك هەڵکەوت: ئەوەی کە دیوتە، لێی تێنەگەیشتوویت، لەوەش زیاتر بە پێچەوانەوە لە خەڵك وەرتگرتووە، ئەوەتا بووە بە گومانێك لە دڵتاو جێی خۆی کردۆتەوە لە بیرو هۆشتا .

## حەلاڵبوونەوە نەك جاشکردنەوە

مامۆستا ساڵح: ڕۆڵە شیرینەکانم، ئەوەی کە بە ئێوە گەیەنراوەو ئێوەش ئێستا بە لەکەیەکی ناوچاوی ئیسلامی ناو ئەبەنو بەشێوەی گومان لە دڵتانا ڕیشەی داکوتاوە، پێی ناگوترێت حەلاڵبوونەوە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتا کارێکی ئیسلامیی نییەو لەسەر بناغەی فروفێڵو درۆو دەلەسە دامەزراوە.

بەڵی، لە ئیسلامدا حەلاڵبوونەوە هەیە، بەڵام جاشکردنەوە نییە. ئەوەش کە کاك هەڵکەوت ئەیڵێ، یاسای ژمارە (٢٣٠)ی سوورەتی (البقرة)یە کە ئەفەرمووێ: (فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢٣٠).

هەڵکەوت: دەم خۆش .. دەم خۆش، ئەوە خۆیەتی!

نەشمین: مامۆستا گیان! حەلاڵبوونەوەو جاشکردنەوە یەك شتن.

مامۆستا ساڵح: کاك هەڵکەوت ئایا باوەڕت بەو ئایەتە هەیە؟

هەڵکەوت: ئەی چۆن باوەڕم پێی نییە؟ فەرمودەی خوایە.

مامۆستا ساڵح: وابزانم ئەزانن کە پیاو ئەتوانێ دووجار ژنەکەی تەلاق بداتو بیهێنێتەوە، بەڵام کە جاری سێیەم تەلاقیدا، ئیتر بە تەواویی لە یەکتر ئەپچڕێنو تەکوجمیان نامێنێ.

سکالا: ئەمەیان ئاشکرایە، هەموومان . جگە لە هەڵکەوت . ئەیزانین.

مامۆستا ساڵح: دەی ڕۆڵەکانم، یاساکە ئەفەرمووێ: "ئەگەر پیاوێك . بۆ جاری سێیەم . ژنەکەی خۆی تەلاقدا، ئەو ژنە نابێتەوە بە حەلاڵی تا مێردێکی تر نەکات، ئەمجا ئەگەر مێردەکەی . واتە مێردی دووەمی . تەلاقیدا، ئەوە گوناح نییە، ئەگەر لەگەڵ مێردی یەکەمیا بگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر . بێگومان بە ڕێگەی شەرعیی . بەو مەرجەی دڵنیابن کە ئەتوانن لە سنووری یاسای خوا دەرنەچن".

[1] روائع الاسلامية: إبراهيم النعمة. ألأسقف دى ميستيل هو: وكيل إدارة البعثات التبشيرية في الشرق بروما.

ئەمەش حیکمەتی زۆرو جۆر بە جۆری گەورەی هەیە، کەفوکوڵی دەروونی ئادەمیزادی تێدا ڕەچاو کراوە، قولایی ناخی ئادەمیزادی بەوردی پێکاوە، لەهەمان کاتیشا ژیرکردن (تأدیب)ێکە بۆ ژن و مێرد، تا لە بەکارهێنانی تەڵاق سڵ بکەنەوەو بترسن. چی لەوە تاڵ و ترش و پڕ لە زەحمەتتر هەیە کە پیاو هاوسەری ژیانی خۆی لە باوەشی کابرایەکی تردا ببینێ؟

پرشنگ: دەی مامۆستا، باسەکەی تۆ هیچی لە دیاردەکە نەگۆڕی.

مامۆستا ساڵح: پرشنگ خان، تۆ لە فیقهی ئیسلامیی بێئاگایت، چونکە نە خوێندووتە، نە خوێندووتەوە، کەوابێ لێی نازانی، ئەوەتا یاسا یاسا قورئانییەکەش ئەفەرمووێ، ئەم یاسایانە بۆ قەومێکن کە لێیان بزانن. ".. وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ". ئێمەش هێشتا لەسەرەتای باسەکەداین، ئەمەوێ وردە وردە بیدەینە بەر تیشکی شیکردنەوە، ئەگەر مۆڵەتم بدەن، خوا یاربێت بۆتان ڕۆشن ئەکەمەوەو تێتان ئەگەیەنم.

هەڵکەوت: ڕاستییەکەی من ئەمەوێ لە ڕاکەی خۆم پاشەکشێ بکەمەوە.

جوان: خۆزگە باسەکەت ئاسان بکردایە بۆمان! قورسە بەلامەوە.

سکالا: باشە، ئەو ئافرەتە چۆن ئەگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەمی؟

مامۆستا ساڵح: جەماوەری زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە حەڵاڵبوونەوە ئەبێ ئەم پێنج مەرجەی لەگەڵدا بێت:

١. ئەبێت تەڵاقدراوەکە لە پیاوی یەکەمی ماوەی چاوەڕوانیی (العدة)ی تەواو بکات، ئەگەر سکی پڕبوو، ئەبێ منالی ببێت.

٢. بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕێکوپێک‌و ئامادەبوونی وەلی ئەمری‌و دوو شایەت، لە پیاوێکی تر مارە بکرێت‌و وەك ژنی تر بگوێزرێتەوە.

٣. لەنێوان ئەو ژن‌و مێردەدا، بە کردارەوە پەیوەندیی ژن‌و مێردایەتیی (العملية الجنسية) بێتە دی.

٤. مێردی دووەمی یان بمرێت، یاخۆ تەڵاقی بدات، بێگومان ئەوەش لەبەر هۆیەکی سروشتیی یان شەرعیی، نەك بە پێی مەرج‌و پەیمانێك کە لەوەوبەر لەگەڵیا کرابێت.

٥. وەك جاری پێشوو ماوەی چاوەڕوانیی بەسەربەرێت. ئەوسا ئەگەر خۆی‌و مێردی یەکەمی بیانەوێت، ئەوا بۆیان هەیە بە مارەبڕینێکی تازە بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر ".. إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ..".

نەشمین: من یان هێشتا تێنەگەیشتووم یان ئەو مەرجانە گومانی ناو دڵمیان نەڕەواندۆتەوە. حەز ئەکەم باسەکەمان بۆ ڕۆشنتر بکەیتەوە، بەڵێن بێ نە پەلە بکەم‌و نەهەڵیش بچم.

## حەڵاڵبوونەوە بە شووکردنێکی شەرعیی ئەبێت

مامۆستا ساڵح: ئێستا نۆرە پرسیاری منە، بەدرێژایی تەمەنتان، ئایا جارێك لە جاران بینیوتانە یاخۆ بیستووتانە، کۆمەڵێك خوازبێنیکەر بچنە لای کەسوکاری ئافرەتێك، لە کاتی خوازبێنی کردندا پێیان بڵێن: فلانە کەس کچەکەت، خوشکەکەت، یان خزمەکەتمان بدەرێ بۆ فلانەکەس بۆ ماوەی شەوێك یان چەند شەوێك، سەنەدیشت ئەدەینێ دوای بەسەرچوونی ئەو ماوە دیاریکراوە تەڵاقی بداتەوە، نە جل‌وبەرگی بۆ ئەکەین، نە مەسرەفی ئەکێشێ، نە هیچ پارەو پول‌و شتێکت ئەدەینێ‌و ....نە، .. نە ..؟

هەڵکەوت: بێگومان شتی وامان نەدیووەوە نەبیستووە، شتی وەها ژیری پەسەندی ناکات، هەر کەس وەها بکات، خاوەنی ژنەکە ئەدات بە دەمیا، چونکە داوایەکی نابەجێیە.

مامۆستا ساڵح: دەی چاوەکەم، ئەو جاشکردنەوەیە کە ئێوە باسی ئەکەن، زۆر زۆر لەوە نزمترە، کەچی حەڵاڵبوونەوە هاوسەرییەکی ڕێکوپێك‌و شەرعیی‌و خاوێنەو هیچی لەوەی کە ئێوە ئەیڵێن ناکات.

نەشمین: چۆن؟ ئێستاش تێناگەم.

مامۆستا ساڵح: وەك باسمان کرد، یاسا قورئانییەکە ئەفەرمووێ: ".. حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ..". واتە: ئەبێ شوو بکات بە پیاوێکی تر، با بە ووردیی ڕستەی (تنكح زوجا) بدەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە.

لە ژنهێنان‌و شوکردنی شەرعییدا – وەك ئاشکرایە – پیاو زۆر بە کوڵ، بە جۆشەوە، ویست‌و نیەتی ژنهێنانی هەیە، کاتێ ئەچنە پێشەوە بۆ خوازبێنی، هیواو مەبەستی ئەوەیە ئەو ئافرەتە بکات بە هاوسەری درێژایی هەمو ژیانی، بە هەمیشەیی پێکەوە بژین، تەنها مەرگ لە یەکیان جیا بکاتەوە، بە هیوای ئەوەیە ئارامیی‌و شادیی‌و هێمنی‌و ئاسوودەیی بەهۆی هاوسەرەکەیەوە بەدەستبهێنێ، بەتەمایە لە خۆشیی‌و ناخۆشیی ژیانیدا بەشداریی بکات، بۆشایی دڵ‌و دەروونی پڕبکاتەوە، بەتەمایە گۆپکەی خۆشەویستی لە نێوانیاندا گوڵ‌و تۆو بکات، بەرهەمێکی باشی بەدەمەوە بێت، بەتەمایە هەر نەنگ‌و کەموکورتیەکی هەبێت ئەو ژنە داپپۆشێت‌و ببێت بە بەرگ‌و کاڵای بەری. لەوەش گرنگتر، بە هیوایە منداڵی ببێت لەو ئافرەتەو قەرەچۆڵ بڕاو نەبێت، ئەمەی گوتمان ڕاستە یان نەء؟

جوان: بێگومان هەمووی ڕاستە، هەموومان هەستی پێئەکەین، وەنەبێت ئەو هیواو بەتەمابوونە تەنها لەلایەن پیاوەوە بێت، بەڵکو ئافرەتیش ئەو هیواو بەتەمابوونەی لە هی پیاو زۆرتر نەبێ کەمتر نییە.

سکاڵا: زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین ئارەزوی ئافرەت بۆ منداڵ لە هی باوك بەتین ترە، چونکە ئافرەت لە پیاو بەسۆزترە.

مامۆستا ساڵح: ئایا ئەو جاشکردنەوەیە ئەو ئاوات‌و هیواو بەتەمابوون‌و داوایانەی تیایە؟ ئەو ئەرکانە ئەگرێتە خۆ؟

نەشمین: نەخێر.. نەخێر. هیچکامی تێدا نییە.

مامۆستا ساڵح: سەبارەت بە هاوسەریی خوا ئەفەرمووێ: "وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم: ٢١). ئایا ژنێك بۆ ماوەی شەوێك لەپیاوێك مارە بکرێ، پێی ئەوترێت هاوسەری ژیان؟ ئایا (مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً)، ئەکەوێتە نێوانیانەوە؟ ئایا بەهیوان منداڵیان ببێت‌و پێکەوە لەیەك ماڵدا پەروەردەیان بکەن؟

هەڵکەوت: بێگومان نەء، هیچکامیان بە تەمای ئەوە نین.

مامۆستا ساڵح: دەی یەکێك لە ئامانجە گەورەکانی هاوسەریی لە ئیسلامدا، خستنەوەی منداڵ‌و بەرەو وەچەیە، خوای گەورە لە سوورەتی (الفرقان)دا یاسای ژمارە (٧٤)دا ئەفەرموێ: "وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً" (الفرقان: ٧٤). هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأمم" (رواه أبو داود والنسائي والحاكم وصححه).

لەوەش زیاتر ئەرك‌و مەسرەفی ژنهێنان، خانوو، ناوماڵ پەیداکردن، پێویستییە جۆربەجۆرەکانی ژیانی ماڵداریی، لەپێش ئەمانیشەوە مارەیی، لە ئیسلامدا هەموویان لە ئەستۆی پیاودان. ئایا جاشکردنەوە ئەوەی تێدایە؟

پرشنگ: ئەوانەی چۆن تیا ئەبێت؟ ئەو تەنیا بۆ یەك شەوە؟

مامۆستا ساڵح: هەروەك ئەزانن، پیاو بەوپەڕی شادمانییەوە، بەسەربەرزییەوە دەنگ‌و باسی ژنهێنانی بڵاوئەکاتەوە، خۆی بەپێی خۆی ئەگەڕێت بەدوای خەڵکا بۆ کۆکردنەوەی خەڵك، چ بۆ کاتی خوازبێنی‌و مارەبڕینی، چ بۆ کاتی گواستنەوە، نان‌و تفاقی ئامادە ئەکات بۆ بەشدارییکەران، خزم‌و ناسراوو برادەرانی بانگ ئەکات، جگە لای مەلا لە مەحکەمەشدا مارەی ئەبڕرێت، چەندان باوو نەریتی تری ڕەوا لەم بۆنەیەدا پەیڕەوی

ئەكرێت. ماڵی بووکیش ئاهەنگگێڕانو چەند کارێکی ئاشکرای تر ئەنجام ئەدەن. ئایا جاشکردنەوە ئەمانەی تیایە؟

جوان: ئەی بێ بەڵا بی، ئەوان خواخوایانە کەس پێیان نەزانێت.

مامۆستا ساڵح: ڕۆڵە خۆشەویستەکانم، ئەوەتا ئایەتەکە ئەفەرمووێت: ".. حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَه..". دەی ئەبێ شوویەك بکات، شوکردنێکی تازەی تەواو، بەهەموو واتاکانی شووکردن، نەك شوکردنێکی ساختەی درۆی فروفێڵاویی کاتیی، نەك شوکردنێکی دیمەنیی (الصوري).

جا گەڵێ جار، قەدەر وای ئەهێنێ کە ئەم مێردە تازەیەی ئەمرێت، یان لەبەر بەیەکەوە نەگونجان تەڵاقی ئەدات، ماوەی چاوەڕوانیکردن تەواو ئەکات، ئەو کاتە ئەو ئافرەتە ئەگەر ئارەزووی هەبێت، مێردی یەکەمیشی حەزی لێ بکاتەوە، بۆیان هەیە ببنەوە بە هاوسەری شەرعیی یەکتر، بەڵام بە مارەبڕینێکی تازەوە، بە مارەییەکی تازەوە هەروەك جاری یەکەمیان بێتو بۆ یەکەمجار شووی پێبکات.

دڵپاك: بەڵام بەو مەرجەش دڵنیابن لەوەی کە ئەتوانن لە یاسای خوای گەورە نەچنە دەرەوە، ئەگەر بێتو دڵنیا نەبن، دیارە تاوانبار ئەبن، چونکە ئایەتەکە ئەو مەرجەی تیایە: ".. إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ ..".

نەشمین: ها، ئێستا تێگەیشتم، لەگەڵ ئەوەشدا خۆزگە ئیسلام ڕێگەی بە ژنو پیاو نەدایە بۆ یەکگرتنەوە! بە جوانی نازانم.

مامۆستا ساڵح: ئیسلام ئاینی واقیعە، خوا نەخشەی کێشاوە، خوایش لە هەموو زانایەك زاناترەو بە هەموو ئاواتو هەستو نەستێکی دیارو نادیاری دڵو دەروونی ئادەمیزاد ئەزانێت، خۆزگە ئیمەی (مەخلوق) لە چاو زانینی (خالق)دا ئەبێ چ نرخێکی هەبێ؟ کاری خوا بێ حیکمەت نەبووە نابێت، نەشمین خان.

بێگومان ئیسلام دڵی ئەو ژنو پیاوە موسڵمانەی بەلاوە گرنگە، نایەوێ دڵیان بشکێنێ، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە، ئەو ژنو پیاوە تا ڕادەیەکی زۆر شارەزای دڵو دەروونو مێشكو هەستو نەستی یەکترنو لەیەك گەیشتوون، چونکە ماوەیەك لەوەوبەر پێکەوە ژیاون، کۆبوونەوەیان سەرلەنوێ لەوە چاکترە کە هەر یەکەیان هاوسەرێکی تر کە شارەزایی نییە لەبارەیەوە بۆ خۆی لەم دواییەدا بدۆزێتەوە. لەوانەیە لەگەڵ هاوسەری تازەدا سروشتیان لەیەکەوە زۆر دوورو جیاواز بێت، بەڵام لەگەڵ هاوسەرە کۆنەکەیدا لە کەموکوڕییو نەنگی یەکتر شارەزان، ئایا چاکتر وایە ئەو نەنگو کەموکورییانە بخەنە بەردەستی کەسێکی تر یان بیانخەنەوە بەر دەستی خۆیان؟ "ناسینی سەرینێك لە ناسینی دوان چاکترە".

جگە لەوەش لەوانەیە ئەو ماوەیە کە لەیەکترجیابوونەوە بووبێتە دەرسێکی زۆر گرنگی کاریگەر بۆیان، وای لێ کردبن، هەوڵ بدەن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیانو نەهێڵن دووبارە ببنەوە. ها .. ئێستا ڕات چییە کاك هەڵکەوت؟

هەڵکەوت: من هەر زوو گوتم: خەریکی پاشەکشێم لە ڕاکەی خۆم، بەراستی من ئەمەم قەت نەبیستووەو بە خەیاڵیشما نەهاتووە. کەواتە ئەو جۆرە جاشکردنەوەیە کە باسکرا، موسڵمانانە نییە؟

# لەبەر قسەی خەڵکی خوا مەڕەنجێنە

نەشمین: مامۆستا باوەڕ بکە، من بەم شێوەیەی کە تۆ باست کرد قەت نەمبیستووە، بەڵکو بەو جۆرەم بیستووە کە بۆم گێڕایتەوە.

مامۆستا سالح: کچی بەڕێزم، ئەوەی کە بۆ ئێوەیان باس کردووە دیارە حەلاڵبوونەوە نەبووە، ڕاستییەکەی جاشکردنەوەیەکی پەتیی بووە، ئەی ڕەحمەت لە گیانی ئەو کەسەی کە ئەم ناوەی بۆ دۆزیوەتەوە.

خۆ تێگەیشتن حەلاڵبوونەوە چۆنە، چونکە بۆم باسکردن. بەدرێژیی. کە ژنهێنان و شوکردنێکی نوێی سەربەخۆیە، هەموو مەرجێکی شەرعیی و مەنتیقیمان تێدا بەدی کردو قایل بوین بەوەی کە عەقڵ و واقیع پەسەندی ئەکەن. ئەوە بوو تۆیش نیشانەو هەنگاوەکانی جاشکردنەوەت لەسەرەتای باسەکەدا خستەڕوو، ئێستاش هەموومان ئەزانین جاشکردنەوەو حەلاڵبوونەوە بە قەدەر ئاسمان و زەویی لەیەکەوە دوورن و جیاوازن، بە تایبەتیی لە ڕووی نیازو مەبەست و هەنگاوو شێوازو ئەرک و ئەنجامەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "إنما الأعمال بالنيات"[1]. جا وەك لە باسەکەدا دیارە، جاشکردنەوە مەبەستی ژنهێنان و شوکردن ناگرێتە خۆی. باسی مارەیی ڕاستەقینەو ژیانێکی هەمیشەیی. درێژایی تەمەنی. ئەو ژن و مێردەی تێدا بەدی ناکرێت و چاوەڕێی لێ ناکرێت، بیر لە منداڵ و وەچەو بەچەکەوتنەوەی تێدا نییە، غەم خواردنی ئەرك و مەسرەفکێشانی تێدا بەدی ناکرێت، ئەرکی باوکێتیی و دایکێتیی و ئەو جۆرە شتانەی پێوە دیار نییە. ئیتر کەی لە (حتى تنكح زوجا غيره) نزیك ئەبێتەوە؟ کەی بە شوکردن ئەژمێرێت؟

لە کاتێکا هاوسەریی لە ئیسلامدا ئامانجی گەورەو بەرزو پیرۆزی زۆرو زەبەندی هەیە، پێکەوەنانی خێزان و دروستبوونی خزمایەتیی بەدەمەوەیە، ئەرك و مافی لە دوتوێدا دیارە، بۆ درێژایی تەمەنە نەك بۆ یەك دوو شەوێك.

سکاڵا: دەمخۆش، ڕاست ئەکەی، نەك هەر فڕوفێڵ و بەس، بەڵکو درۆو دەسەلەو پڕوپەلاتتەیە، کارێکە فەرهەنگی ئیسلام نایگرێتە خۆی، خواو پێغەمبەر ﷺ پێی ناڕازین، بگرە بە تاوانێکی گەورەی دائەنێن، ئیسلام هەرگیز پەسەندی نەکردوە، جا نازانم خوشکە پرشنگ لەچ سەرچاوەیەکەوە وەریگرت کە گوتی: "بەڵام ئەوەتا ئیسلام پەسەندی ئەکات".

پرشنگ: مامۆستا! ئەو قسەیە داهێنراوی من نییە، بەڵکو لەناو خەڵکا ئەگوترێت و باس ئەکرێت و چەندەها سەرگوزشتە لەو ڕووەوە بە ئاشکرا ئەگێڕنەوە. من لە خەڵکم بیستووە، خۆم نەمدیووە.

مامۆستا سالح: بەڵام حەیفە تۆی خوێندەوار، بەقسەی خەڵك باوەڕبکەیت و خوای پەروەردگارت لەخۆت بڕەنجێنی.

چۆن گوێ بەزەڕەی گوێژدرێژێ ئەدەی؟
بەقسەی مەلا چۆن باوەڕ ناکەی؟

[1] رواه البخاري ومسلم.

# جاشكردنەوە حەرامكارییە

ڕووناك: مامۆستا گیان، ڕاكەی تۆ بەسەر سەرم، زۆر ڕێكو جوانە بەڵام ئایا ڕای ئیسلام بەو جۆرەیە كە تۆ ئەیفەرمووی؟

مامۆستا ساڵح: سبحان الله، ڕووناك خان من چیم، ڕای من چییە؟ من بەندەیەكی خوام، شاگردێكی قۆناغی سەرەتایی قوتابخانەی ئیسلامم، چۆن لە ڕووم دێت ڕای خۆم بەرامبەر یاسای خواو پێغەمبەر ﷺ دەربڕم بەوەی قسە بەناوی ئەوانەوە بكەم، كەچی دەمهەڵبەستی خۆم بێت؟ ئەی من تا ئێستا بە دەوری یاسای ژمارە (٢٣٠)ی سوورەتی (البقرة)دا نەسوڕاومەتەوە؟ ئەی نەمگوت ئەوە یاسایەكی خواییە؟ ئایا گوتم بەڕای من؟ ناوی ڕای خۆمم بردووە؟

سكاڵا: مامۆستا ڕووناك وا ئەزانێت ئەو جاشكردنەوەیە كارێكی ئیسلامییەو مامۆستاش بەو قسانەی پەڕۆو پینەی ئەكات.

مامۆستا ساڵح: ئافەرین، زۆر جوانی بۆچوویت، ئێمە تەنها باسی شێوە ڕاستییەكەی حەلاڵبوونەوەمان كرد، لە ژێر تیشكی ڕۆشنایی یاسای ژمارە (٢٣٠)ی سوورەتی (البقرة)دا، جا ئێستاش باسی جاشكردنەوە ئەكەین بزانین ئیسلام چۆن تەماشای ئەم حەرامكارییە ئەكات.

پرشنگ: حەرامكاریی؟ بە حەرامكاریی ناوی ئەبەیت؟

مامۆستا ساڵح: بەڵی .. بەڵێ، حەرامكاریی، ئەو جاشكردنەوەیە كە ئێوە بیستووتانە بەم جۆرەیە: ئافرەتێك هەرسێ تەڵاقەكەی كەوتوون، پاش تەواوبوونی ماوەی چاوەڕوانیی مێرد ئەكات، یان بە مارەبڕینێك پیاوێك ئەچێتە لای، ئەمجا تەڵاقی ئەداتەوە بۆ مێردی یەكەمی.

ئاواز: ئا.. ئا، ئێمە تەنیا ئەوەمان بیستووە، جا ئەو مێردە دووەمەی عادەتەن ئەبێت پیاوێكی شێتۆكە ڕەنگی چڵكنی كوڵكنی بێ قابیلیەت بێ.

مامۆستا ساڵح: پێشەكی شێتو شێتۆكە نیكاحی دانامەزرێت، چونكە یەكێك لە مەرجەكانی مارەكردن بوونی عەقڵە، دەی خۆ شێتو شێتۆكە عەقڵیان شێواوە، كەواتە مارەبڕینكە دانامەزرێت.

بابڵێین شێتۆكەش نەبێتو ژیریش بێت، لەم حاڵەتەشدا ئەو كارە هەر یەكێكە لە گوناهە هەرە گەورەكانو بە (فاحیشە) ناو ئەبرێت، خوا حەرامی كردووە لەعنەت لە بكەرەكەی كراوە، بۆ نموونە:

١. پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لە جاشكەرەوەو جاشبۆكراوە كردووە. "لعن الله المحلل والمحل له". (رواه أحمد بسند حسن).

٢. هەمان فەرمووده (ترمذي) لە (عبداللەی كوڕی مەسعود)ەوە ئەیگێڕێتەوەو ئەڵێت: "حديث حسن صحيح) لای (أهل العلم) كار بەم فەرمودەیە ئەكرێت، لە لایەن یارانی پێغەمبەرەوە ﷺ كاری پێكراوە، لەوانە: عومەری كوڕی خەتتاب، عوسمانی كوڕی عەففان، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر.. هتد. فەقیهان لە (التابيعين) ڕایان لەسەر هەمان فەرمووده بووە.

٣. پێغەمبەر ﷺ جاشكردنەوەی بە تەگەی خوازراو ناو بردووە: "ألا أخبركم بالتيس المستعار؟" قالوا بلى يارسول الله: "هو المحلل، لعن الله المحلل والمحل له". (إبن ماجة والحاكم).

٤. پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا، لەبارەی جاشكردنەوەوە فەرموی نەء، مارەبڕین تەنیا بە حەز (رغبة) ئەبێت نەك پڕو پەلاّتەو گاڵتەكردن بە پەڕاوی خوا، ئەبێ ئافرەت هەنگوینۆكەی پیاو بچەژێت. ". إلا نكاح رغبة، لا دلسته، ولا أستهزاء بكتاب الله عزوجل، حتى تذوق عسيلته" (رواه أبو إسحاق الجوزجاني).

٥. عومەری كوڕی خەتتاب فەرموویەتی: هەر جاشكەرەوەو جاشبۆكراوەیەكم بۆ بێنن بەردبارانیان ئەكەم. "لا أوتي بمحلل ولا محلل له الا رجمتهما". لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە – لەو دوورەوە – لە ڕووی جاشكردنەوەوە

پرسيار كرا، لەوەڵاما فەرمووی: هەردوولایان زیناكەرن، "كلاهما زان". (رواه إبن منذر، وإبن أبي شيبه، وعبدالرزاق).

٦. پیاوێك لە (إبن عمر)ی پرسی: چی ئەڵێیت دەربارەی ئافرەتێك مارەی بكەم بۆ ئەوەی حەڵاڵی بكەمەوە لە مێردەكەی، لە كاتێكا كە مێردەكەی داوای ئەوەی لێنەكردووم‌و بەمەش نازانێ؟ فەرمووی: نەء، ئەبێ مارەبڕین بە حەز بێت، گەر ژنەكەت لەلا چاك بێت ئەوا لای خۆت ئەیهێڵیتەوە، گەر حەزت لێی نەبوو لێی جیائەبیتەوە، ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەو كارەمان ـ جاشكردنەوە ـ بە داوێنپیسی (السفاح) دا ئەنا. "لا، إلا نكاح رغبة، إن أعجبتك أمسكتها، وإن كرهتها فارقتها، وإن كنا نعد هذا سفاحا على عهد رسول الله ﷺ". هەروەها فەرموی: "لايزالان زانيين وإن مكثا عشرين سنة اذا علم أنه يريد أن يحلها".[1]

هەڵكەوت: بێگومان ئەو كارە كارێكی حەرامە، بەڵێ ئێستا لام ڕوونە.

سكاڵا: ئۆخەی كە حەرامە، لەسەرەتاوە تەپەی دڵم ئەهات.

مامۆستا ساڵح: وەك بیستتان، ئەو دەقانەی ڕاستەوڕوو ناڕەوایی ئەو هاوسەرییە ڕواڵەتییەو ناڕاستیی ئەو جاشكردنەوەیە نیشان ئەدەن، ئەوەتا لەعنەتی لێكراوە، لەعنەت كردنیش تەنیا بۆ كاری نەگونجاوە لە ئیسلامدا، هەرگیز ئەو ئافرەتە بەو ڕێگایە بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵ نابێتەوە، گەرچی لەكاتی مارەبڕینەكەشدا مەرجی تەڵاقدانەوە باس نەكرێت، ئەی مەبەست لەو مارەكردنە حەڵاڵبوونەوەی ئەو ژنە نییە بۆ مێردی یەكەمی؟ "فإن العبرة بالمقاصد والنوايا". هەروەها "لسان الحال أقوى من لسان المقال".

جا نازانم، ئێستاش حەرام بوونی ئەو كارە، لەلایەن مامۆستا ڕووناكەوە، بە ڕای من ـ نەك ئیسلام ـ دائەنرێ.

ڕووناك: داوای لێبوردن ئەكەم مامۆستا، نەمزانی..

*　　　*　　　*

مامۆستا ساڵح: زانای موسڵمان (إبن القيم) ئەفەرموێ: "لای خەڵكی مەدینەو (أهل الحديث)و فەقیهەكانیان، لە نێوان مەرج كردندا بە قسەو لایەنگیریی كردن‌و مەبەستا جیاوزایی نییە. بەڵكو حیساب بۆ مەبەست ئەكەن‌و كاریش بە پێی نییەتە".

.. بێژە (اللفظ) بۆ گوتن نییە، بەڵكو بۆ گەیاندنی واتایەكە، جا كە واتاو مەبەست دەركەوتن، ئەوسا بێژە ئەو گرنگییەی نییە چونكە بێژە هۆ (وسیلە)یە، جا كە مەبەست هاتە دی، ئیتر حوكمی بەسەردا ئەدرێت".[2]

جوان: من لەم گوتەیە تێنەگەیشتم، ئەوە یانی چی؟

مامۆستا ساڵح: تۆ ئەگەر قوتابییەك بانگ بكەیت‌و بڵێیت، وەرە با دوو دارت لێبدەم، یاخۆ بانگی بكەیت‌و دوو داری لێبدەیت، مادام جاری پێشوو لێتداوەوە جاری دوایش هەر دوو دارت لێداوە، ئایا ئەو لێدانە هەر لێدان نییە؟

جوان: بەڵێ، هەر لێدانە، من كە دوو داری لێبدەم، چ پێی بڵێم یان پێی نەڵێم، ئەو لێدانەكەی هەر خواردووە.

مامۆستا ساڵح: دەی جاشكردنەوەش چ بگوترێت بە نیازی جاشكردنەوەوەو چ نەگوترێ، كە ڕوویدا هەر جاشكردنەوەیە.

دیسانەوە (أبن القيم) ئەڵێت: "چۆن ئەگوترێت: ئا ئەو جۆرە هاوسەرییە ژنی پێ حەڵاڵ ئەبێتەوە بۆ مێردی یەكەمی، لە كاتێكا مەبەست هاوسەرییەكی كاتییە لێی، مەبەستی بەردەوامیی هاوسەریی پێوە نییەو هیوای منداڵبوون‌و پەروەردەكردنی منداڵ‌و باقی تری ئامانجە سەرەكییەكانی هاوسەریی لێناكرێت.

---

[1] فقه السنة/ ج٢ ص٤٧. السيد سابق.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەو هاوسەرییە ڕواڵەتی (صوری)یە درۆو فرۆفێڵێکە، خوا لە ئاییندا ڕێپێنەداوە، بۆ هیچکەس ڕەوای نەکردووە، ئەوەندە بەدکاریی و زیانی زۆرە کە لە کەس نەشارێتەوە".

زانای موسڵمان (إبن تيمية)، دەربارەی جاشکردنەوە ئەفەرموێ: "ئایینی خوا پاکترو پاڵفتەترە لەوەی کە (فرج)ێك لە (فرج)ان تا تگەیەك لە تگانی بۆ نەخوازرێت، حەرام بکات، لە کاتێکیشدا حەزی مارەکردن و بوون بە خزم و زاوای پێوە دیار نەبێت، هەر لە بنەڕەتیشدا مەبەستی مانەوە نەبێت لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا، کەچی سواریشی ببێ و بەهیوا بێت حەڵاڵیبکاتەوە، ئەوە داوێنپیسییە، زینایە، هەروەك یارانی پێغەمبەر هەر بەم جۆرە ناویان بردوە.

حەرام چۆن حەڵاڵکەرەوەیە؟ یان پیس چۆن پاککەرەوەیە؟ یان گڵاو چۆن خاوێنکەرەوەیە؟ ئەو کەسەی کە خوا سنگی کردبێتەوە بۆ ئیسلام، دڵی ڕۆشن کردبێتەوە بە ئیمان، ئاشکرایە لەلای، ئەم کارە ـ جاشکردنەوە ـ ناشیرینترین کاری ناشیرینانە، سیاسەتی هیچ کەسێکی ژێر پێی هەڵناسێت، ئیتر چۆن شەریعەتی پێغەمبەران، بەم کارە هەڵئەسێ، بە تایبەتیی چاکترین شەریعەت و بەشەرەفترین بەرنامە؟"[1]

پێشەوایان (أحمد، مالك، الثوری)و (أهل الظاهر)یش و جگە لەمان فەقیهان هەمان ڕایان هەیە، لەوانە: "الحسن، النخعي، قتادة، الليث، إبن المبارك).[2]

ڕووناك: ڕاستییەکەی ئەوەی بیستومانەو ئەمەی ئەیبیستین زۆر جیاوازن، تەنانەت ئەتوانم بڵێم دژی یەکترن.

## ئەویش یەکێکە لە دیاردە ناشەرعییەکان

پرشنگ: مامۆستا من ناڵێم تۆ ڕاستت نەگوت لە باسەکەدا، ئەزانم ئەوەی گوتت، هەمووی ڕاستەو ژیرییش پەسەندی ئەکات. بەڵام زۆرجار بیستومانەو ئەبیستین، ئەو جاشکردنەوەیە، کە ئیسلامییش نییە، لە هەندێ کات و شوێندا لەناو موسڵماناندا پەنای پێئەبرێت و ئەشکرێت، ئەی ئەوە یانی چی؟!

ئاواز: ڕاست ئەکات. منیش ئەمویست ئەوە نیشان بدەم.

مامۆستا ساڵح: منیش ناڵێم ڕاست ناکەن، بەڵکو ئەڵێم ڕاست ئەکەن، بەڵام ئەوەش هیچ پێویست بە سەرسوڕمان ناکات، وانەبێت ئەو کارە تەنیا دیاردەیەکی ناشەرعیی ناو ئەم کۆمەڵگەیە بێت، بەڵکو یەکێکە لە سەدەها دیاردەی ناشەرعی ناو کۆمەڵگەی نەفامیی ئەم سەدەیە.

هەمووتان هەست ئەکەن و ئەزانن، ئەمڕۆ سەدان تاوان لە کایەدایە، بۆ نموونە: دزیی، پیاوکوشتن، زیاناکردن، ستەمکاریی، تاڵانکردن، مەیخواردنەوە، قومارکردن، سوکاریی، مەردم فڕاندن، جەردەیی بەرەڵڵایی جۆربەجۆر، .. هتد.

جا نازانم بەڕەوای ئەزانن، ئەو تاوانانەش بلکێنرێن بە تەوێڵی ئیسلامەوە؟ بدرێن بە کۆڵی ئیسلامدا؟ ئایا ئیسلام ڕێگە بە کردنی ئەو کارانە ئەدات؟ حەزیان لێئەکات و هانی موسڵمانانیان بۆ ئەدات؟ ئایا ئەو کەسەی کە خەریکی ئەو جۆرە کارانە بێت ئیسلام بە موسڵمانی دائەنێت و ئەیگرێتە خۆی؟ ئەو کەسەی کەمێك شارەزایی لە ئیسلام هەبێت، ئەزانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە.

---

[1] تەماشای فقه السنة / ج٢، ص٤٧ـ٤٨ بکە، دانانی : السيد سابق.

[2] تەماشای فقه السنة / ج٢، ص٤٧ـ٤٨ بکە، دانانی : السيد سابق.

ڕۆڵە ئازیزەکانم! هەر تاوانێ کە کراوە یا ئەکرێ، ئەبێ بۆچ تاوانەکەی بدەین بە کۆڵی ئیسلامدا؟ بەتایبەتیی لەم ڕۆژگارەدا کە ئیسلام دەسەڵاتی لەدەستا نییەو لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە پەیڕەویی ناکرێت‌و حوکمی پێناکرێت. ئێوە وا ئەزانن هەر کەسێك لە تەسکەرەکەیا نوسرابێت (مسلم) ئیتر (بلال) یان (عمار)ێکە! نەء، ئەگەر حیساب بەو جۆرە بۆ شت بکەن، ئەوە بە هەڵەدا چوون.

موسڵمانەتی، نەء بەناو نییە        بە جل‌و بەرگ‌و دەم‌و چاو نییە
موسڵمانەتی باوەڕەو کردار        بەرهەمە بەڵگە بۆ ڕەسەنیی دار

# له یاسای خوا مه‌قرتێنه

پرشنگ: ماموٚستا! وەك ئەزانین، ئیسلام زۆر دژی داوێنپیسییه، خۆ دیاره داوێنپیسیی هەر جۆرێك بێت، هەر داوێنپیسییه، ئەی چۆن پاره ئەو کاره پاك ئەکاتەوەو ئەیکات به کارێکی ڕەوا؟

ماموٚستا ساڵح: پاره ناتوانێ ناڕەوا بکات به ڕەوا.

پرشنگ: چۆن نەء؟ ئەی سیخەکردن کتومت وەها نییه؟

ئاواز: منیش ئەم بابەتەم بیستووەو ئەڵێن موسڵمانان ئەو کاره ئەکەن.

هەڵکەوت: بوونی سیخەکردن له ئیسلامدا شتێك نییه بشارێتەوە، چونکه زەق‌و ئاشکرایەو له قورئاندا نووسراوە، تەنانەت باسەکەیم لەبەره. ئەڵێت: ".. فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلاَ جُنَاحَ ). (النساء : ٢٤ ). ئایا ئەمه بازرگانیی لەش (تجارة الجسد) نییه؟

جوان: وی!! هەرگیز نەمزانیوه که ئیسلام ڕێگەی شتی وەها دەدات.

ماموٚستا ساڵح: کاك هەڵکەوت! گریمان تۆ (٣٤٥) دینارت لای کابرایەکه، ئایا ڕازی ئەبیت که تەنیا باسی ژماره (٤)ت بۆ بکات‌و چل دینارت بداتەوەو ژمارەی (٣)و ژمارەی (٥) بقرتێنێ؟

هەڵکەوت: نەخێر، چونکه (٣٠٥) دینارم ئەخوات، شتی وانابێت.

ماموٚستا ساڵح: دەی کەی ڕەوایه، تۆیش له پێش‌و پاشەوه یاسای خوا بقرتێنیی؟ براکەم! تۆ یاساکەیان به قرتاویی پێ لەبەرکردوویت، شتی وەها تاوانه، گوناهه! جا کەوابێ (وەیل) جێگەی نوێژکەرانه، چونکه خوا له سوورەتی (الماعون)دا ئەفەرموێ: (فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ) (الماعون: ٤).

هەڵکەوت: بەڵام من له مەبەستت تێناگەم!

ماموٚستا ساڵح: مەبەستەکەم ڕوون‌و ئاشکرایه، ئەبێ تەماشای پێش‌و پاشی ئایەت بکەیت‌و ماناکەی به گوێرەی پێش‌و پاشەکەی لێکبدەیتەوە، ئەگینا بەهەڵه ماناکەیت لێکداوەتەوه. بۆ نموونه: ئایەتی (فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ) به جۆری نوێژکەرەکان دیارییکراوەوه ئەفەرموێ: (الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ، الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ ، وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ) (الماعون: ٥-٧). واته ئەوانەیان که ئەو سیفەتانەیان تێدایه. سوورەتەکه خۆی جیای کردۆتەوه، حوکمەکه بۆ گشتیی نوێژکەران نییه.

هەڵکەوت: لەمەی که گوتت، تێگەیشتم، ئەی ئەو ئایەتەی که من هێنامەوه لەناو قورئاندا نییه؟

ماموٚستا ساڵح: چاك تێنەگەیشتوویت له مەبەستەکەم، ئەوه له ناو قورئاندا هەیه، بەڵام به پچڕاوی پێیان گوتویت، ئەوه بەشێکی کەمه له ئایەتی ژماره (٢٤)ی سوورەتی (النساء) که ئەفەرموێ: "(وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً) (النساء : ٢٤ )". ئەمه له لایەکەوه لەلایەکی ترەوه ئەم ئایەتەش سەرەتای باسەکه نییه، بەڵکو سەرەتای باسەکه له بنەڕەتا هاوسەرییەو ئەم ئایەتەش چەند حوکمێکه له حوکمەکانی هاوسەریی. جا نازانم تا ئێره تێگەیشتتوون؟

ڕووناك: من تا ئێره تێگەیشتووم، بەڵام نازانم کۆتایی . ئەنجامەکەی . چۆن ئەبێ.

سکاڵا: باشه کاك هەڵکەوت، خۆ ووشەی سیخەکردن لەو ئایەتەدا نییه.

هەڵکەوت: با، وشەی (المتعة) سیخەکردنه.

**نەشمین: دەی مامۆستا گیان، ئایەتەکە بیقرتێنی یان نەیقرتێنی، ئەوەتا باسی سیخەکردنی هەر تیایە، واتە لە بابەت (موضوع)ەکە ناگۆڕێت؟!**

**مامۆستا ساڵح: نەخێر، کچی بەڕێزم، وانییە، چۆن لە بابەتەکە ناگۆڕێت؟! زۆر چاك ئەیگۆڕێت، وەك گوتمان ئایەت، ئەبێ بە پێی پێش‌و پاشەکەی ماناکەی لێکبدرێتەوە، هەروەها ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ لای فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بزانین چۆن ئەو ئایەتەی ماناکردووە، ئەوسا لێی تێئەگەین، خۆ ئەمە مناڵبازاڕ نییە.**

**دڵپاك: بابەگیان، من وای بە چاك ئەزانم کە لە پێشەوە کەمێك باسی سیخەکردن بکەیت، تا لێی تێبگەین‌و بزانن چۆنە، ئەوسا مانای ئایەتەکە بدەیتەوە، هەر کەسێکیش پرسیاری هەبێت، ئەزانێ بە چ شێوەیەك بیکات.**

**ئاواز: ڕاستییەکەی، منیش هەرچەندە باسی سیخەکردنم بیستووە، بەڵام نازانم چییەو چۆنە.**

**مامۆستا ساڵح: کەواتە لەسەر نەخشەکەی دڵپاك دەس بە باسەکە ئەکەین.**

## سیخەکردن ( المتعة )

**مامۆستا ساڵح: سیخەکردن چەند ناوێکی هەبووە، هاوسەریی کاتیی، هاوسەریی خۆشیی لێچەشتن، هاوسەریی پچڕاو (الزواج المؤقت، زواج المتعة، الزواج المنقطع).**

**ئەم کارە بریتیبووە لە پەیمان (عقد)و مارەبڕینێك لە نێوان ژن‌و پیاودا، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، بەرامبەر کرێیەکی دیاریی کراو کە پیاوەکە بیدات بە ئافرەتەکە. لەو ماوەیەدا ئەو ئافرەت‌و پیاوە تام‌و خۆشییان لەیەکتر ئەچەشت، کە ماوە دیاریکراوەکە بەسەر ئەچوو، ئەو پەیمان‌و مارەکردنە . بەبێ تەڵاقدان . هەڵ ئەوەشایەوە، خۆ ئەگەر ژن‌و پیاوەکە ئارەزوویان ببوایە بۆیان هەبوو درێژە بە ماوەکە بدەن بەڵام بەرامبەر کرێیەکی نوێ. ئەم جۆرە مارەکردنە لەناو عەرەبەکاندا لە پێش دەرکەوتنی ئیسلامدا هەبووە و باوو بووە.[1]**

**هەندێ خوو باوی سەردەمی نەفامیی، تا ماوەیەك لەسەردەمی ئیسلامییدا هەر ماونەتەوەو دوایی هەنگاو بە هەنگاوو وردە وردە ئیسلام قەدەغەی کردوون، یەکێك لەوانە سیخە کردن بووە، ماوەی چەند ساڵێك لە ژیانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا ﷺ هەندێ لە موسڵمانانیش هەندێ جار پەنایان بەو کارە بردووە تا دوایی حەرامکرا.**

**هەڵکەوت: دەی مامۆستا گیان، ئەوەتا ئیسلام ئەو خوو باوەی ڕۆژگاری نەفامیی قەدەغە نەکردووە، بەڵکو بڕیاری لەسەر مانەوەی داوە، ئەوەتا ئایەتەکە بە شێوەی یاسایەکی هەمیشەیی چەسپاندوویەتی.**

**مامۆستا ساڵح نەء کوڕم، وانییە کە تۆ بۆی ئەچی، وەك پێمگوتیت، ناکرێت‌و ناگونجێت ئایەت بە بڕگە بڕگە مانا بکەین، بەڵکو ئەبێت ئایەتەکە هەمووی پێکەوە مانا بکرێت‌و بزانرێ پێش‌و پاشی ئەو ئایەتە باسی چی ئەکات، لەهەمان کاتا پەنا بریێتە بەر فەرمودە.**

**جا با ئێستا – لەسەر نەخشەی دڵپاك – بچینە خزمەتی یاسای ژمارە (٢٤)ی سوورەتی (النساء)، کەمێك لە خزمەتیا بژین، ئەوسا ڕاستیت بۆ دەرئەکەوێ.**

---

[1] تەماشای (فقه السنة)ی سید سابق، (المرأة في القرآن والسنة)ی محمد عزةی دروزة، السلام وقضايا المرأة المعاصرةی البهي الخولي، في ظلال القرآن، تەفسیری (النساء) بکە.

# مەبەست مارەکردنە نەك سیخەکردن

مامۆستا ساڵح: ڕۆڵە ئازیزەکانم یاسای ژمارە (٢٢ . ٢٣)ی هەمان سورەت کە لە پێش ژمارە (٢٤)ەوە دێن، باسی هاوسەریی (الزواج) ئەکەن. فەرمان ئەدەن بە سەر موسڵماناندا کە ژنی باوکیان . باوەژن . مارە نەکەنەوە، ئەم کارە لە پێش ئیسلاما لەناو عەرەبدا باو بوو، ئیسلام قەدەغەی کردو بە تاوانێکی زۆر گەورەی دائەنێت، حەرامە.

لە یاسای ژمارە (٢٣)دا مارەکردنی ئەم ئافرەتانەش حەرامەو حەرام کرا: دایك، کچ، خوشك، پوور، . بە هەردو جۆرەکانیەوە.، کچی برا، کچی خوشك، دایکی شیریی، خوشکی شیریی، دایکی ژن، کچی ژن . کۆڵەبەس .، ژنی کوڕ . بووك .، دوو خوشك پێکەوە، ئەفەرمووێ: "(وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتاً وَسَاء سَبِيلاً . حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً) (النساء: ٢٢. ٢٣). ئێستا پێم بڵێن ئەم دوو ئایەتە باسی چییان کرد؟

ڕووناك: بێگومان باسی مارەکردنە، چونکە نیکاح یانی مارەکردن.

مامۆستا ساڵح: ئایا هیچ بۆنو بەرامەیەکی سیخەکردنیان لێوە دێت؟

هەڵکەوت: نەخێر، ئایەتەکان واتایان ڕوونو دیارە.

مامۆستا ساڵح: دەی یاسای ژمارە (٢٤) بەدوای ئەواندا دێت. بڕگەی یەکەمی ئەمیش واتاکەی هەر لەسەر یاسای ژمارە (٢٣)یەو باسی حەرامیی مارەکردنی ژنی مێرددار ئەکات کە ئەفەرموێت: "وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء . إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ . ...". واتە ئەمیش گوزارەیەکە (خبر) بۆ نیهادی ووشەی (حُرِّمَتْ). ئەمەش بەم جۆرەی لێدێتەوە: "حرمت عليكم المحصنات من النساء . الا ماملكت أيمانكم . ". یاساکە زۆر وردە، نازانم سەرنجتان ئەیگرێت یان نەو؟

جوان: زۆر چاك لێی تێئەگەم، شتەکە ئاشکراو دیارە.

مامۆستا ساڵح: زۆر باشە، خوای گەورە ئەو جۆرە ئافرەتانەی لە موسڵمان حەرامکردووەو نیکاحیان نایەت. ئەی ئێمەی موسڵمان کێ مارە بکەین لە ئافرەتان؟ خوای گەورە وەڵاممان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: "وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُم". جگە لەوانەو لقۆچکەکانیان، ئافرەتانی تری موسڵمانو ئاییندار حەڵاڵن بۆتان.

چۆن؟ هەر ئافرەتێك دڵمان گرتی، بە زۆر پەلی بگرینو بیبەین بۆ ماڵەوە، ئیتر حەڵاڵە بۆمان؟ نەء.. نەخێر، شتی وا بۆ موسڵمان ڕەوا نییە. باشە، ئەی چۆن؟ چی بیکەین؟ ئەی چۆن حەڵاڵە؟

وەڵامەکەی بەم شێوەیەیە: موسڵمان کە مارەکردنی بووێت، ئەبێت نرخەکەی بدات، بە سامان، سامانیش (مال) مارەییە کەپێیشی ئەگوترێت (الصداق، المهر) مارەیی نەك نرخی کڕینی شەرەفو ئابڕووی ئافرەت، بەمارەکردنەوە نەك بە بێ مارەکردن: "أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَالِكُم". ئەویش بەو مەرجەی مەبەست لەو کارەدا خۆپاراستن بێ لە داوێنپیسیو خۆدوورخستنەوە لە بەدکاریی، نەك لە شێوەی زیانا کردندا: "مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ".

ئەها جوان سەرنج بدەن، لە واتاکەی ورد ببنەوە. بڕیارە خوایییەکە تەنها بە بنجبەستکردنی لایەنە ئیجابییەکە وازناهێنێ "محصنين"، بەڵکو یەکسەر نەفی لایەنە سەلبییەکەش ئەکات (غَيْرَ مُسَافِحِينَ)، بۆ ئەوەی ڕوونیی و دڵنیایی لە مەسەلەکەدا بە تەواویی دیار بێو گومان لە یاساکەدا نەتوانێت جێگەی خۆی بکاتەوە.

ئینجا ئەی موسڵمانان ئەگەر وەهاتان کرد، ژنتان بەو جۆرە هێنا، بەرامبەر بە خۆشییو لەزەتە لێیان ئەچەژن مارەییان بدەنێ. ووشەی "أجور" یانی (الصداق، المهر) لەم ئایەتەدا، جگە لەم واتایە هیچ واتایەکی تر ناگرێتە خۆ. "أجورهن" یانی (مهورهن).

لێتان ئەپرسم: کێ لە ئێوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان جارێ لە جاران، بیستوویەتی کۆمەڵێك لە کاتی خوازبێنی ئافرەتێکا بپرسێت: کرێی ئەو خۆشییەی کە ئەم مێردە لەو ئافرەتەی ئێوە ئەیچەژێ چەندە؟ داوای چەن ئەکەن؟

نەشمین: کەسمان شتی وامان نەبیسستووەو قەت ڕوونەداوە.

جوان: واللە کەسوکاری ئافرەتەکە، خوازبێنکەرەکان تێڵاترێن ئەکەن.

ماموستا سالح: دەی خوا فەرمانی وایە کە مارەیی بدرێت بە ئافرەت، ئەو مارەییەش نەك پیاو بەخێری خۆی ئەیدا، بەڵکو پێویستە واجبو (فرض)ە، خوا واجبی کردووەو پیاو جموجوڵی بۆ نییە "فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً.."

بەشوێن بڕیاردانی ئەو مافەدا بۆ ئافرەت . مافی مارەیی .، بە دوای بڕیاری فەرزێتی ئەو مارەییەدا لە لایەن خواوە دەرگا لەبەردەمی ژن و مێرددا وازە، چۆنیان بوویت، ڕێگەیان لێناگیرێت، بەپێی پێداویستی ژیانی هاوبەشیان، بەپێی هەستو سۆزیان بەرامبەر یەکتر، ئافرەت بۆی هەیە دەست لە مارەییەکەی یان بەشێکی هەڵگرێ، مێردەکەی ئازاد بکات لێی، مێردەکەش بۆی هەیە مارەییەکەی بۆ زیاد بیکات، ئەمە کارێکە پەیوەندی تەنها بەو ژن و مێردەوە هەیە. دیارە ئەمەش لەسەر ڕۆشنایی یاسا خواییەکە، کە ئەفەرموێ: "وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ". دوا بڕگەی یاساکەش هەموو هەنگاوو نیازێکی کارەکە ئەگەڕێنێتەوە بۆ لای سەرچاوە سەرەکییەکە، کە خاوەنی حیکمەتو بینایییە . کە خوای پەروەردگارە . "إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً".[1]

لە پەڕاوی (المرأة في القرآن والسنة)دا محمد عزة دروزة ئەڵێت: ".. مارەیی تەنها بەرامبەر(وطیء) جنس نییە، – واتە کرێی جیماع نییە بە تەنیا – بەڵکو بنجبەستکردنی پایەی هاوسەرێتییە بەگشتی، تەفسیرکەرانی قورئان . هەموویان . ئەم ئایەتە لە باسی سیخەکردن زۆر دوور ڕائەگرن... بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد، دەروون، حەسانەوە لە ڕای (أهل السنة) بەدی ئەکات. بەتایبەتی ئەو ئایەتەی کە ئەم عیبارەتەی تێدایە: "فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ"و ئایەتەکانای پێشی، دەربارەی هاوسەریی و بەگەورە تەماشاکردنی و پارێزگارییکردنی ژیانی هاوسەریی و بەهێزکردنی پێویستی (وجوب)ی پاراستنی ژنان و ... دەدوێن.

ئاگادارتان ئەکەینەوە کە هاوسەریی بۆ خۆپاراستن (الإحصان)ە، نەك بۆ هەوەسبازیی بە تەنیا، مەبەستی زیناکردن و ماشقەبازیی تێدا حەرامە، سیخەش نە ژنهێنان و شوکردنەو نەخۆپاراستنە، چ لە واتاداو چ لە ماوەدا، لە جۆرێك لە جۆرەکانی ماشقەبازیی تێپەڕ ناکات، چونکە مەبەستی بناتنانی پەیوەندی چەسپاوی هاوسەریی و دامەزراندنی خێزان و کەوتنەوەی بەچەی لێناکرێت.."؟

ئایا ئەوەی کە باسمانکرد . سەبارەت بە مانای ئایەتەکە . سیخەکردنی تێدا دیارە؟ بەو شێوەیەیە کە کاك هەڵکەوت ئەیگوت؟

جوان: نە بەخوا ئەمەی تۆو ئەوەی ئەو وەك ئاسمان و ڕێسمانە.

ڕووناك: جا ئەگەر سیخەکردن بەو جۆرە بێت، یانی ئەگەر ئەو ئایەتە باسی سیخەکردن بێت، ئەم هەموو خەڵکە ژنی بەو سیخەکردنە هێناوەو هەر بەوەش شوی کردوە. ئەی ئەبێ هاوسەریی چۆن بێ؟

ئاواز: بەڵام ماموستا تۆ خۆت گوتت: ماوەی چەند ساڵێك لە ژیان پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا، هەندێ لە موسڵمانان هەندێ جار پەنایان بەو کارە بردووە، وابزانم ئەم قسەیەتت لە بیرچۆتەوە.

پرشنگ: بەو پێیەش، ئەو کارە لە واقیعدا سەرچاوەیەکی ئیسلامی هەبووە.

[1] تەماشای (في ظلال القرآن) تەفسیری سورەتی (النساء) بکە.

# سیخەکردن قەدەغە ( حەرام ) کرا

ماموٚستا ساڵح: نەخێر، ئاواز خان، ئەو قسەیەم لە بیر نەچۆتەوە، بەڵام تۆ ئەوەت لە بیری خۆت بردۆتەوە کە گوتم، دوایی حەرام کرا. ئەی نەمگووت هەندێ خوو باوی سەردەمی نەفامیی تا ماوەیەك لەسەردەمی ئیسلامییدا هەر ماونەتەوە و دوایی هەنگاو بە هەنگاوو وردە وردە ئیسلام قەدەغەی کردوون، یەکێك لەو خوو و باوانەش سیخەکردن بووە؟

نەشمین: باشە، بۆ هەر لە سەرەتاوە ئیسلام حەرامی نەکرد؟

ماموٚستا ساڵح: ژیریی ئەوە پەسەند ناکات کەسێك نانی نەبێت، بڕوات پیاز بکڕێت. لەسەرەتاوە ئیسلام هەوڵی ئەوەی داوە، خەڵکی خوا بناسێت‌و واز لە بتپەرستیی بهێنێ، کچ زیندە بە چاڵ نەکات، کەی کاتی قەدەغەکردنی سیخە بووە. قورئانیش خۆ بەیەکجار نەهاتۆتە خوارەوە، بە ماوەی (٢٣) ساڵ نێرراوەتە خوارێ، بە پێی پێویستی‌و واقیعی موسڵمانان هاتووە، خوا خۆی چاك ئەزانێ کەی کاتی قەدەغەکردنی کارێکە، نەك من یان تۆ.

بێگومان یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئیسلام ئەوەیە، گرنگتر (الأهم) پێش گرنگ (المهم) ئەخات. جا خەڵك خوای گەورە نەناسێت، چۆن دەست لە سیخە هەڵئەگرێت؟

ئاواز: بەڵام ئایا لە دواییدا ئایەت هات‌و سیخەی قەدەغە کرد؟

ماموٚستا ساڵح: هەروەك ئایەت بۆ حەڵاڵکردنی سیخەکردن نەهات ئایەت بۆ قەدەغەکردنیشی نەهات.

پرشنگ: دەی ماموٚستا ئیتر لەسەر چ بن پەرگێك قەدەغە کراوە؟

ماموٚستا ساڵح: پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردوە.

نەشمین: جا شتێك خوا حەرامی نەکردبێت پێغەمبەر چۆن حەرامی ئەکا، ئایا شتی وا ئەبێت؟

ماموٚستا ساڵح: بەڵێ، ئەبێت. ئەو پێغەمبەرە ﷺ خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر، بەگوێکردنی ئەو بەگوێکردنی خوایە، یاخیبوون لێی، یاخیبوونە لە خوا، فەرمان بە کردن‌و گوتنی هەرچی بدات، پەیڕەویی کردنی ئەو شتە واجبە، نەهییش لەهەرچی بکات، وازهێنان لەو شتە واجبە لەسەر موسڵمانان، هەروەها خوا پێی ڕاگەیاندووین پێغەمبەر ﷺ لەخۆیەوە قسە ناکات، هەرچییەك بڵێت نیگا (وحی)یە بۆی دێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوە: " (وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ". (آل عمران: ١٣٢). "يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ..". (النساء ٥٩). " (وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيراً) (النساء: ١١٥) .".. مَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا..". (الحشر ٧).

ئاواز: چۆن؟ بەگوێکردنی پێغەمبەر واجبە؟ ئەی ناڵێن فلانە شت سوننەتە، فەرز نییە، واتە نەکردنی گوناهی تێدا نییە.

ماموٚستا ساڵح: بەڵێ، بەگوێکردنی پێغەمبەر واجبە، سوننەت بەو کارانەی ئەگوترێ کە خۆی ﷺ کردوونی. بەڵام بە موسڵمانانی نەگوتووە، بیانکەن. بۆ نموونە سیواکی بەکارهێناوە، خەنەی گرتووە، بەڵام فەرمانی نەداوە بەسەر موسڵماناندا کە ئەو کارانە بکەن، لەهەمان کاتدا نەیفەرمووە مەیان کەن. ئەم جۆرە کارانەی پێیان ئەگوترێت سوننەت. جا ئەگەر موسڵمانان بیانکەن ئەوا خێریان دەست ئەکەوێ، ئەگەر نەیانکەن گوناهبار نابن.سکاڵا: بە ڕاستیی ئێمە هەر بەناو موسڵمانین، هیچ لە ئاینەکەمان نازانین لەگەڵ ئەوەشدا دەمەدەمێ ئەکەین.

نەشمین: با بگەڕێینەوە سەر باسی حەرامکردنەکە، ماموٚستا فەرموو.

ماموٚستا ساڵح: وەك گوتمان، ئەو ئایەتە باسی هاوسەریی ئەكات نەك سیخەكردن، ئەو هەموو ئایەتانەی لە قورئاندا باسی هاوسەریی ئەكەن، لایەنگریی ئەم ڕاستییە ئەكەن. وشەی (الأجر) یانی (المهر) مارەیی. جا بابێینەوە سەر حەرامكردنی سیخەكردن لە لایەن پێغەمبەر ﷺو یارەكانییەوە.

## پێغەمبەرو یارەكانی سیخەیان حەرام كرد

ماموٚستا ساڵح: لەم ڕووەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرە، ئێمەش چەند نموونەیەك ئەهێنینەوە:

١. مسلم، أبو داوود، النسائي، لە "سبرة الجهني" ئەگێڕنەوە، گوتویەتی: "پێغەمبەرم دی، وەستابوو لە نێوان "ركن‌و باب"دا ئەیفەرموو: "خەڵكینە من لە سیخەكردنا مۆڵەتم پێدان، بزانن كە خوا ئەو كارەی هەتا قیامەت قەدەغەكرد، هەركەسێك هەر ئافرەتێكی بەو شێوەیە لەلایە، ڕێی لێنەگرێت‌و با بڕوات، هەرچییەكیشتان پێداوە، هیچیان لێمەسێننەوە".

٢. پێشەوا (على بن أبي طالب) ـ خوا لێی رازی بێت ـ ئەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی "خیبر"دا نەهیی لە سیخەكردن‌و خواردنی گۆشتی "الحمر الأهلية" كرد. (رواه الخمسة).

٣ ـ لە (حارث بن غزية) ئەگێڕنەوە گوتوویەتی: "لە رۆژی ڕزگاركردنی مەككەدا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو سێ جار فەرمووی: سیخەكردنی ژنان حەرامە".

٤. لە (سهل بن سعد الساعدي) گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: "پێغەمبەر ﷺ لە بەر تەنگ‌و ناچاری خەڵك، مۆڵەتی سیخەكردنیدا، لە دواییدا نەهی لێكرد".

٥. لە (كعب بن مالك) گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: "پێغەمبەر ﷺ نەهی لە سیخەكردن كردووە".

سكالاٚ: بێگومان یاران (أصحاب)ی پێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی ئەو حەرامكردنەیان كردووەو سەرپێچییان نەكردووە.

ماموٚستا ساڵح: ئەوە زۆر ڕاستە، پێشەوا مالیك لە (عروة بن الزبير) فەرموودەیەك ئەگێڕێتەوە كە ئەڵێت: "خولة بنت حكيم هاتە لای عومەری كوڕی خەتتاب‌و گوتی: ربيعة بن أمية ئافرەتێكی سیخەكردووەو ئەویش سكی پڕبوە لێی. عومەر بە توڕەییەوە چووە دەرەوە، كراسەكەی بە دوایا ئەكشا، ئەیگوت: ئائەم سیخەكردنە ئەگەر خۆم بیكەم خۆم بەردباران دەكەم".

ـ سالم كوڕی عەبدوڵلا كوڕی عومەر ئەیگێڕێتەوە: "عومەری كوڕی خەتتاب چووە سەر دوانگە (منبر) سوپاس‌و ستایشی خوای كرد، لە پاشا گوتی: هەندێ كەس چییانە كە سیخە ئەكەن، لە كاتیكا كە پێغەمبەر نەهی لێكردووە، هەر پیاوێ بزانم ئەوە ئەكات، بەردبارانی ئەكەم، ئەمجا گوتی: مارەكردن‌و تەڵاق‌و ماوەی چاوەڕوانیی‌و میرات، سیخەیان وێران كرد".

ئەم فەرمودەیەی عومەر ئەگەڕێتەوە بۆ سەر فەرمودەیەكی پێغەمبەر ﷺ كە ئەبوهورەیرە گێڕاویەتییەوە: "هدم المتعة الطلاق والعدة والميراث". (أخرجه الدارقطني وحسنه الحافظ).

ـ دیسان سالمی كوڕی عەبدوڵلا لە باوكییەوە ئەگێڕێتەوە، "بە عەبدوڵلا گوترا كە (ئیبن عەبباس) فەرمان بە سیخەكردن ئەدات، عەبدوڵلا وتی: سبحان الله، باوەڕ ناكەم ئیبن عەبباس شتی وابكات. گوتیان: با ئەو فەرمان بەوە ئەكات، گوتی: بۆچ ئیبن عەبباس لەو كاتەدا پێغەمبەر ئەژیا لە منداڵێكی بچووك زیاتر بوو، ئەمجا گوتی: كاتی خۆی بە زینا ئەژمێرا، پێغەمبەر نەهی كرد لێمان".

ـ لە (محمد بن الحنفية) گێڕدراوەتەوەو گوتویەتی: "عەلی‌و ئیبن عەبباس لەبارەی سیخەكردنی ژنانەوە قسەیان ئەكرد، عەلی پێی گوت: تۆ كابرایەكی گومڕایت، پێغەمبەر نەهی لە سیخەكردن لە (حجة الوداع) دا كرد".

. پێشەوا (أبو عبيد) كە لە سەدەی دووەمو سێیەمدا، لە پێشەوایانی فەرمودە (أئمة الحديث) بووە گوتوویەتی: "ئەمڕۆ موسڵمانان بە تێكڕا لەسەر ئەوەن، سیخەكردن هەڵوەشاوەتەوەو چ بە هۆی قورئانو چ بە هۆی فەرمودەوە".

تەفسیركەری (الخازن) كە ئەم قسەیەی (أبوعبيد)ی هێناوە، بە دوای ئەو قسەیەدا ئەڵێت: "ئەم قسەیە، قسەی (أهل العلم)ە بە تێكڕا، لە خەڵكی حیجازو شامو عێراق، هەروەها قسەی خاوەن شوێنەوارانو خاوەن ڕایە، ئیتر سیخەكردن بۆ ناچارو ماچار مۆڵەتی پێنادرێت، (أهل السنة)ش بە گشتی پەیڕەویی ئەم ڕایە ئەكەن".[1]

سكاڵا: خوا پاداشتت بداتەوە مامۆستا گیان، بە ڕاستیی دڵم ئاوی خواردەوەو و لە ترسو گومان قوتارت كردم، ئای! كە خۆشە موسڵمان لە ئاینەكەی شارەزا بێت، چونكە كاتێ كە شارەزابیت ناحەزانو شارگردانی كوفر ناتوانن فریوی بدەن.

مامۆستا ساڵح: زانا (الخطابي) دەڵێت: "حەرامكردنی سیخەكردن وەك بە كۆ (الإجماع) وایە، جگە لە هەندێ (شيعه) نەبێت، كە ڕایەكی تریان هەیە".[2]

هەروەها (البيهقي) ئەگێڕێتەوە: "لە جعفر بن محمد، لەبارەی سیخەوە پرسیاریان لێكردووە، گوتویەتی: "هي الزنا بعينه".[3]

زانا (الشوكاني) ئەڵێت: "بەهەرحاڵ، ئێمە گوێڕایەڵی ئەوەین كە لە لایەن شەرعدانەرەوە (الشارع) پێمان گەیشتووە، حەرامكردنی . سیخە . بۆ هەتا هەتایە پێمان گەیشتووەو دوودڵی تێدا نەماوەتەوە.. چون، لە كاتێكا ، جمهوری یاران ئەو حەرامكردنەیان توندگرتووەو كاریان پێكردووەو بۆیان گێڕاوینەتەوە؟ تەنانەت (إبن عمر) ئەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ لە سیخەدا مۆڵەتی پێداین لە پاشا سێ جار حەرامی كرد، سوێند بە خوا بزانم هەر پەرژیندارێك (محصن) سیخە ئەكات، ئەبێ بەردبارانی بكەم". (أخرجه أبن ماجة بإسناد صحيح).

## شاردنەوە لە سروشتی ئیسلام نییە

ئاواز: مامۆستا ناوی (ئیبن عەبباس)ت هێنا، كەچی لێت شاردینەوە.

مامۆستا ساڵح: ئاواز خان، سروشتی ئاینی ئیسلام وەهایە، بەنجی مێشك ناكات، شاردنەوەی تێدا نییە، چاوبەستی ناوێت، بەڵكو مێشكی داخراو ئەكاتەوە، ڕاستی ئەخاتە بەردەستی مرۆڤایەتی، چاوە خەواڵووەكان هەڵ ئەهێنێ، مەردم بێدار ئەكاتەوە.

سوپاس بۆ خوا ئیسلام ڕۆشنە، ورشەدارە، بێكەموكوڕییە، وەك خۆری ئاسمان هەمیشە تیشك ئەهاوێت، هەموو كەسێك بۆی هەیەو ئەتوانێ خۆی بەدەستی خۆی ئەم دیوو ئەو دیوی بكات، لێكۆڵینەوە ی دەربارە بكات، شاردنەوەی تێدا نییە، شاردنەوە بۆ شتێك ئەبێت كە نەنگو كەموكوڕی تێدا بێت، ناتەواوی تێدا بێت، ئیسلامیش لەوە دوورە، شاردنەوەی چی؟ جا ئێستاش ئەو باسەی (ئیبن عەبباس) ئەهێنینە كایەوە.

لە (تهذيب السنن)دا هاتووە: "بەڵام ئیبن عەبباس ڕێگەی بە سیخەكردن داوە لە كاتی پێویستیو ناچاریدا، بەس بە فروانیی (إطلاق) ڕێگەی پێنەداوە، كاتێ بیستی سیخە لە ناو خەڵكا زۆر بووە، لە ڕاكەی دابەزی لەگەڵ ئەوەشا بۆ ناچاریی نەبوایە مۆڵەتی نەئەدا".

---

[1] بۆ زیاتر شارەزابوون تەماشای (المراة في القرآن والسنة)ی محمد عزة دروزة، بكە.

[2] فقه السنة ج٢ للسيد سابق.

[3] فقه السنة ج٢ للسيد سابق.

"الخطابي" ئەڵێت: "سعيد بن جبير گوتی: بە ئیبن عەبباسم گوت: ئایا ئەزانی چیت کردووە؟ چ فتوایەکت داوە؟ بەهۆی فتوای تۆوە سوارە سوار بوەو شاعیران هاتنە زمان، گوتی: چیان گوتووە؟ گوتم: گوتیان:

قد قلت للشيخ لما طال محبسه          يا صاح هل لك في فتيا إبن عباس؟

هل لك في رخصة الاطراف آنسة          تكون مثواك حتى رجعة الناس؟

"ئیبن عەبباس" گوتی: "إنا لله وإنا اليه راجعون" سوێند بەخوا من فتوام بەمە نەداوە، ئەمەیشم نەویستووە، تەنها ئەوەندەم بە حەڵاڵ داناوە کە خوا گۆشتی مردوو خوێن و گۆشت بەرازی بە حەڵاڵ داناوە، بۆ ناچارنەبێت حەڵاڵ نییە، وەك گۆشتی مردوو و خوێن و گۆشت بەراز بەولاوە هیچی تر نییە".

هەروەها "مسلم" لە (عروة ابن الزبير) ئەگێڕێتەوە: "لە ڕۆژانی پێشەوایەتیی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێردا لە مەککە عەبدوڵڵا لە وتارخوێندا هەڵساو گوتی: "چەند کەسانێك کە خوا دڵی کوێرکردوون وەك چاویان فتوای سیخەکردن ئەدەن . ئەوەش ئیبن عەبباسی ئەگرتەوە . ئیبن عەبباس بانگی لێکردو گوتی: تۆ دەستبەتاڵێکی وشکی، دڵڕەقێکی ووشکی، (إنك لجلف جاف لعمري) لەسەردەمی پێشەوای لەخواترسانا (إمام المتقين ) . واتە پێغەمبەر ﷺ . سیخە هەبوو. عەبدوڵڵای کوری زوبێریش پێیوت: ئادەی تۆ ئەوە بکە، سوێند بەخوا ئەگەر بێتو بیکەیت بەردبارانت ئەکەم".

دڵپاك: هەڵبەت ئەم وتوێژەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو ئیبن عەباس، لەپێش ئەوەدا بووە کە ئیبن عەباس لە فەتواکەی پاشەکشێی کردوە.

مامۆستا ساڵح: وا دەرئەکەوێ، لەڕاستیدا ئیبن عەباس ڕاست ئەکات، چونکە . وەك باسمان کرد . تا ڕزگارکردنی شاری مەککە، سیخەکردن حەرام نەکرابوو، ئەوەتا (الشيخان) . مسلم و بوخاری . لە جابیرو سەلمەوە ئەگێڕنەوە: "لە سوپایەکدا بووین پێغەمبەر ﷺ پێیگوتین: مۆڵەتتان هەیە سیخە بکەن، دەی سیخە بکەن".

بەڵام دوایی ئەم کارە لەلایەن پێغەمبەرو یارەکانییەوە قەدەغەکراو بەیەکجاریی دەرگای داخراو هەرگیز ڕێگەی پێنادرێت. هەرکەسیش بیکات حەرامە.

ڕووناك: مامۆستا لە باسەکەدا ئەوەت هێنایە یادمان شیعەکان لەسەر سیخەکردن ماونەتەوە، ئەوە چۆن و بۆچ؟

پرشنگ: بەڵێ، بەڵێ تا ئێستاش شیعەکان هەر سیخە ئەکەن.

هەڵکەوت: بەڵێ، ئەوە شتێکی ئاشکرایەو ئەیکەن.

## تەنها بەشێکیان لەسەر ئەو ڕایەن

مامۆستا ساڵح: ئاه، پێشەکی، هەرچەندە وشەی شیعەو سوننەو ئەم مەزهەبو ئەو مەزهەب ئەبیستم، وائەزانم چنگێکی نینۆك ئاسنینی خوێناوی ئالاوەتە قوڕگم، ئەیەوێ بمتاسێنێ، بمخنکێنێ. یان وا هەست ئەکەم کە شیشێکی ئاسنی سوورەوەکراو ئەکرێت بە جگەرمداو پەردەیەکی ڕەش بەسەر بیلبیلەی چاومدا ئەکشێت و لەخەڵاتی دیتن بێبەشم ئەکات.

نازانم ئێمەی موسڵمان تاکەی بێدار نەبینەوە؟ تاکەی هۆشمان بەخۆماندا نەیەتەوە؟ تاکەی نێچیری ڕاوکەرانی کافر بین؟ چۆن ئەبێ دوای پلانە سامناکەکانی شەیتان و داروەدەستەکانی بکەوین؟ کەی ڕاستە کە ئیتر وریا نەبینەوەو هەست بە مەترسی دوبەرەکیی و پەرتەوازەیی نەکەین؟ تاکەی .. تاکەی؟؟

کوفر هەموو دەمێ لە هیچی هیچ نەبووە، لەشت تاشیندابووەو هەرگیز لەوەش ناوەستێ و هەمیشە هەوڵی دۆزینەوەی کەلەبەرێك ئەدات، تا خۆی بکات بە ناوا بۆ بێهێزکردنی ئیسلام، تابتوانێ بەیەکجاریی داری ئیسلام

له ڕیشه دەربێنێ. خۆ کەلەبەریی دووبەرەکییو بەش بەش بوون، له هەموو شتێکی تر سامنکاترە، مەترسیدارترە، ئەوان تۆوی دووبەرەکییان وەشاند، ئەوەتا نەك هەر چەکەرە، بەڵکو گوڵو تۆویشی کردووە ئەمەتا ئێمه خەریکی دروێنەکەینی.

ڕۆڵە شیرینەکانم وریابن، وریا له ستراتیژێتی کوفر که "فرق تسد" ە، خۆتان بپارێزن ، شیعەی چیو سوننەی چی؟ ئێمه موسڵمانین موسڵمانو بەس، مادام هەردوولا یەك خوا . که الله . یە، ئەپەرستین، یەك پێغەمبەرمان هەیە که (محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب)ە، یەك پەڕاومان هەیە که قورئانە، یەك ڕووگیەمان هەیە که (کعبە)ی پیرۆزە، کەوابێ هەموومان موسڵمانین، موسڵمان.

ئێمه له بنەڕەتدا یەکین، با پەیڕەوی بنەڕەتەکان بکەین، با بیر له بنەڕەتکان بکەینەوە، بۆچ بکەوینه دوای دڵقۆڵچکەو پەلوپۆی بچکۆلانەی دروستکراو؟ کەی ڕەوایە بنەڕەتەکان بکەین به قوربانی لقۆچکە؟ تاکەی هەست بەم دەردە گرانە نەکەین؟.

کوفر یەك ئەگرێ ئێمه یەك ئەجووین

لەم ڕێگەیەوە ژێر دەستەی کردووین

جا ئەگەر ئێمەی خوێندەوار، ئێمه ڕۆشنبیر بیر لەم دەردە پیسە نەکەینەوەو نەگەڕێین به دوای دەرمانەکەیدا، کێ بیری لێبکاتەوەو بگەڕێت بەدوای دەرمانەکەیدا؟ بێتو ئێمه گوێ بدەین بەو لقۆچکە دروستکراوانە، بێگومان موسڵمانە نەخوێندەوەراکانمان، زیادەڕەویان تێدا ئەکەن، به بنەڕەت تەماشایان ئەکەن، بەوەش جیاوازییو دووبەرەکیی پەرەئەستێنێ، ئیتر هەموو ڕەنجو ئاواتێك ئەدرێت به ئاودا، دنیاو قیامەتمان لەدەست دەرئەچن.

سکالاّ: باشه مامۆستا دەرمانی ئەم دەردە چۆن بدۆزینەوە؟

مامۆستا ساڵح: کچی بەڕێزم، دۆزینەوەی چی؟ دەرمانەکە ئامادەیە، لەبەردەستماندایە، خوای گەورە نیشانی داوینو له قورئانا ئەفەرموێت: "وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ ..". (آل عمران: ١٠٣). دیسان ئەفەرموێت: "وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ". (الأنفال: ٤٦) دەی دەرمان لەمە ڕوونو ئاشکراو چاکتر هەیە؟

سکالاّ: نەبەخوا، بەڵام دەرمان بەبێ بەکارهێنانی دەرد لەناو نابات.

مامۆستا ساڵح: ئاواتی هەرەبەرزی هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینەو دڵسۆز بۆ ئیسلام، ئەوەیە که ڕۆژێ بێتە پێشەوە زاناکانمان . شیعەو سوننە . بیر لەم دەردە بکەنەوە، به وردیی لێبکۆڵنەوە، به گیانێکی موسڵمانانەی بێگەردەوە، بەرەو بەکارهێنانی ئەو دەرمانە خواییە هەنگاو هەڵبگرنو بەو هەنگاوە مەزنە چاوی ناحەزانی ئاینی خوا کوێر بکەن.

*                    *                    *

مامۆستا ساڵح: برا شیعەکانمان، که تا ئێستاش باوەڕیان به حەڵاڵیی سیخەکردن هەیە، ئەڵێن ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء) – که کاك هەڵکەوت پەنجەی بۆ ڕاکێشا – سیخەی حەڵاڵ کردووە، پێغەمبەریش ﷺ لایەنگیریی کردوەو ئەو حوکمەش دامەزراوو چەسپاوەو هەڵنەشاوەتەوە.

لەلایەکی تریشەوە گوێ بەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ نادەن کەباسی حەرامکردنی سیخە ئەکەن. چونکە ئەوان هەر فەرمودەیەك له ڕێگەی پێشەوایانی خۆیانەوە نەیانگاتێ جێگەی باوەڕیان نییە، هەروەها باوەڕیان نییە بەوەی که سوورەتی (المؤمنون) . وەك هەندێ کەس ئەیڵێت . سیخەی حەرام کردووە. جگە لەوەش هەندێ واتە (قول) له عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ئەگێڕنەوە گوایا لایەنگیریی مانەوەی سیخە ئەکەن به حەڵاڵیی.

یەکێك لەوانە گوایا عەلی فەرموویەتی:"لولا أن عمر نهی عن المتعة لما زنا الا شقيء".

ڕووناك: واتە ئەوان وا بیر ئەکەنەوە، که عومەر سیخەی قەدەغە کردووە، پێغەمبەر قەدەغەی نەکردووە.

ماموٚستا ساڵح: بەڵێ ئەوان وابیر ئەکەنەوە، ئێمەی سوننەش هەرگیز باوەڕ ناکەین بەوەی عەلی ئەوەی فەرمووبێت، چونکە ئەمە لە سەرێکەوە تاوانبارکردنی عومەرە کە کارێکی زۆر خراپە، لەسەرێکی ترەوە ئەوەبوو باسمان کرد کە عەلی لەسەر مەسەلەی سیخە بە ئیبن عەباسی فەرموو: "إنك إمرؤ تائه ان رسول الله قد نهانا عن متعة النساء في حجة الوداع".

جا عەلی کە ئەمە بە ئیبن عەباسی ماموٚزای بڵێت، چۆن ئەوەش بە عومەر ئەڵێت؟ کە ئەوەی بە عومەر گوتبێ، چۆن ئەمە بە ئیبن عەباس ئەڵێت؟ شتی وا لە عەلی پێشەوا قەت نەوەشاوەتەوە.

یەکێکی تر لە بەڵگەکانیان، ئەوەیە گوایا: "جابر بن عبدالله لەوەلامی پرسیارێکدا گوتویەتی: ".. بەڵێ، لە زەمانی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەردا سیخەمان ئەکرد".

یەکێکی تر لە بەڵگەکانیان، "دوو جۆرە سیخەکردن لە زەمانی پێغەمبەردا حەلاڵ بوون، من حەرام‌و قەدەغەیان ئەکەم‌و خەڵکیان لەسەر بەسزا ئەگەیەنم، سیخەی مارەکردن‌و هی حەج کردن". بێژەری ئەم واتە (قول)ە نادیارە، کەچی ئەم قسەیە بە دەم عومەری کوڕی خەتتابەوە ئەگێڕێتەوە، تەماشای ئەم داوە بکە، سەرنجی لێ بدەن، چۆن عەلی ئەکەن بە دوژمنی عومەر، چۆن درۆ بە دەمی عومەرەوە ئەکەن، لە کاتێکا ئەوەی کە ئەم جۆرە قسانەی هێناوە، لەسەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوەوە وەری نەگرتووە، لە دروستکردن‌و هەڵبەستنی دەستی ناحەزانی ئیسلام بەولاوە هیچی تر نییە.

ئەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت، برا شیعەکانمان هەموویان لەسەر ئەم ڕایە نین. – وەك شارەزایان باسی ئەکەن – تەنها شیعە (إمامی)ەکان لەسەر ئەم ڕایە ماونەتەوە.

ڕۆڵە شیرینەکانم ، بۆ بەدبەختی، شیعەش یەك پارچە نین، بەڵکو چەند تیرەو پارچەیەکن، جیاوازییان لە نێواندا هەیە، ناحەزانی ئیسلام لە سنوورێکدا ناوەستنەوە، هیچ لایەنێك بێ گۆبەن‌و گازلێگرتن ناهێڵنەوە. بیریان لەوە کردۆتەوە کە ڕێکخستنەوەی دووپارچە یان دوو تیرە، لەوانەیە کارێکی ئاسان بێت، ئینجا بۆ ئەوەی ئەو ئاسانییە ئاڵۆز بێت، هەوڵی جیاوازیی‌و دووربەرەکیی‌و زۆرپارچەییان داوە. هەوڵەکەشیان سەری گرتووە. ڕەنجیان بە فیڕۆنەچووە.

سکالاّ: جا ئەگەر کوفر وەهای نەکردایە، موسڵمانان، وەك ئێستایان چۆن بەسەردا ئەهات، کەچی هەستیش بە خۆمان ناکەین.

هەڵکەوت: ماموٚستا لام وایە ئەگەر سیخە قەدەغە نەکرابایە، کەڵك‌و قازانجی لەزیانی زۆرتر ئەبوو.

## بابیدەینە بەر تیشکی ژیریی‌و ژیربێژیی

ماموٚستا ساڵح: کوڕی ئازیزم، ئەزانم تۆ تەماشای کام لایەنی ئەو بابەتە ئەکەیت، ئەزانم بیر لە کوێی ئەکەیتەوە، تۆ تەنها لایەنە سێکسیەکەی ئەهێنیتە بەرچاوت، ئیتر بیر لەوە ناکەیتەوە کە دەیان زیان خۆیان لەو کارەدا مەڵاس داوەو بەدبەختییەکی گەورەی بۆ ئافرەت بەدەمەوەیە.

جا حەز ئەکەم بابەتەکە بدەینە بەر تیشکی ژیریی‌و ژیربێژیی تا ڕاستیی بەدەستبهێنین، بەو هیوایەی ئەوانەی کە پەیڕەویی سیخە ئەکەن، یان بە کارێکی بەکەڵکی ئەزانن، بێداربنەوە، چاو هەڵبێنن، لێی بکۆڵنەوە، بەوردیی لێی تێبگەن.

ئەوکارە پێغەمبەر ﷺ حەرامی کردووە، ئەو کەسەیش کە خۆی بە موسڵمان ئەزانێ، پێویستە لەسەری بەگوێی پێغەمبەر بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ . وەك گوتمان . بەهەوەسی خۆی قسەی نەکردووە: "وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى * عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى". (النجم:٣. ٥)

خۆ ئەگەر ئەو حەرامکردنە چاکەی تێدا بوایە کەڵکی لە زیانی کەمتر بوایە، خوای پەروەردگار بەرپەرچی ئەم حەرامکردنەی بەشێوەی قورئان ئەدایەوە. نموونەی ئەم بەرپەرچدانەوە لە چەند لایەکی قورئاندا لەسەر هەندێ مەسەلە بەرچاو ئەکەوێت. ئەمجا مادام بەرپەرچدانەوە سەبارەت بە حەرامکردنی سیخە لە قورئاندا نییە، کەواتە خوا بەو حەرامکردنە ڕازی بووەو خۆی خستوویەتییە دڵی پێغەمبەروە ﷺ، خوایش شتی پاكو بە کەڵك لە بەندەکانی خۆی حەرام ناکات.

ئیسلام وەنەبێت لایەنی جنسیی فەرامۆش کردبێت، ئەوەتا زۆر بە پەرۆشەوە ڕێگەی تێربوونی ئەو ئارەزووەی لە شێوەی هاوسەرییدا خستۆتە بەرچاومانو هەڵمان ئەنێ کە ئەو ڕێگەیە بە بەردانی کوێر نەکەینەوە.

ئاواز: دەی ئاخر سیخەش هەر هاوسەرێتییە، تەنیا ناوەکانیان جیان.

مامۆستا ساڵح: وادیارە ئێوە هاوسەرێتیی تەنها لە دەلاقەی سێکسەوە تەماشا ئەکەن، چۆن قسەی وا ئەکەیت؟ هاوسەرێتی لە ئیسلامدا تەنیا سێکسکاری نییە، دەیان مەبەستی خاوێنی گرنگی تێدایە، لەوانە:

مناڵ خستنەوە، خۆشەویستییو دۆستایەتیو خزمایەتیی دروستکردن لە نێوان ژنو مێردو کەسو کاریاندا، ئارامگرتنو ئاسوودەیی گیانی ژنو پیاوو هێمنی دەرونیان، پێگەیاندنو پەروەردەکردنی بەرەو وەچە.

هەروەها لە هاوسەرێتییدا مارەیی ئەدرێت بە ئافرەت، مافو ئەرکی ژنو مێرد دیاریی ئەکرێت، میرات بۆ هاتنەوەی تیایە، هاوسەرێتی بۆ درێژیی تەمەنە، بۆ پێکەوە ژیانە، لە چوارچێوەی خێزانێکی پڕ لە ئاسوودەییدا، لەهەمان کاتدا تێرکردنی ئارەزووی بە پوختەترین شێوە تێیدا دێتەدی. ئایا سیخەکردن جگە لە سێکس هیچکام لەو ئامانجە گرنگانە دێنێتەدی ئیتر چۆن سیخەو هاوسەرێتی تەنیا لەناودا جیان؟

سکالا: بەخوا وەکو ڕێسمانو ئاسمان وەهان.

مامۆستا ساڵح: بیرکردنەوە لە هەنگاونان بەرەو بەختیاریی ئافرەت بە سەرمانا ئەسەپێنێ کە بپرسین: ئایا سیخەکردن سەربەرزیی ئافرەتی تێدا بەدی ئەکرێت؟ ئایا ئافرەتەکە ناکاتە کەلوپەلو پیتاکێك وەك کەلوپەلو پیتاکەکانی تری ناو بازاڕ، هەر ڕۆژێك بەدەستی پیاوێکەوە بێت؟ ئەی نایخاتە بەر پلاری نەخۆشیی لاشەییو دەروونیی جۆربەجۆرەوە؟ ئایا بێنرخیی بۆ ئافرەت بەدەمەوە نییە؟ ئاسا ئافرەت دڵنیاییو ئارامییو نیشتەجێی ناوێ؟ ئایا پێویستیی بە هێلانەیەکی هەمیشەییو هاوسەرێکی گونجاوو نەگۆڕاوو بزەی سەر لێوی مناڵ، لە چوارچێوەی خێزانێکدا نییە؟ ئەی ئەو مناڵانەی کە لە ڕێگەی سیخەوە لەدایك ئەبن چییان لێبکەین؟ بدرێن بەسەر دایکەکەدا، چۆنیان بەخێو بکات؟ ئەگەر بیاندەین بەسەر باوکەکەدا ئایا لە سۆزی دایکایەتی بێبەش نابن؟ ئایا ئەو دایکەش لەسۆزی دەروونییو ئارەزووی دایکێتی (الأمومة) بێبەش ناکرێت؟ خۆ ناتوانرێت بدرێن بەسەر هەردووکیاندا، چونکە ئەوان پاش ماوەیەك لەیەکتر جیا ئەبنەوە.

نەشمین: چی ئەبێت، ئەگەر حەبی مناڵ نەبوون بەکاربهێنرێت؟

مامۆستا ساڵح: لا إله الا الله، تو خوا ستەم نییە کە ئادەمیزاد ئامادە بێت بۆ پێشێلکردنی هەموو شتێکی نایابو بەنرخ لەبەرخاتری سێکسێکی ڕووت، لە کاتێکا ئەو سێکسە لە پاکترین شێوەیدا خوای میهرەبان ڕەوای کردووە بۆمان بە شێوەی هاوسەریی ڕەوا. نازانم ئێوەی ئافرەت خۆتان چۆن بەڕەوای ئەزانن کە ئافرەت دەوری ئاودەست ببینێ لە ژیاندا، هەرکەسێ تەنگاو ببێت، بچێتە سەرئەو ئاودەستەو خۆی تێدا خاڵی بکاتەوە؟ ئەبوایە ئەگەر پیاوێك ئەم قسەیەی بکردایە، بە گەورەترین دوژمنی خۆتانتان دابنایەو نەفرینتان لێبکردایە. ئافرەت

ئادەمیزادەو کارگەی بەرهەمهێنانی ئادەمیزادە، بەهەشت لە ژێر پێی ئەودا دەست ئەکەوێت، ئافرەت ئاودەست نییە.

سکالاَ: لە قولاَیی دەرونمەوە، شایەتی ئەدەمو ژیریی‌و ژیربێژیی داوام لێئەکەن کە بڵێم: ئیسلام بەرنامەی خوایە، لەگەڵ سروشتا ئەگونجێ، پاکیی‌و بێگەردیی ئادەمیزاد ئەهێڵێتەوەو ئەیپارێزێ هەر یاسایەك کە هێناویەتی، پڕاوپڕی سروشتی ئادەمیزادە. سوپاس بۆ خوا کە ئیسلامی کرد بە ئاینیمان.

مامۆستا ساڵح: هەموو یاساکانی ئیسلام بەو شێوەیە وردو ڕاست‌و ڕێك‌وپێکن، گونجاوی فیترەی ئادەمیزادن، چۆن نەء؟ دانەری ئەو یاسایانە خوایە، خوایش بەدیهێنەری ئادەمیزادە، بەهەست‌و نەست‌و هەوەس‌و ئارەزووەکانی ئەزانێ‌و بەدەردو دەرمانی دەردەکانیشی ئەزانێت. ئایا کەس هەیە لە خوا زاناتر؟ أستغفر الله.

بەلاَم بە داخەوە ئێمەی نەزان، ئێمەی نەشارەزا، لە ئاینەکەمان، ئێمەی دور لە لێکۆڵینەوە، تفەنگ بە تاریکەشەوەوە ئەنێین‌و تف لەناوچاوانی خۆمان ئەکەینەوە، وا فریودراوین کە ڕێ لە بەختی خۆمان نابەین، نازانین‌و نایشزانین کە نازانین، بۆیە دژی ئاینەکەمان وەستاوین‌و دوژمنکاریی لەگەڵدا ئەکەین.

بەناو موسڵمان، سادەی هیچ نەزان دوورو نائاشنای حەدیث‌و قورئا ن

تۆ کە نازانی، بڵێ نازانم بڵی، هەر بەناو من موسڵمانم

کوانێ بەڵگەت شیاویت کوا تا ڕەخنە بگری لە بەرنامەی خوا

قسەی بێ بەڵگە تەزاوو نایکێشێ سەر لە بەرد دانەو خۆت سەرت دێشێ

سکالاَ: مامۆستا بەیارمەتییت، من تەلەفۆنێ ئەکەم بۆ سەربەستی برام.

مامۆستا ساڵح: فەرموو کچم.

# زاراوەكانت هەڵگەڕاوەن

ڕووناك: مامۆستا ئەوەی باستكرد بۆمان ڕاستو جوانە، بەڵام با واقیعیی بینو لە واقیع بدوێین. ئاشكراو ڕوونو دیارە، ئافرەتی خۆرئاوا پێشكەوتووە، خاوەنی كەسایەتیی خۆیەتی، سەربەخۆو سەربەستە، چەوساوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو دەستكەوتو مافانەی لە ڕێگەی ئایینەوە بەدەس نەهێناوە. خۆ زیادەڕۆیی نییە كە بڵێم بە دووركەوتنەوە لە ئایین، شكاندنی كۆتو زنجیری ئایین، ئەو دەستكەوتانەی دەست خۆی خستووە. پێشكەوتنو زانیاریی لەوەدا یارمەتیدەری بوون، نەك ئایینو ئامۆژگاریی پیاوانی ئایین. ئەمەش واقیعێكی هەست پێكراوە، باوەڕ ناكەم هیچكەس بتوانێ سەرپێچی لێبكات.

مامۆستا ساڵح: خۆشحاڵم بەو ڕاستو ڕوییەی كە بەدیم كرد لێت، پێمخۆشە ئەوەی لە دەرونتانا پەنگی خواردۆتەوە دەریبڕنو نەیشارنەوە تا لێی بكۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام.

ئەوەی دەرتبڕی لەچەند سەرێكەوە تاڕادەیەك ڕاستیی تێدایە، سەرپێچیكردنیش لە ڕاستیی لە ئیسلامەوە دوورەو كاری موسڵمانی ڕاستەقینە نییە، بەڵام زۆربەی زاراوەكانت بە هەڵگەڕاوەیی كەوتۆتە مێشكەوە. ئەو قسانەی تۆ – ڕێزم بۆ جەنابت هەیە – ئەگەر "ئارەزووباز"ێك بیانكات، یەكسەری پێی ئەڵێم، ڕاست ئەكەی، بەڵام لە قوتابیو شەیدایەكی ڕاستیی (الحقیقة) بیانبیسم پێی ئەڵێم: بەڵێ، ئافرەتی خۆرئاوا، پێشكەوتووە، بەڵام نەك لە هەمو سەرێكەوە، بەڵكو تەنها لە چەند سەرێكەوە، بگرەو لە چەند سەرێكەوە زۆر دواگەتووەو بەجێماوە، زانستو زانیاریی شارستانییەتیان لەخۆرئاوادا هێناوەتە دی، لە ژیانی خۆرئاواییەكاندا ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام ئایا هەرچییەك كە لە خۆرئاوادا هەیەو ئەكرێت، ئەتوانین بە پێشكەوتنو شارستانییەتی بژمێرین؟ ئایا ئەو پێشكەوتنە هەر خۆی لە خۆیا مرۆڤانەیە؟ ئایا ئەو شارستانییەتەیان خزمەتی مرۆڤایەتی لە هەموو سەرێكەوە – بەبی مزە – ئەكات؟

نەشمین: ئەی بۆچ نەء؟ ئەتوانین بڵێین بەڵێ.

مامۆستا ساڵح: ڕاستە ئافرەتی خۆرئاوا لە ئایین دوورخراوەتەوە، بەڵام ئایا بەوە قازانجی كردووە، ئایا ئایین كۆتو زنجیرە بۆ ئافرەتو ڕێگای پێشكەوتنی لێئەگرێت؟ سەربەخۆییو ئازادیی لێزەوت ئەكات؟ لەهەمووی سەیرتر، ووشەی "كەسایەتیی" بوو كە بەكارتهێنا، بەراستی واقیع شەرم لەو كەسایەتییە ئەكات.

بەداخەوە ئێمە خێرا باوەڕ بە قسەی خەڵك ئەكەین، هەرچی ئەبینین تەنها تەماشای ڕواڵەتەكەی ئەكەین، نامانەوێ جەوهەرەكەی ببینین، بیرمان تەسكە، هەرچی دەربارەی خۆرئاوا بڵێن پێمان یەكسەر وەری ئەگرینو بە ڕاستی ئەزانین.

هەرچی ئەبیسین بڕاوی پێئەكەین هەركەس دیاربێت پەنای پێئەبەین
لەكوێدا ڕێكەوت باری لێئەخەین چیمان دەرخواردەن گورج قووتی ئەدەین[1]

هەڵكەوت: مامۆستا گیان، ژیانی ئافرەتی خۆرئاوا گاڵتەی پێناكرێت.

پرشنگ: ژیانی شیرینی ئافرەتی خۆرئاوا، نەبەدەمی ئێمەو نەبەدەمی سەدەهای وەك ئێمە تاڵ نابێت، گەیشتۆتە چڵەپۆپە.

مامۆستا ساڵح: با پەلە نەكەین، خوایاربێت، بۆمان دەرئەكەوێ.

1 سروەی بێداری، چاپی یەكەم ١٩٨٥.

# ئافرەتی خۆرئاوا ناچارکرا

جوان: ماموستا گیان، تۆ لە ئێمە چاکتر ئەزانی کە ئەمڕۆ ئافرەت لە خۆرئاوا شان بە شانی پیاو لە هەموو شوێنێکی کارکردنا کار ئەکات، خاوەنی دارایی ئەوتۆی خۆیەتی، ئیتر منەتی پیاو . وەك ئەوسا . هەڵناگرێت، ئایا ئەمە دەستکەوتێکی کەمە؟ بێبەلا بی تۆ چی ئەفەرمووی؟ ئەمە شتێکی نەشاراوەیە.

هەڵکەوت: خۆرئاوایە.. خۆرئاوا، گاڵتەی پێناکرێت.

ماموستا سالح: ڕۆڵە گەنجە خوێنگەرمەکان، بەڵێ، زۆر چاك ئەزانم کە ئافرەتی خۆرئاوا . بەشێکی . خاوەنی دارایی خۆیەتیو ئەتوانێ خۆی خۆی بژێنێ، هەشیانە زۆر دەوڵەمەندە. بەلام ڕەنگە ئێوە وا بزانن کە ویژدان پاکییو بیری ڕۆشنی پیاوانی خۆرئاوا بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لە کۆتو زنجیری ئایین، ئا ئەو هەلە زێڕینەیان دەست ئافرەت خستبێت، ئایا پیاوانی خۆرئاوا، کە دەستیان لە ئایین هەڵگرت، بەوە سۆزو بەزەییان بەرامبەر ئافرەت جۆشاو خرۆشاو ئیتر ڕێککەوتن لەسەرئەوە کە ئافرەت بکەن بە خاوەنی داراییو نانو سامان هەتا لە جەوری پیاو ڕزگاری ببێت؟

پرشنگ: بێگومان .. بێگومان، من لەوە زۆر دڵنیام، ئەرێ. بەلام ئەوەش لە دوای تێکۆشانێکی بێوچان لەلایەن ئافرەتەوە ئەمجا هاتەدی.

نەشمین: ناڵێین ئەو سەربەستییو سەربەخۆییە، خەلاتێك بوو لەلایەن پیاوەوە بۆ ئافرەت، بەڵکو تەقەلاو بەرهەمی هەوڵی ئافرەت خۆی بوو.

ماموستا سالح: نەخێر، ڕۆڵە گیان، وەها نەبوو، وایش نییە کە ئێوەو ئێوەومانان لێی تێگەیەنراون، منیش ئێستا هەقی خۆمە ئەم پرسیارە ئاڕاستەی ئێوە بکەم، ئەو هۆ سەرەکیانەی پاڵیان بە ئافرەتی خۆرئاواوەنا کە دەستبداتە کارکردنو لە دواییدا ببێتە خاوەنی سامانو داراییەکی ئەوتۆو خۆی خۆی بەخێو بکات، چیبوون کامانە بوون؟

هەڵکەوت: وەك ماموستا ڕووناك وتی شکاندنی کۆتو زنجیری ئایین، پەیدابوونو بلاوبوونەوەی خوێندەوارییو ڕۆشنبیرییو پیشەسازیی لە خاکی خۆرئاوادا، ڕاپەڕینی سەرەمڕەی ئافرەتان، هاندانیان لە لایەن بیری نوێو ئازادیخوازانەوە، ڕاکردن لە ژێردەستەییو ستەمکاریی پیاوان ئەمانە گرنگترین هۆ بوون، دیارە هۆی تری گچکەی لاوەکیش هەبووە کاری خۆیانیان کردووە.

ماموستا سالح: ئەو هۆیانەی ئێوە هەڵتاندان، برێك بوون لە هۆ لاوەکی (عرضي)یەکان، کەچی هۆیە گرنگە سەرکییەکانتان باس نەکردو ناوتان نەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرزەنشتتان ناکەم، چونکە ئێوە وەها تێگەیەنراون، هۆ سەرەکییەکانیان لێشاردوونەتەوە، ئەوەندە هەیە، بەداڕشتنێکی کورت پێتان ئەڵێم، ئافرەتی خۆرئاوا ناچارکرا کە پەنا بەرێتە بەر کارکردن، ناچار کرا.. ناچار، بەحەزی خۆی کارکردنی لە کارگە هەڵنەبژارد، ئەی نازانن "ناچاریی وا لە ئادەمیزاد ئەکات کە سەر بکات بەدەرگای دوژمنیدا"؟ ناچاریی ناوی خۆی وا بە خۆیەوە، ناچاریی گەلێ جار شێر ئەباتە ڕیزی ڕێوی، ئای ناچاریی...

# گرنگترین هۆیەکانی ناچارکردنی ئافرەت

سەربەست: مامۆستا ئەکرێت ئەو هۆیانەمان بۆ باس بکەیت کە ئافرەتی خۆرئاوایان ناچاری کارکردن کرد؟

مامۆستا ساڵح: ناچارکردنی ئافرەت بە کارکردن لە خۆرئاوادا، ڕازو چیرۆکێکی دوورو درێژی هەیەو لقی زۆری لێئەبێتەوەو هۆو ڕەگو ڕیشەی زۆر بوون، ژماردنیان کاتێکی زۆری ئەوێ‌و دیراسەیەکی قووڵی ئەوێ، بەلام ئێمە گرنگ ترینیان ئەخەینە ژێر تیشکی باسەوە. ئەمەش هەندێ لەو هۆ سەرەکییانەن:

## ١- یاسای بەندەگیی‌و دەرەبەگایەتیی (الرق والأقطاع)

مامۆستا ساڵح: باری ژیانی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی لە هەموو سەدەکانی مێژووی خۆرئاوادا پڕ بووە لە دڵڕەقییی‌و چاوبرسێتیی، ئەو کەسەی شارەزای مێژوویان بێت، ناپرسێ چۆن یا بۆچ، چاکەخوازیی‌و بەخشندەیی زۆر کەم تێدە دەرئەکەوێ، سبحان الله، سروشتیان وابووەو ئێستاش واماونەتەوە.

پیسی‌و بۆگەنی یاسای بەندەگیی‌و دەرەبەگایەتیی . وابرازنم . هەندێکی لێئەزانن‌و خوێندووتانە، کامتان باسی ژیانی بەندەگیی نەبیستووە؟ کێتان جەورو ستەمی دەرەبەگایەتیی‌و خوێنمژینی جووتیارانی لەلایەن دەرەبەگەوە نەبیستووە؟ هەروەك ئەزانن زەوی‌و زار خۆی بەتەنها هی بەگەکان نەبوو، بەڵکو ئەو زەوی‌و جوتیارانەش کە لەو زەوییانەدا کاریان ئەکرد ئەبوونە موڵکی بەگزادەکان. سامانیان هی ئەوان بوو، سەربەستییان بە هیچ کلۆجێ نەبوو، شەرەفیان پارێزراو نەبوو، قۆڕەی سکیان ئەهات لە برسا، تەك‌و جمیان لێبڕابوو.

ئادەمیزاد کە ژیانی تاڵ بوو، شەوی بەسەراهات، تاریکی شەو ژیانی داگرت، دیارە زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ڕۆژبوونەوە ئەکات، هەر کە ئاسۆ دەرکەوت، ئەکەوێتە پەل‌و باڵ کوتان بۆ خۆ ڕزگارکردن جا لێرەدا ڕەنگە بپرسن ئەو ئاسۆیە ئەبێ چی‌و کامە بوویێت کە لە ئافرەتی خۆرئاوا دەرکەوتبێ؟ منیش پێتان ئەڵێم: ئەو ئاسۆیە شۆرشی پیشەسازیی (الثورة الصناعية) بوو بابزانین چی ڕوویدا.

## ٢- شۆرشی پیشەسازیی

مامۆستا ساڵح: وەك ئەزانین ژیانگەی کشتوکاڵیی وا ئەخوازێ کە پیاو بەخێوکردنی خێزان بگرێتە ئەستۆو کەسانی خێزانیش دەسباری پیاوەکە بدەن. خۆ کارکردنی ئافرەتیش لەو ژیانگەیەدا وەك ئاڵا شەکاوەیەو ئەبینرێت، بەتایبەتیی لەناو ماڵدا، لەگەڵ ئەوەیشا بە هەندێ پیشەسازیی سادەی دەستیی . کە هی ژیانگەی کشتوکاڵین . هەڵئەساو کەلێنێکی مەسرووفاتی پێئەگرت.

ئەمجا ئاسۆی نوێ – ئاسۆی شۆڕشی پیشەسازی – دەرکەوت. هەموو دۆخێکی لەشارو گوندا هەڵگێڕایەوە، بنج‌و بناوانی خێزانی ڕووخاند، پەیوەندییەکانی پچڕاند.

نەشمین: چۆن.. چۆن؟ شۆڕشی پیشسەسازی ئەبێ بەختیاریی خێزانی پێوەبێت، ئەبێ بیحەسێنێتەوە.

مامۆستا ساڵح: منیش لەگەڵتام، ئەبێ وابێ، بەلأم وانەبوو، ئەوەی کە لە خۆرئاوا روویدا، لەبەرئەوەی کە لە ڕێگەی خواوە دوور بوو کلۆڵیی‌و بەدبەختیی خێزان‌و ئافرەتی بەدەمەوە بوو.

ڕۆشنبیران بەگشتی‌و ئەوانەی باوەڕیان بە بیردۆزەی (التفسير المادي للتأريخ) هەیە، زۆرچاك ئەزانن، ئافرەتی خۆرئاوا لە پێکهاتنی کۆمەڵگەی بۆرجوازی‌و سەرمایەدارەکانەوە، لە دەستپێکردنی ڕووخانی دەرەبەگەوە هاتە مەیدانی کارکردنەوە ئەی خواخوای ئەوەی نەبوو لەشەوەزەنگی ژیانی بەندەگی‌و دەرەبەگایەتیی ڕزگاریی بێت؟ ئەی ئاسۆی نوێ دەرنەکەوتووە؟

بەدەرکەوتنی ئاسۆی شۆڕشی پیشەسازیی، هەزاران، بەڵکو ملیۆنەها لادێیی گوندەکانی خۆیانیا ن جێهێشت‌و ڕایانکرد، خۆیان لە چەپۆکی دەرەبەگ قوتارکرد، بەرەو ئەو شارانەی کە پیشەسازییان تێدابوو

**کەوتنەڕێ. چۆن ئەوە نەکەن؟ سبەی – بە بیری خۆیان – دەست ئەکەن بە ئیشکردن لە کارگەدا خۆیان ئەژێنن و پارەو پوڵیش ئەنێرنەوە بۆ خێزانەکانیان.**

**هەڵکەوت: وەڵڵا خۆ هەلێکی چاك بووەو چاکیان بۆ هاتووە.**

**مامۆستا ساڵح: بەڵام "ڕاڕەوی با بەو جۆرە نەبوو کە کەشتی پێویستی بوو" ، چونکە ئەوەبوو کە کارگەکان ئەو لادێییە هەژارە کلۆڵانەیان لە ڕێگەی دەستی دەڵاڵ (السماسرە)کانەوە ئەقۆزتنەوەو سەرمایەدارەکان "نانیان کەوتە ڕۆنەوە".**

**کەچی ئەنجامی هەڵاتنی لادێییەکان بۆ کارگەکان، لە جیاتی ئەوەی بحەسێنەوە تووشی مەینەتی بوون، لەدەم گورگەوە کەوتنە قورگی شێر، لە سزا چەشتنی دەرەبەگەوە گواستیانەوە بۆ باوەشی سەرمایەداریی بێویژدانی هەرگیز تێر نەبووی هەمیشە تینوو بە خوێنی هەژاران.**

**ئەو لادێیە هەژارانە لە زەلکاوی سەرمایەدارییدا چەقین، بەرامبەر چەندین سەعات کارکردنی شەوو ڕۆژ، ئەوەندەیان دەستە نەئەکەوت کە گوزەرانی پێبکەن، عەرەب واتەنی، لەسەر (فتات)ی سەرمایەداران ئەژیان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کرێکارانەی لە ژیانێکی زۆر ترش و تاڵاوی خراپدا ئەژیان، مەبەستم بارو ژیانی کارکردنەکەیانە. چونکە شوێنی کارکردنەکەیان تاریك، هەوا پیس، زۆر پیس و ناخۆش، دوور لە مەرجی تەندروستیی بوو. ئەو کرێیەش کە لە ئاغای تازە وەریان ئەگرت، بەشی خواردنی ڕۆژانەی نەئەکرد، لەبەرئەوە دەردو نەخۆشیی کوشندە لە ناویاندا بڵاوبۆوە، بە تایبەتیی سیلی سییەکان، کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری لێکوشتن.**

**جگە لە سیل نەخۆشی (تاعوون) چەند جارێك، بەشێوەیەکی جگەربڕانەی فەوتێنەر لە ناویاندا بڵاوبۆوە، ژمارەی لەناوچووان لە ئەوروپادا، لەسەدەی چواردەهەمی زایینیدا، لەبیست و پێنج ملیۆن کەس تێپەڕی کرد، هەروەك جارێکی تر لە سەدەی پانزەی زایینیدا بڵاوبۆوەو ناوی ئەو نەخۆشییە لە شارەکاندا ترس و لەرزی خستبووە هەموو دڵێکەوەو بە ناوی (مەرگی ڕەش) ناو ئەبرا لە ئەوروپادا.[1]**

**لەلایەکی ترەوە، ئەو لادێییە، هەژارانە، لە خێزانەکانیان بڕابوون ئەی بەجێیان نەهێشتوون لە گوندەکانیان؟ خۆ دەستکەوتەکانیشیان ئەوەندە نەبوو کە پارەو پوڵیان بۆ بنێرنەوەو بیانژێنن، دیسان خۆ لەبەر کەمدەستی کاتی خۆی نەیانتوانی خێزانەکانیان بهێنن لەگەڵ خۆیانداو ئیستاش کە کار دەکەن ناتوانن بیانهێنن، ئایا ئەوەندەیان دەست ئەکەوێت کە خۆیان تێری پێبخۆن تا لابکەن بەلای خێزانەکانیانەوە؟ ئایا کەسانی خێزانەکان ئەتوانن لەوشوێنە پیس و پۆخڵ و بۆگەنانەدا بژین؟ ئەی چی بکەن؟**

**سکاڵا: باشە، ئەی ژن و منداڵەکانیان لە گوندەکانا بەچی ئەژیان.**

**مامۆستا ساڵح: ئاخ.. ئاخ دەردمت ورووژاند، کارەساتەکە لەوەوە دەستی پێکرد، ژن و منداڵی بەسەزمان، سکێکی تیرو دەیان برسیی، لە ژێر دەستیی ئاغای دەرەبەگدا، چاوەڕێی گەرانەوەی ئەو بەخێوکەرە ئەکەن کە چووە بۆ شار بۆ پەیداکردنی بژێویی، چاوانیان بڕیوەتە ڕێگا، کەی بگەڕێتەوە بۆ لایان، بەژیانێکی خۆش و باخەڵی پڕەوە، کەچی نە بەخێوکەر ئەگەڕێتەوە، نەپارەو پوڵ ئەگاتە دەستیان، بێئاگان لەوەی کە نەخۆشیی کوشتوویەتی یاخۆ بووە بە خۆراکی ئامێرە تازەکانی کارگە، یاخۆ بووە بە کۆچی قوربانی کانەکانی خەڵووز، خۆ ئەگەر ئەمەو ئەوەیان نەبێت، ئەوا پابەندیی هەژارییەو نەپێی دواوەو نە هی پێشەوەی هەیە، خۆیشی لە برسانا سکی ئەگۆشێ.**

**کەچی بەخێوکەر ناگەڕێتەوە هەتا ئەو ڕۆژەی هەم ئەڕوێتەوە**

---

[1] بۆ زیاتر زانین تەماشای (شبهات حول الأسلام ـ محمد قطب) و (عمل المرأه فى الميزان ، د. محمد علي الباري)و (المرأه فى القرن العشرين، جروان السابق) بکە.

**ئاواز: سەرمایەداریی هەر خراپەیەکی باس بکەیت، وەها سامناك و دڵتەزێنە، سەمایەداریی سەرچاوەی بەدبەختیی جیهانە.**

**مامۆستا ساڵح: ئەمجا گلاراویی ناچاریی ماڵو منالّی ئەوانەی بە پاڵ دایە بەر خۆی و بەرەو شارەکان هێنانی، ئەی تاکەی چاوەروانیی بکەن؟ تاکەی لە گوندەکانا بەبێ بەخێوکەر بمێننەوە؟ ئەی نابێت بگەڕێن بە دوای پارووی ژیاندا؟ ژن و منالّ ڕژانە شارەکانەوە دەلاّلو داروەدەستەکانی سەرمایەداران (پێشوازیی)یان لێکردن و قۆزتنیانەوە، دەستکەوت لەوە چاکتر چی بێت بۆیان؟**

**جوان: ئایا کارگەکانی ئەو سەردەمە ئەوەنە زۆر بوون کە ئەو هەموو خەڵکە بگرنە خۆیان و بەبێ کارکردن نەیانهێڵنەوە؟**

**مامۆستا ساڵح: نەخێر .. نەخێر، زۆربەیان بەبێ کار مانەوە، ئەمجا نەبوونیی و هەژارییەکی زۆر سەخت یەخەی زۆربەی ئەو خێزانانەی . کە لە لادێکانەوە هاتبوون . گرت و گەلێکیان هەر بەبێ بەخێوکەر مانەوە، ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئافرەتی هەژار هەوڵی پارووی ژیان بدات بۆ خۆی و جگەرگۆشە ئازیزە هەتیوەکانی ؟ ئەگەر خۆی هەوڵنەدات ئایا سەرمایەداریی خاوەن کارگە، لای لێ ئەکاتەوە؟ دەستی بەزەییی و یارمەتیدانی بۆ دریژ ئەکات؟ بەزەیی چی؟ لەلایەن کێوە؟**

**بەڵێ، ئافرەت ناچاریی زۆری بۆ هێنا، خۆی هاویشتە مەیدانی کارکردنەوە، بەوەش ئاواتی سەرمایەداران هاتە دی، لەوەوپێش . جاروبار . کرێکاران مرە مری چاککردنی بارودۆخی ئیشکردن و زیادکردنی کرێیان ئەکرد، ئەی ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئەو کرێکارە نێرە توکنانە ژێر بکرێن؟ بۆچ نەگۆڕدرێنەوە بە کرێکاری "بێ تووکی ساف و سۆڵی نەرم و ناسك".**

**سەرمایەداران ئەو هەڵە زێڕینەیان لە دەستی خۆیان دەرنەکرد، بە دڕندانەترین شیوە ئیستغلالی ئەو ژن و منالانەیان کرد، ناچاریان کردن کە بە هەرزانترین کرێ کاریان بۆ بکەن، گەلێ جار ئافرەت بە چواریەکی کرێی پیاو کاری پێ ئەکرا. تا ئەمڕۆش کە پێی ئەگوترێ چەرخی ئازادیی و ڕزگاریی، ئافرەت بە نیوەی کرێی پیاو قایل کراوە، لە کاتێکا کە دەهۆڵی یەکسانیی پیاوو ئافرەت بە درۆوە هەر زرمەی دێت.[1]**

**ڕووناك: بەخوا خەریکە دڵنیا ئەبم لەوەی کە ئافرەت ناچاری کارکردن کراوە، بەڵام ئیمە لەبەر بێئاگایی خۆمان پەیمان بە ڕاستیی نەبردووە.**

**مامۆستا ساڵح: زور سەیرە بە لامەوە کە کابرایەکی وەك (جروان السابق) بەم جۆرەی خوارەوە دەربارەی ئەو ئافرەتان ئەنووسێت: "خاوەنی پیشەسازیی، ئافرەتی شوکردووی لە شونەکردوو لە کارکردنا لە کارگەدا بە چاکتر ئەزانی، چونکە ئەیزانی شوکردوو لە عازەب زیاتر گوێڕایەڵەو لە کارکردنا زیاتریش سەلیقەدارە، بە تایبەتیی لە پیشەسازیی چنیندا، لەو ئیشەدا کە پێی ئەسپێرا تێکۆشەر بوو، چونکە ئەو سامانەی کە دەستی ئەکەوت بۆ بەخێوکردنی خۆی و منالّەکانی گەلێ جاریش بەخێوکردنی مێردەکەی زۆر بەلایەوە گرنگ بوو".**

[1] عمل المرأة في الميزان، د. محمد على البار، ١٩٨١.

## بەڵێ ماڵ کاول و ریسوای کرد

**سکالاّ:** به دڵنیاییەوه ئەڵێم، شۆرشی پیشەسازیی ئافرەتی خۆرئاوای ماڵ کاول و ڕیسوا کرد.

**مامۆستا ساڵح:** بەڵێ ئافرەتی خۆراوای ماڵ کاول و ڕیسواو بەدبەختەو سەرلێشیواو کرد، ئەو گوندنشینانەی کە گیانی هاوکاریی، لە یەکتر ئاگابوون، چەندان سیفاتی تری مەردانەیان تێدا بوو، بەرەو شارەکان ڕاکێشا، شوێنەکانی خۆیانیان بەجێهێشت، ڕوویان کردە کارگەکان بۆ کارکردن بە نیازی ژیانێکی چاکەوه.

لە شارا دییان خەڵك – وەك گوند – یەکتر ناناسێ، کەس دەستی یارمەتیی بۆ کەسی تر درێژ ناکات، کەس کەسی تر بەخێو ناکات، هەرکەسێ بۆ خۆی کار ئەکات، هەرکەس ئەبینی زەوقی دڵی خۆی ئەدوێنێ. تەنانەت دییان لە ڕێگەی حەرامەوە سێکسیش دەستئەکەوێ و دەستکەوتنیشی ئاسانە. بەوەش مەیل و ئارەزوو حەزی هاوسەریی کز بوو، خۆئالاّندن بە خێزان و خێزاندارییەوه لاواز بوو، هەر هیچ نەبێ ئارەزووی دواخستنی ژنهێنان و شوکردن بواری بۆپەیدا بوو.

ئەو ئەنجامە تاڵ و ترش و دڵتەزێنە، کە لەو تاوتوە پەیدابووە، نرخەکەی ئافرەتی بەسەرزمان دای، نرخەکەش ئابڕوو، کەرامەتی ئافرەت بوو، تیکۆشانێکی بێووچان سواری شانی بوو، لە پێویستییە سایکۆلۆژیی و مادییەکان. جگە لە ئابڕووی. نرخەکەیدا.

**جوان:** چۆن؟ تێناگەم، بۆچ ئەبێ ئافرەت نرخەکەی بدات؟

**مامۆستا ساڵح:** لەسەرێکەوە پیاو خۆی لە مەسرەفکێشانی ئافرەت کێشایە دواوەو پێویستی کرد لەسەری کە کار بکات و خۆی خۆی بژێنێ، گەرچی دایك یان خاوەن مێردیش بێت، ئەی ژیانی نوێی شاری پیشەسازیی وا پێویست ناکات؟ لەسەرێکی ترەوە کارگەکان بە ناشیرینترین شێوە ئیستغلالی ئافرەتیان ئەکرد، چەندان سەعات ئیشیان پێ ئەکرد، کەچی کرێکەی لە هی پیاو کەمتربوو، لەکاتێکا لە یەك کارگەدا ئیشیان ئەکرد!

**سەربەست:** باشە، ئەی ویژدان، مرۆڤایەتی، بەزەیی...

**مامۆستا ساڵح:** سروشتی خۆرئاوا وەها بووەو هەروەهاش دەبێ، دڵڕەقی، چاوچنۆکی، دووری لە سۆز و بەزەیی. تەماشای مرۆڤ لەو ڕوانگەوە ناکەن کە ئادەمیزاد بە کەرامەتەکەیەوە ئادەمیزادە، هەتا شەڕی بۆ دەست بدات لاناکات بەلای خێرەوە، بە درێژایی مێژوو، خۆرئاوا هەر وەها بووەو هەتا ئەو ڕۆژەش کە خوا بیگۆرێت هەر وەها ئەبێت.

ئەبێ چی چاوچنۆکان لە ستەمکردن لە ژن و منداڵی بەسەزمانی لاوازی برسی بگێڕێتەوە؟ چی نەهێڵێ ئیستغلالیان بکەن.. چی؟! ویژدان کە ترسی خوای تێدا نەبێت، قابلۆغێکی خاڵییە، چرایەکی بێ نەوتە، بە تەمای دابگیرسێت و ڕۆشناییت بداتێ؟! مرۆڤایەتی بەلای ئەوانەوە نەبووەو نابێت، بەزەیی، کەی لە ستەمکاران وەشاوەتەوە یان ئەوەشێتەوە؟[1]

ترسی خوا هەر کە لە دڵ چووە دەر      ویژدان تاجی جەور زوو ئەکاتە سەر
کانی سۆزی دڵ ئیتر وشك ئەبێت      دڵ خۆی کە گۆشتە وەك بەردی لێ دێ

---

[1] بە دەستکارییەوە لە (شبهات حول الاسلام وعمل المرأه فى الميزان) وەرگیراوە.

# تەمەنی کارکردن بەرز کرایەوە

هەڵکەوت: مامۆستا! وا بزانم ئێستا منالان لە کارکردندا وەك ئەو سەردەمە بەکار ناهێنرێن، هەتا نەگەنە تەمەنی یاسایی، هیچ کارگەیەك بۆی نییە وەریان بگرێت و کاریان پێ بکات.

مامۆستا سالح: کارەساتەکە ئێجگار گەورەبوو. هەستی مرۆڤانەی هەندێ لە نووسەرو ئەدیب و چاکەخواز و بیرمەند (مفکر)ی بزواند، ڕای چڵەکاندن، چونکە جەورو ستەمی سەرمایەداران لە وزە چووبووە دەرەوە.

ئیتر ئەوانەی ناومان بردن، دەنگیان هەڵبڕی، هاواریان لێ هەڵسا، لە ئەنجامی ئەوەدا، بزووتنەوەیەکی مرۆڤانە (حرکة انسانیة) بەرپا بوو، بە هەموو توانایەکی خۆی و بە لایەنگیری جەماوەر، هەوڵی وەستاندنی ئیستغلالکردنی ئەو ئافرەت و منالانەیدا، یەکێك لەو نووسەرە دیارانەی "تشالز دیکنز" بوو، کە لە یەکێك لە چیرۆکەکانیدا بە ناوی "دافید کوپرفیلد" پەردەی بێشەرمی لەسەر ڕووی یاسای سەرمایەداریی هەڵمالی. ئەتوانن ئەم چیرۆکە بخوێنینەوەو لەو ئیستغلالکردنی منالانە بەرامبەر کرێیەکی زۆرکەم و کارێکی دوورو درێژو قورس بگەن.

ئەو بزوتنەوەیە، لەلایەن چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگاوە لایەنگیریی کرا، توانی یاسا بسەپێنێ بەسەر سەرمایەداراندا کە کار بەو منالانە نەکەن. بەڵام یاسایەك کەناخی ئادەمیزاد نەگرێتەوە خۆی بێ کەڵکە، چونکە تا ئەمرۆیش منالان هەرکاری قورسیان بەرامبەر کرێیەکی کەم ئەدرێت بەسەردا. چ لە ئەمریکای لاتینی چ لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم (العالم الثالث)دا. ئەوەتا "میلتون فریدمان" گەشتێك ئەکات بەناو کانەکاندا لە ئەمریکای لاتینی داو ئەبینێ منالان بە کەمترین کرێ، لە ناخۆشترین بارودۆخا کارئەکەن. لەگەڵ ئەوەشا بڕیاری "چاکیی" ئەدات بۆیان ئەڵێ، ئەگەر وا کار نەکەن لەبرسا ئەمرن. ئابەو جۆرە خۆرئاوا ئیستغلالی گەلان ـ تەنانەت منالان ـ بەبێ بەزەیی ئەکات[1] خۆ ئەگەر ئەو بزووتنەوەیە سەبارەت بەمنالان کاریگەریی بووبێت، بۆ ئافرەت هەر وا لە دەسخەڕۆکردن بەولاوە هیچی تر نەبووە. ئەتوانین بڵێین، ئافرەت بەتەنیا، بێ یارمەتیدەر لە گۆرەپانی ئیستغلالدا مایەوە، ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە سەرمایەداران بەس خوێنی بمژن؟ یاسای خێزانیان لێ کاولکرد، جاران لەسایەی خێزاندا خۆی پەنا ئەدا، زۆر نەبێت کەم مێردەکەی پێداویستی ژیانی بۆ دابین ئەکرد، هەرچەندە خێزانەکەی بەتێکڕا لەژێر جەوری دەرەبەگا ئەینالاند، بەڵام ئافرەت بەرپرسیاری پەیداکردنی بژێوی نەبوو. خۆ ئێستا ئەوەشی لەدەست دەرچوو، ئەی ئەبێ چی بکات؟ ئەگەر خۆی نەدات بەدەست سەرمایەدارانەوە چاری چی بێت؟ ئایا خۆی بدات بەدەست مەرگەوە؟

ڕووناك: دیارە نەء، گیان شیرینە، ژیان شیرینە.

مامۆستا سالح: بەهۆی کاولبوونی خێزانەوەو مانەوەی پیاوەوە بێ ژن و منال، بەهۆی هاتنی ئافرەتەوە بۆ گۆرەپانی کارکردن تا پارووی ژیان بەدەستبهێنێ، بەهۆی مانەوەی ئافرەت بێ مێردو منال، دیسان بەهۆی نەتوانینی کە خێزان پێکەوە بنێت لەکاتێکا هەژاریی و نەبوونی چنگیان پێکاوەتە قوڕگی و لەولاشەوە ژیانی کۆمەڵایەتی پچڕ پچڕبووە، لە ژێرباری ئەو هەموو هۆیانەدا، لەسەرەتاوە ئارەزووی سێکسیی لای ئافرەت و پیاو بە ناچاریی تووشی پوچانەوە (الکبت) بووە، ئەوەشمان لەبیر نەچێت، تائەو کاتەش تینی ئایین لەدڵی زۆربەی خەڵکا هێشتا هەر مابوو.

ئاواز: یاسای سەرمایەداریی کانگای جەورو ستەمە نەك هەر بۆ ئافرەت بەتەنها بەڵکو بۆ مرۆڤایەتی. ئیتر چۆن بەزەیی بەئافرەتدا دێتەوە؟

---

[1] ـ عمل المراه فی المیزان/ د.محمد علی البار.

مامۆستا ساڵح: لاکردنو ئاوڕنەدانەوە لە ئافرەت، لە هەموو کەسو کۆمەڵو ڕێکخراوەیەك نایەت، یارمەتیدانی ئافرەت پێویستی بە جووڵانی هەستە بەرزەکان هەیە، پێویستی بە باوەڕی بێگەرد هەیە، خۆرئاواش زۆر کەم ئەمانە ئەگرێتە خۆی. ئایا مرۆڤی ژێر ئەگەڕێ بەدوای نوقڵدا لەناو پیسایدا؟

گوێ بگرن لە "ئۆغست بیبل" کە ئەڵێت: "...سەرمایەداریی بۆ ئەوە ئافرەتی لەناو ماڵدا نەهێنایە دەرەوەو نەینارد بۆ کارگەو بەرهەم هێنان بە کۆمەڵ کە ئازادی بکات، بەڵکو بۆ ئەوە ئەوەی پێکرد کە ئیستغلالی بکات لە ناشیرینترین  شێوەدا، تەنانەت زیاتر لەئیستغلال کردنی پیاو...". لەسەری ئەڕواتو ئەڵێت: "ئەو ئافرەتەی سەرمایە ئیستغلالی ئەکات دەردەسەریی کرێکارو کۆتو زنجیری سەردەمی کۆن ئەچەژێ..."[1]

ئاواز: بەڵێ.. بەڵێ، ئەوە زۆر ڕاستە!

هەڵکەوت: ئەوە پڕوپاگەندەی سۆشیالیزمە، دژی دیموکراتییەت. ئەی خۆ خۆیان هەموو داخوازیەکانی ئادەمیزادیان لە خۆراكو جێگەو سێکسدا کۆکردۆتەوە، لەکاتێکا ئەم سێ داخوازییە زۆربەی زۆری ئاژەڵەکان بەبێ داخوازیی لە بەردەمیاندا هەن.

## ٣ـ دوو جەنگی گەورەی جیهانیی

نەشمین: بەڕاستی شۆڕشی پیشەسازیی بەدبەختییەك بوو بۆ ئافرەت لە خۆرئاوادا، ئێمە بەم جۆرەمان لێکنەداوەتەوە.

مامۆستا ساڵح: لە بەدبەختیی دەمی شۆڕشی پیشەسازیی، بەدبەختی گەورەتر هاتە کایەوە، بەدبەختی دوو جەنگی گەورەی جیهانیی، ئای چی بە ئافرەتی خۆرئاواکرد؟ هەندێ سەرچاوە ئەڵێن، (١٠) ملێون کوژراو بەر خۆرئاوا کەوت دە ملێون کەس کەم نییە! هەروەها لە جەنگی دووەمی جیهانیی (٣٦) ملێون کەس کوژرا! حەڤدە ملێون بەر ڕوسیا کەوت، ئەڵمانیا شەش ملێون، یابان دوو ملێون، پۆڵۆنیا پێنج ملێونو هەشت سەد هەزار، یۆگسلافیا دوو ملێونو شەش سەد هەزار، دەوڵەتەکانی تر لەدەیانو هەزارو چەند سەد هەزاریان بەرکەوت[2]

پرشنگ: بەڵام جەنگ چ پەیوەندیەکی بە کارکردنی ئافرەتەوە هەیە؟

مامۆستا ساڵح: کچم! تۆ بێئاگایت.. بێئاگا.چۆن جەنگ پەیوەندی بە کارکردنی ئافرەتەوە نییە؟! بەهۆی ئەو هەموو کوژراوانەوە باری سەر شانی ئافرەت چوار ئەوەندەی تر قورستر بووە، بەدبەختی بە تەواویی یەخەی ئافرەتی گرت، ملیۆنەها ئافرەتیان لەشیان شێوا، یاخۆ دەمارەکان (اعصاب)ی بەهۆی ترسو غەمو پەژارەوە یان بەهۆی غازاتی ژەهراویی و خنکێنەرەوە تێکچوو، هەروەها زۆربەی جەنگاوەران . ئەوانەیان کە مابوون . لە دوای تەواوبوونی جەنگ، ئەوەندە ماندووبوو بوون، خۆیانیان لە ماڵو خێزانو منداڵ دوورئەخستەوە، گوایا ئەیانەوێ پشوویەك بدەن، بحەسێنەوە، بێژنەکانیشیان ژنیان نەئەهێنا، نەیانئەویست خۆیان بخەنە گێژاوی خێزان و خێزانداریییەوە، . وەك خۆیان ئەیانگوتو ئێستاش هەندێ ئەیڵێن . تا بەشکو مێشکیان بحەسێتەوە.

خۆ ئاشکرایە، هەمیشە جەنگ وێرانکاری بەدەمەوەیە. ئەوانیش . خۆرئاواییەکان . گەلێ شوێنیان وێران بوو، ئەی نابێ ئەو شوێنانە ئاوەدان بکرێنەوە، کرێکاریش – لە نێر – ئەو هەموو بۆشاییەی پێ پڕ نەئەکرایەوە، ئەمجا لەسەر ئافرەت پێویستە کە خۆی بژێنێ، منداڵەکانی بژێنێ، دەست بداتەکارکردن. خۆ جاران ئافرەت بە دوای کاردا ئەگەڕا، کەچی ئێستا کار بە دوای ئافرەتا ئەگەڕێ، ئایا هەلی زێرینی بۆ نەڕەخساوە، خۆ ئەگەر کارنەکات نەك هەر خۆی بە تەنیا، بەڵکو ئەو پیرەژنو منداڵانەی کە جگەرگۆشەنو لەگەڵیا ئەژین، ئەبێ گورگە هارەی برسێتی قووتیان بدات، ئایا ئەمە هەمووی بە کوتەك ئافرەت ناداتە بەر کارکردن؟

[1] المراة فی التراث الاشتراکی /ترجمة/ جۆرج طرابیشی.٣

[2] ٤ـ لەوانەیە: ( شبهات حول الاسلام والمراة فی القرن العشرین) .

ڕووناك: همم، تیْ گەیشتم، ناچاریی زۆری بۆ ئافرەت هێنا، ئەبیْ كاربكات، ئەگەر نەیكات حەتمەن لەبرسا ئەمرێت.

ماموٚستا سالْح: بەلْیْ، وابوو، لە ڕاستییدا، ڕەوشتو داوێنپاكی، پاراستنی ئابڕوو، بێگەردیی، لەناو كۆمەڵگەی ماددەپەرستو خوانەناسو بیْ ئاییندا، ئەبنە كۆسپ بۆ ئافرەت، ئەبیْ ئەوانەی ببێت یان ئیشوكاری بدرێتیْ، ئافرەتی خۆرئاواش برسێتیو خۆشەویستی ژیان، زۆریان بۆ هێنا، تەنگیان پێهەڵچنی، ناچاریان كرد كە دەس بكا بە ئیشكردنو دەست لەو هەموو بەها بەرزانە هەڵبگرێت.

لەولایشەوە، خاوەن كارگە سەرمایەدارەكانو كاربەدەستەكانیان، تەنها ئیشیان لە ئافرەت نەئەویست، ئەوانە ئەیانزانی كە گەورەترین هەلیان بۆ سازاوە، ئەیانزانی كە كۆترەكان لە برسا خۆیان ئەكەونە خوارەوەو لای ئەوانیش دانەوێڵە دەست ئەكەویْ، ئینجا مادام وابێت، بۆچ ڕاو نەكەن؟ چی لەو ڕاوە بیانگێرێتەوە؟ ویژدان؟ كام ویژدان؟ بۆچ جگە لە ماددەپەرستی هیچی تری تێدایە؟ ویژدانێك كە لە ترسی خوا چۆڵ بێت، چۆن ڕۆشنایی تێئەچێت.

ئەوەتا ناچاریی ئافرەتی بەسەرزمانی هێناوەتە بەردەستی ئەو گورگانە، ناچاریی وای لێكردووە بۆ ئەوەی بژی، بۆ ئەوەی پیرو منالْ بژێنی . كە ئەوە لە پیاوانی خۆرئاوا ئەهات . ئەبیْ خۆی بدات بە دەستەوە، چونكە ئەگەر ئەوە نەكات، ئیشی نادرێتیْ، ناژی.. نا !!

سكالاْ: ئای كە باسەكە دلْگرانم ئەكات، بەڕاستی بۆ ئەو ئافرەتە ستەملێكراوانە ئاگر بەرئەبێتە هەناوم، ئەوانە بۆ ئافرەت مێشوولەی ئەنۆفیلس بوون، دڕندە بوون نەك ئادەمیزاد.

ماموٚستا سالْح: بەلْی، كچی شیرینم، ئەوەی بیستتان واقیعێك بوو كە یەخەی ئافرەتی خۆرئاوای بەزۆر گرت، برسێتی هەموو شتێكی بەدەمەوەیە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) پەنا بەخوا ئەبات لێیو ئەفەرمویْ: "اللهم إني أعوذ بك من الجوع فإنه بئس الفجيع.." (أبوداود والنسائي وإبن ماجة).

## لە دوو سەرەوە برسیی بووە

دڵپاك: بابە گیان! ئەگەر مۆڵەتم بدەیتیْ، لە سەر ئەو باسە تەواوكەرێك باس ئەكەم، بەو هیوایەی خوشكانو برایان سودی لێوەربگرن .

ماموٚستا سالْح: ئێمە بۆ لێكۆڵینەوەو باسكردنو گفتوگۆكردنی هەر باسێك كە كەڵكی هەبێت، كۆبوینەتەوە. فەرموو .. فەرموو.

دڵپاك: هەروەك برسێتی زۆر بۆ ئادەمیزاد ئەهێنیْو ناچاری گەلیْ كاری نا پەسەندیشی ئەكات، لە هەموو گیاندارانذا . لەوانەش مرۆڤ . ئارەزوویەكی تری سەرەكییو سروشتی هەیە، پێویستی بە ئاوڕلێدانەوەو بەدەمەوە چوون هەیەو تێربوونی ئەویْ. ئەوەش ئاشكرایە كە ئارەزوی سێكسیە .

ماموٚستا سالْح: بەلْیْ، ئەوە زۆر ڕاستە. بەلاْم لەڕێگەی ڕەواوە.

دڵپاك: بێگومان منیش مەبەستم ڕێگەی ڕەوایە كە پاكترین ڕێگەیە ڕەنگە ئێستا هەتانبێت لەدڵی خۆیدا بڵێت: ئەم كچە چۆن لەڕووی دێت، ئەم باسە لەناو كۆمەڵێكدا، بەتایبەتی باوكیشی لەو كۆمەڵەدا بێت بكات؟! لەوەلاْمدا ئەڵێم: من كیژێكی موسڵمانم، نەمامی باغی خێزانێكی موسڵمانم، باسی شتێكی حەلاڵو یاسایەكی خوایی ئەكەم. هەروەها هەستكردنم بەسەربەستیی خۆم لە سنووری یاساكانی ئیسلامدا وام لیْ ئەكات لە ئاییناسییدا باوكم بە ماموٚستایەكی زۆر دڵسۆزو سنگفراوان بزانم كە داوای شەرملێكردنم لەكاتی دەرخستنی حەقدا لیْ نەكات، بێگومان لەمەشدا چاكە (فضل) ئەگەڕێتەوە بۆ باوكم، چونكە ئەو منی بەم جۆرە پەروەردە كردووە .

ماموستا ساڵح: منیش سوپاسی خوا ئەکەم کەلەوەدا سەریخستم.

دڵپاك: ئاشکرایە کە ئارەزووی سێکس، ئارەزوویەکی سروشتیو پێویستییەکی بنەڕەتیی ئادەمیزادانەیە، پێویستیی بە تێرکردن هەیە جا ئەگەر هەموو پیاوە خۆرئاواییەکان. ئەوانەی کە لەدوای جەنگ مابوون. ژنیان بهێنایەو هیچ کەسیان بەبێ ژن نەمابایەوە، هێشتا چەندەها هەزار، بگرە چەند ملیۆنێك ئافرەت بێ مێرد ئەمانەوە. چونکە سووتەمەنیی ئاگری جەنگەکان، بەشی هەرە زۆری لە پیاوان بوو نەك لە ئافرەتان. بەڵگەش لە سەر ئەم ڕاستییە، زۆری ژمارەی ئافرەتان بوو لە ژمارەی پیاوان لەو سەرژمێرییانەدا کە پاش کۆتاییهاتنی جەنگ کرا. ئایینو بیروباوەڕی خۆرئاواش، ڕێگەی چەند ژنێتی یانی (تعدد الزوجات)ی نەئەدا، بەپێچەوانەی ئایینی ئیسلامەوە کە ڕێگەی ئەوە ئەدات، بەتایبەتی لەکاتی وەهادا تا هەر پیاوێك بەپێی توانای خۆی زیاتر لە ژنێکی هەبێتو گیروگرفتەکە کەمێك چارەسەر بکرێت یان سوك ببێت. جا لەم ڕووەوە ئافرەتی خۆرئاوا دەروازەی لێ داخرا، ڕێگەی تری هیچ بۆ نەمایەوە تەنها ئەوە نەبێت چ بەحەز چ بێ حەز – واتە بەناچاری –، خۆی هەوڵی تێرکردنی ئارەزووی سروشتیی خۆی لەسێکس بدات، هەروەك هەوڵی تێرکردنی سکی ئەدات! بەو جۆرە ئافرەتی بەسەزمانی خۆرئاوا، هەروەك لەچارەی نووسرابێتو حەتمیی بێت لەسەری لەو ڕێگەیەوە ملی نا، خۆی خستە بەردەستی هەر کەسێك کە حەزی لێی ئەکرد لەهەمان کاتا لە کارگەدا، لە دوکاندا کاری ئەکرد. لە هەر لایەکیش بۆی ڕێککەوتایە لە سێکسیش خۆی تێرئەکرد. کاتێ کە خاوەن ئیشەکان (اصحاب العمل) بەوەیان زانی لەجیاتی ئەوەی سۆزیان بجۆشێت بۆ ئافرەت سنگی خۆیا بەڕۆن هەنووی، کەوتنە بەهانەگرتنو فێڵو تەڵەکەیەکی وەها لێی کە نەژێریی پەسەندی ئەکردو نەویژدانی زیندوو ڕێیپێئەدا.

ماموستا ساڵح: ئەوەی دڵپاك باسی کرد سەرەتای سەربەستییو سەربەخۆیی ئابورییو دروستبوونی کەسایەتیی ئافرەتی خۆرئاوابوو، سامانو دارایی ئافرەتی خۆرئاوا، بەو جۆرە دەستیپێکرد کە هەندێکیتان بیست، کەچی گەنجە خوێنەوارەکانی لای ئێمەش بەکوێرانە خۆرئاوایان کردووە بە ڕووگەی خۆیان بە هەموو شتێکی سەرسام (معجب)ن و خۆرئاواییەکان بەفریشتەی ژیان ئەزانن!!

سکاڵا: بمانەوێو نەمانەوێ، ئافرەتی خۆرئاوا لە دوو سەرەوە برسیی بووە هەردوو برسێتییەکە ناچاریان کردووە کە"کار" بکات.

## ٤ـ فێڵو تەڵەکەی جوولەکە

نەشمین: بەکورتی هۆی چوونەدەرەوەی ئافرەت لەماڵدا بەرەو مەیدانی کارکردن ئەو سێ هۆ سەرەکییە بوون کە ماموستا باسیکردن. بەڵام من دانی پیا ئەنێم، لەمەوبەر قەت ئەمەم نەزانیووە.

ماموستا ساڵح: تەنها ئەوسێ هۆیە نەبوون، گوتمان هۆی تر هەبوو، ئێمە تەنیا باسی هەرە گرنگەکانیان ئەکەین. ئەو سێ هۆیە کە باسمانکردن وەك نەوتو بەنزین، ئاگریان پێوەنەنرێت، بێگومان ئاگر ناکەوێتەوە.

هەڵکەوت: باشە، چی بوو بەئاگرو گڕی بە نەوتو بەنزینەکە هەڵساند؟

ماموستا ساڵح: فێڵو تەڵەکەی جوولەکە. ئێوە ڕەنگە لە فێڵو تەڵەکەی جوولەکە نەشارەزابن. لەهەر لایەکدا ئاگرێك بکەوێتەوە دەستی ئەوانی تێدایە، خۆ ئەگەر فریای ئاگرکردنەوە نەکەوتبن، کە داگیرسا فووی لێ ئەکەنو کڵپەی لێ هەڵئەسێنن.

پرشنگ: بەڵام ئەبێ ئەوان لەو بەسەرهاتانەدا چ دەورێکیان دی بێت؟

ماموستا ساڵح: جوولەکە لە هەر لایەکدا ببێتو بووبێت، لە هەموو دەمێکا هەوڵی کۆکردنەوەی سامانیان داوەو دەوڵەمەندییان بەدەستهێناوە، ئەمجا بۆ بەجێهێنانی مەبەستەکانیان بەکارهێناوەو ئاواتو مەبەستیانی تا ڕادەیەکی زۆر پێ هاتۆتەدی.

هاتنە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵدا بەرەو مەیدانی کارکردن، یەکێك بووە لە ئاواتە زلەکانی جوولەکە سەرمایەدارەکان، کاولکردنی خێزانیش‌و ماڵوێرانکردنی ئافرەت، هەر دەستی ئەوانی تێدا بووە. ئەتوانن ئەم پەڕاوە– بروتوکولات حکماء صهیون– دانانی "عجاج نویهض" بخوێننەوە، کەڵکی زۆری لێ ئەبینن‌و جوولەکە ئەناسن‌و لە ستراتیجیەتیان تا ڕادەیەکی زۆر شارەزا ئەبن.

لە سەرەتاوە سەرمایەدارەکان – لە جوولەکە بەتایبەتی – کرێکارە نێرەکانیان زۆر ئیستغلال ئەکرد، کرێکاران دوای چەند ساڵێك وریاو بێداربوونەوەو هەستیان بەو ستەمە کرد. ئەمجا ورتە ورت‌و جموجۆڵیان تێکەوت، دەستیان کرد بە داواکردنی مافی خۆیان. جوولەکە سەرمایەدارەکان کە هەستیان بەو مەترسییە کرد بیریان لە بەکارهێنانی ئافرەت‌و مناڵان لە کارکردنا کردەوە. بۆ خۆشبەختیی ئەوان، کاتەکەش زۆر گونجاو بوو، ئافرەت‌و مناڵان، هەژاریی‌و نەبوونی زۆری بۆ هێنابوون ناچار بەرەو خومخانەو لیتەی سەرمایەداران پاڵی پێوەنان. جوولەکە بۆ کاری نامەردانە هەمیشە بیرو وردو دووربینە، جا بۆ ئەوەی خەڵك بیر لە حەیاو ڕەوشتی بەرزو باوی کۆمەڵایەتیی نەکاتەوەو کاری سەرمایەداریی. بەسەر سەرمایەداریشەوە جوولەکە. بەچاکی‌و سەرکەوتویی بڕوات، فەیلەسوف‌و زاناکانی یەهودی حەیاو ڕەوشتی بەرزو باوی کۆمەڵایەتیی‌و هەموو بەهایەکی بەرزو هەموو باوەڕێکی پیرۆزیان بەشێوەیەکی جادوگەرانە داپاچی.

جوان: چۆن؟ بە تەور یان بە تەشوێ‌و تەورداس؟

مامۆستا ساڵح: ئەو تیغانە پێویستیان بە شێوازی جادوگەرانە نییە. ئەی خۆزگە بەوانە دایان پاچیبانایە، خەڵك پێی ئەزانین‌و قەدەغەی ئەکردن. ئەوانە کەوتنە درۆو دەلەسەو پروپاگەندە کردن دەربارەی باس‌و رازی تێکەڵاویی ئافرەت‌و پیاو، هەتا گەیاندیانە ئەوێ کە پەیوەندیی سێکسیی لەدەرەوەی سنوریی هاوسەریی، کارێکی سروشتی‌و پاك‌و بێگەردە، بەڵکو کارێکی زۆر چاك‌و بەکەڵکە، چەنکە پووچاندنەوەو گرێی دەرونیی ڕائەماڵێت. تەماشای بڕیاری ژمارە دوانزەی (بروتوکولات حکماء صهیون) بکەن. تیایا نوسراوە:

"بێگومان لەهەموو دەوڵەتە گەورەکاندا کەخاوەن سەرکردایەتین، وێژە (أدب)ێکی نەخۆشی پیسمان بڵاوکردۆتەوە....". لەشوێنێکی تری بڕیارەکاندا هاتووە: "وا مەزانن کە بڕیارەکانمان وشەی پووچەڵ بن، تەماشاکەن، سەرکەوتنی داروین‌و مارکس‌و نیتشە ئێمە لەمەوبەر ڕێکمان خستن و شوێنەواری ڕەووشتی لە ڕێ روونان (اتجاە)ی ئەم زانیاریانە لە بیری نا جوولەکە (جویم)دا بە دڵنیاییەوە ڕۆشنە بۆ ئێمە".

ڕووناك: باشە چۆن ئەیان وێرا ئەو کارە پیسانە بکەن؟

مامۆستا ساڵح: خۆ ئەوان هەر وا بە سادەیی‌و زاقی دەستیان بەو کارە پیسانە نەئەکرد. بەڵکو هاتن – بۆ گەیشتن بەو مەبەستانە – شۆڕشێکی ڕۆشنبیری (!!) گەورەیان بەرپاکرد، هەزاران نووسەرو وێژەوان‌و هونەرمەند بەشدارییان تێدا کرد. ئەمانەیش لێژبوونەوەی (انحدار) یان بەرەو کارگەندیی (الرذیلة) بەکارچاکیی دایە قەڵەم، هەزاران چیرۆك دانرا، هەزاران شانۆگەریی و تەمسیل سازکرا کە هەموویان ئافرەت و پیاویان لەسەر داوێنپیسیی هان ئەدا، ئەو داوێنپیسیی‌و کاری گەندییەیان بەکارێکی پاڵەوانانەی زۆر چاك ناودەبرد. بەتایبەتی کاری ئەو ئافرەتانەی کە (فرج) ناوگەڵی خۆیان لە ڕۆژانی جەنگا تەبەڕوع کرد!! بەجۆرێکی وا ئاهەنگی ڕێزلێنانیان بۆ گێڕاو چەندان تەمسیلیان بۆکرا سەرەك کۆماری دەوڵەتیش ئامادەی ئەو ئاهەنگانە ئەبوو!!

نەشمین: من کاری جوولەکەکانم بەلاوە لە هەموو هۆیەکانیتر کەباس کران. مەترسیدارو سامناکترە.

مامۆستا ساڵح: کارەساتەکە زۆر سامناك بووە، بەسەرهاتی ئافرەتی خۆرئاوا زۆر دڵتەزێنە‌و دڵتەزێنانە بووە. گوێ بگرن لە مامۆستا (أبو الاعلی المودودي) لەپەراوی (الحجاب)دا ئەڵێت:"....جەنگی جیهانی یەکەم هاتە پێشەوە داوێنپیسی بەئارەزوو (البغاء المتطوع) داهێنرا ئەمە جگە لە داوێنپیسی بازرگانکاریی (البغاء التجاري). ئەم جۆرە شەرواڵپیسییە داهێنراوە ئەوەندەی بەڕێزەوە تەماشائەکرا، ڕێزی ئەو ئافرەتانەی کە

خۆشەویستی وڵاتیان نیشاندا بەخزمەت کردنی ئەو پاڵەوانانەی بەرگرییان لە خاکی فەڕەنسە ئەکردو ئافرەتەکان لە ڕێگەی ئەو خزمەتکردنەوە منالَیان بوو (منالَی باوك نەناسراو) ڕێزیان لێگیراو بە پایەبڵند تەماشا ئەکران. ناونران دایکانی ڕۆژانی جەنگ!! ئنجا هاندانو بەخێوکردنیان بوو بەکارێکی چاکی ڕەوشتدۆستی لەلای بەڕەڵلاو کارگەنداں، ڕۆژنامە گەورەکان بایەخێکی فراوانی ڕۆژانەیان بەو ئافرەتانە ئەداو سەرنجی خاوەن کارەکان (رجال الاعمال) یان ڕائەکێشا بۆلایان. دوو ڕۆژنامەی گەڕۆکی وێنەگر (فنتاسیو) و (لافی باریزیان) لە هەموو ڕۆژنامەکانی تر زیاتر خزمەتیان لەم بوارەدا نیشان ئەدا. تەنانەت ئەمەی دواییان لە ژمارەیەکیدا (١٩٩) سەدو نەوەدو نۆ ریکلامی لەبارەی ئەو ئافرەتانەوە تێدا بوو).

پرشنگ: بەلاَم ئێمە ئەم جۆرە باسە مێژووییانەمان نەخوێندووە! ئیسلام ستەمی لە ئافرەت کردبێتو ڕێگەی پێشکەوتنی لێ گرتبێت ؟! ئەی لە کوێوە فێری ئەم باسو ڕەخنانە بوون؟ کێ فێری کردن؟ چۆن وا خێرا هەڵتانگرتو لای خۆتان هێشتتانەوە؟ زۆر سەیرە بەلامەوە کە قسەی داوێنپیسێك، چووبێتە خۆرئاواو باسی داوێنپیسی هێنابێتەوە، کارتان تێبکاتو بتان جولێنێت، کەچی نووسینی زاناو فەیلەسوفە بە ویژدانەکانی خۆرئاوا بەلاتانەوە هیچ بایەخێکی نەبێت؟! تەنانەت هەوڵی خوێندنەوەی نەدەن!! گوێ بگرن لە ڕۆژهەلاتناسیَ (دکتۆر غوستاف لۆبۆن) کە ئامۆژگاری قوتابیە بە خۆرئاوابووەکانی ئەکاتو ئەڵێت: (هۆی تێکشکانی خۆرهەلات، وازهێنانیەتی لە گیانی ئایینیو خۆهەڵواسینیەتی بە عەقائیدی پووچەڵەوە، ئایین هێزێکی ئەدەبیەو گاڵتەی پێناکرێت. پێویستە لەسەرتان ئەوەی لەگەڵ گیانی چەرخدا ئەگونجێ لە ئایینەکەتان بەری نەدەنو پارێزگاری دابە (تقالید) چاکەکانتان بکەنو باوە بە کەڵکەکانتان بپارێزن. لەسەر قوتابیە خۆرهەلاَتیەکان پێویستە کە . بێن بۆ خۆرئاوا بۆ وەرگرتنی زانیاری . لەو زانیارییو هونەرو بیرو باوانە هەڵبژێرن کە کەڵکی بۆ نیشتمانەکەیان هەبێتو لەگەڵ خووڕەوشتیانا بگونجێت)[1]

[1] روائع اسلامیە: ابراهیم النعمە ١٩٨٣، لاپەڕەی ٥٤، ٥٥.

## مافی بخورێتو قرەش نەکات؟

پرشنگ: مامۆستا، دوێنێ شەو کاتەکەی درەنگ بوو تا پێت بڵێم: ئافرەتی خۆرئاوا، بەرامبەر بەو جەورو ستەمەی کە لێی ئەکرا بێدەنگو دەسەوسان نەمایەوە. توانی شۆڕش بەرپا بکاتو دەنگ هەڵبڕێت، دەنگی بگەیەنێتە هەموو گوێیەك. لە ئەنجامیشا جێی خۆی لەناو کۆمەڵگەدا کردەوە. توانی لە کرێدا لە زۆر شتی تردا یەکسانی لە گەڵ پیاودا بەدەستبێنێت. ئەمەش واقیعێکە هەمووومان هەستی پێئەکەین!

مامۆستا ساڵح: ئای کچی شیرینم! تۆ گەرچی قۆناغێکی ئەوتۆت لە زانیاری بڕیوە، بەڵام هێشتا هەر کاڵو کرچیت لە زانیاریو بیرو سەرنجدا تاقیکاریت بەدەست نەهێناوە، هەرشتێك لەگەڵ حەزو هەوەستا بگونجێت وا ئەزانی هەر ئەوە ڕاستە. تۆ ناشارەزای سروشتی ئادەمیزادیت. سروشتی مرۆڤ ئەچەمێتەوە بەڵام ناشکێت. ئافرەتی بەسەزمانی خۆرئاوا لەهێلانەی پڕ لە ئاسودەییدا هێنرایە دەرەوە کاری پێکرا، ماندوو کرا، لەماڵو منداڵو بزەی شیرینی جگەرگۆشە بێبەشکرا، لە حەزوو ئارەزوی دایکێتی کە حەزێکی ڕەسەنو بەهێزی سروشتیە ئاوەڕووت کرا. جگە لەوەش مێیەتی (الانوثة)ی لێ شێوێنرا کە گەورەترینو بەکارترین چەکی سروشتی دەستی ئافرەتەو بەهۆیەوە ئەتوانێ ڕاوی دڵی پیاو بکات، ئەمەشی لێ شێوێنرا. کەرامەتو ئابڕوو و بێگەردی لێشارایەوە، نازو لارو لەنجەی لێ دوورخرایەوەو لە بیری برایەوە، گوایا (خانم) کارئەکاتو ئازادی دەسکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشا کرێکەی لە کرێی پیاو کەمترە!! جا توخوا گەر هاوار نەکات، دەنگ هەڵنەبڕێت، گەر ماننەگرێت، خۆپیشاندان نەکات، شۆڕش نەکات، ئەی چی ماوە کە بیکات؟! مافی بخورێتو قرەش نەکات؟ فڕێ بدرێتە ناو دەریاو تەڕیش نەبێت؟ ئەی بۆچ ئاژەڵە؟! هەرچۆنێك بناڵێو وەڕسی خۆی دەربڕێت هێشتا هەر کەمە! من لە ئێوە چاکتر ئەزانم کە سروشتی بێداربۆوە، هاتە ئێش، کەوتە ناڵینو ئەویشی هێنایە ناڵین، بۆیە کەوتە قیژەو هاوارکردن. سروشتی هاتە دەنگو ئەویشی هێنایە دەنگ. چی ما نەیکات؟ ئیش بوو کردی .. کردی. ڕەنج بوو دایو ئەزیەتی چەشت لە پێناویا. عەرەق بوو ڕشتی، مێیەتی بوو لەدەستی چوو. بەهای بەرز بوو، گووم کرا پێی، ئەی ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە ڕاپەڕێ، هاوار بکات؟ بەڵێ، کاتی هاتووە، هەق وایە دەمی هەمیشە بەم چوار خشتەکییەوە بجوڵێنێ.

جەوری پیاوان، ستەمکاریان، زۆری هێناوە
کۆتو زنجیریان لە ڕیشەی گیانمان توند توند ئالاوە
لە وزەی خستوین. ئیتر بەس نییە؟ تاکەی هەر وابێ؟
چی بوو نەمان کرد؟ جگە لە شۆڕش چ ڕێیەك ماوە؟!

سکالا: شۆڕش تەنها کردنی حیساب نییە، بەرهەمەکەی حیسابە.

مامۆستا ساڵح: ئافەرین سکالا خان! قسەکەت زۆر ڕاستە. بەڵێ، منیش ئەزانم، ئافرەتی خۆرئاوا هەراو هوریای زۆری بەرپا کرد بۆ مافی پێشێلکراوی. بەڵام ئایا ئاواتەکانی بە تەواوی هاتنەدی؟ ئایا تۆ دڵنیایت لەوەی کە ئێستاش نەڕوتێنرێتەوە؟ ئایا ئەزانی کە کرێی کارکردنی لەگەڵ هی پیاودا تا ئێستاش نایەکسانە؟

ڕەنگە لاتان سەیربێت کە ئەڵێم، لە ئینگلتەرادا – کە بە دایكو باوکی دیموکراتیەت ناوی ئەبەن – تا ئێستاش کرێی ئافرەتو پیاو نایەکسانەو وەك یەك نییە. خۆ لە پەرلەمانی بەریتانیادا نوێنەرانی ئافرەتانیش هەن، شای وڵاتو سەرەك وەزیران ئافرەتن! ئیتر شۆڕش چ دادێك ئەدات؟

ئافرەت هەرگیز ئازادی ڕاستەقینە بەخۆیەوە نابینێت هەتا ڕێگەی بەختیاری نەگرێتە بەر. ڕێگەی بەختیاریش تەنیا ڕێگەی خوایە. جگە لە ڕێگەی خوا هەموو ڕێگەیەکی تر ڕێگەی بەدبەختیو سەرلێشێواویە. بمانەوێو نەماوێ، بەختیاری ئافرەت لەو کارو بوارەدایە کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ئەگونجێن. ناو ماڵو بەرەخستنەوەو پەروەردەکردنی چاکترین بەرهەمە کە مرۆڤە. مرۆڤ نەك بەرهەمی مادیی.

# سەربەستیی یان بەندەیی و گەردنکەچی؟

پرشنگ: مامۆستا! هەر هیچ نەبێت، ئافرەتی خۆرئاوا خۆ سەربەستە سەربەخۆیە، چەوساوەو ژێردەستە نییە. هەرچی بکات ئەیکات، بۆ کوێ بیەوێ ئەڕوات، بە هەوەسی خۆی ئەخوات و ئەپۆشێت و گەشت ئەکات. بەکورتی، چۆنی بوێت ئەژی و ڕای ئەبوێرێت. ئیتر لەوە زیاتر چی بووێت و چی لەوە چاکترە؟

مامۆستا سالّح: خۆزگە ئێوەو مانان ئەتانزانی چۆن زاراوەی زمانەکەمان بەکاربێنن و چاك لە ماناکانیان ئەگەیشتن! ئەوسا ئا بەم جۆرەی ئێستا ئیتر بەکارتان نەئەهێنان. ئەوەی لە ئێوە تێبینیم کردووە، ئەمەیە کە جیاوازیی لە نێوان هەندێ وشەدا ناکەن، بۆ نموونە: سەربەستیی و بەرەڵایی، سەربەخۆیی و بێئابڕوویی، ئازادی و چەوساوەیی...

بێگومان هیچ شتێك لە ژیاندا بە وێنەی سەربەستیی و ئازادیی و سەربەخۆیی بەتام و بەنرخ نییە، ژیان بێ ئەوانە بێتام و بێ خوێیە، بێکەڵك و بێواتایە، بەڵام کام سەربەستیی؟ کام ئازادیی و سەربەخۆیی؟ چۆنن؟ جیاوازیی (إختلاف)ەکە لەمەدایە. هەردەستەو کۆمەڵێك سەنگ و پێوانەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەم مەبەستە.

ئێوە ئەگەر شارەزای مێژوو و بەرنامەی ئیسلام بوونایە، زۆر بە ئاشکرایی ئەتانزای کە سەربەستیی و ئازادیی و سەربەخۆیی ڕاستەقینە تەنیا لە ئیسلامدا بوون و هەن. ئیسلام ئەم حەقیقەتەی بە کردار نەك بە دروشمی قەڵەو وشەی بریقەداری زلە زلە سەلماندووە.

کاتێ ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەرکەوت، بەندایەتیی لە چڵەپۆپەدا بوو، هیچ کەسیش بیری لە گیروگرفتی بەندە نەئەکردەوە، تەنانەت ئەو گیروگرفتە بە گیروگرفت نەئەزانرا. کەچی ئیسلام – بەرنامەی خوا – ئەوەی بە بیردا نەئەهات لەو ڕۆژەگارەدا کردی بۆیان، لەو کاتە ناسکەدا موسڵمانەکان بەپارەی گیرفانی خۆیان بەرەنجی شان، بە ئارەقی ناوچاوانیان، بەندەیان لە خاوەنەکەی ئەکڕی و ئازادیان ئەکرد. توخوا لەوە سەربەستیی خوازیی، ئازادیخوازیی جوانتر هەبووەو بە درێژایی مێژوو ڕوویداوە؟

سەربەستیی وەك (ئەحمەد کاکە مەحمود) لە پەڕاوی "سەربەستیی لە ئیسلامدا" ئەڵێت: "بریتیی نییە لە ئاشووب و ئاژاوەنانەوەو بەرەڵڵایی و ڕاکردن لە یاسا. بریتیی نییە لە بە ئارەزوو ڕابواردن و تەماشاکردنی شەرەفی ئەم و ئەوو هەموو کەسێ دەست لە شەرەف و نامووسی خۆی بشۆرێت. سەربەستیی، جەردەیی و خەیانەت و بەرتیل و سوود خواردن و داماڵینی بەرگی غیرەت و شەرەف نییە".

یەکەمین وشە کە بنەڕەتی موسڵمانەتییە (لا اله الا الله)یە. کە بریتییە لە ڕزگارکردن و سەربەستکردنی ئادەمیزاد. هەمو ئادەمیزاد. لە هەموو هێزو دەستەلات و جەورو ستەمێك لەم سەرزەوییەدا، ئیتر سەرچاوەکەی هەرچۆنێك ببێت. خەڵکی کەی ناوی سەربەستیی ئەزانی یان بیستبووی، کاتێ پێشەوامان عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: "تاکەی خەڵك ئەکەن بە بەندەو کۆیلە..؟ لە کاتێکدا بە ئازادیی لە دایك بوون". "متى استعبدتم الناس..؟ وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا".

سەربەست: مامۆستا، ئەی سەربەستیی ڕاستەقینە کامەیە؟

مامۆستا سالّح: سەربەستیی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە پلەیەکا بێت زیانبەخش نەبێت بە ئادەمی خۆی، بەتاك، بە کۆمەڵ، بە دەوڵەت.

دوور بێت لە ئاشووبەو ئاژاوەنانەوەو بەرەڵڵایی و ڕاکردن لە یاسا و ئارەزووپەرستی و جەردەیی و پشێویی و ناپاکیی و گزیکاریی و خۆداماڵین لە بەرگی شەرەف و غیرەت و سەربەستیی ڕاستەقینە، ئەبێ وەها بێت.

ئافرەتی بەسەزمانی خۆرئاوا، بەرەڵلایی دراوەتێ نەك سەربەستیی، چەوساوەیە، ژێر دەستەیە، بەندەیە .. بەندە، سەربەستیی چی؟ بەندەو گەردنکەچی مۆدە، باوونەریتی بۆگەن، ئارەزوو هەوەسی ئاژەڵییانەی خۆی و پیاوە، نەك پیاوی پیاوانەی مەردو ژیر، بەڵکو پیاوی سەرسەریی و بەرەڵلاو زوڕناقیی.

ئافرەتی خۆرئاوا، بەندەو گەردنکەچی هۆنەرو نووسەرو خاوەن گۆڤارو ڕۆژنامەنووس و چیرۆکنووس و دەرهێنەرو سینەمایی و خاوەن کارگەو پیاوانی بازرگان و کاسبکارە ویژدان گەنیوەکانە. بەندەو ملکەچی کارگەکانی قوماش و داودەرمانی خۆجوانکردن و خاوەن کەماڵییەتەکانە. ئەمە جگە لەوەی کە بەندە و گەردنکەچی کوڕو کاڵ و پیاوە بەرەڵلا بێ ڕەوشتەکانە. هەرچی ئەوانە بۆی دابێنن و بۆی دابنێن، هەرچی ئەوانە بیڵێن و بیخەنە بەردەمی ناتوانێ نەیکات و خۆی لێ لابدات، ئەبێ بە گوێیان بکات، ئەبێ ڕازیی و دڵنەواییان بکات، ئیتر سەربەستیی کامەیە؟

*             *             *

سەربەست ئەو کەسەیە کە حەزو ئارەزووو بەرژەوەندی خەڵك تەنانەت هەواو هەوەسی خۆی، نەتوانێ گەردنکەچ و ملشۆڕی بکات، نەتوانێ لە کەرامەت و بەهای بەرز بیگێڕێتەوە، لە ئاستی مرۆڤایەتییدا بە بەرزیی بمێنێتەوە، سەربەستی ئەبێت لە ئاییندارییی، لە زانیاریی، لە کارکردنی ڕەوا، لە خاوەندێتی، لە جلوبەرگ، لە بیرو داهێناندا، لە خۆراك و نیشتەجێبوون (السکن) و گواستنەوەدا بێت، نەك لە بەرەڵلایی و بەدڕەوشتی و ئەم باوەش و ئەو باوەش کردندا بێت.

بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەتوانم بڵێم: ئافرەتی موسڵمان ئازادو سەربەستەو لە چوارچێوەی سەربەستیی و ئازادیی ڕاستەقینەدا ئەژی. چونکە گەردنکەچ و پێبەستراوی ئەو شتانە ـ کەناومان بردن ـ نییە. دەستی هیچکام لەوانەی ناگاتێ، تەنیا بەندەی خوایە، گەردن تەنیا بۆ خوا کەچ ئەکات، ئەو خوایەی کەخەلقی کردووە، بۆیە بە پێی بەرنامەکەی ئەژی و یاساکانی بەرنادات، بۆیە لە ئاستی مرۆڤایەتیی خۆیا ئەمێنێتەوەو بەرزەو گیانی بەستراوە بە ئاسمانەوە.

بەڵێ، ئافرەتی خۆرئاوا هەرچی ـ لەبەدڕەوشتی ـ بوێت، ئەتوانێ بیکات و ڕێی لێناگرن، ئارەزووی هەر کوێی هەبێت، ئەتوانێ بڕوات بۆ ئەوێ، بەڵام لەدوای چی، پێشینان گوتویانە: "لەدوای ڕوتکردنەوە تەشتی تەلا بخەرە سەر سەرت". کاتێ ئادەمیزاد لە بەنرخترین بەهای ئادەمییانە ـ کە ئابڕوو، پاکیی، بێگەردیی، حەیاو شەرەفە ـ داماڵراو ڕووتکرایەوە، ئیتر ئەبێ بۆچ سڵ بکاتەوە؟ لەچی سڵ بکاتەوە؟ لەچی بترسێ؟ بۆچ بترسێ؟ کەسێ لەناو زەلکاوا مەلە بکات، ئایا هەرگیز غەمی تەڕبوون ئەخوات؟ ئیتر بۆچ نەگەڕێ؟ بۆچ نەپۆشێ؟ بۆچ.. بۆچ..؟!

ئافرەتی موسڵمان کە لە هەندێ شت سڵ بکاتەوە، کە قەرەی هەندێ شوێن و کەس و کارو ئیش ناکەوێت، ئەیەوێ وەك ئافرەتی خۆرئاوا لە مرۆڤایەتی خۆی نەچێتە دەرەوە، ئەیەوێ خواو پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆی نەڕەنجێنێ، ئەیەوێ پاکیی و بێگەردیی و نرخ و بەزیی خۆی بپارێزێت، ئەیەوێ بەسەری بەرزو ڕووی سوورەوە بگەڕێتەوە بەردەستی خوای پەروەردگاری.

ئافرەتی موسڵمان خوا ئەناسێ، باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەیە، نە دنیای ئەکاتە قوربانی قیامەتی و نەقیامەتیشی ئەکاتە قوربانی دنیای، لەسەر ئەو ڕێبازە ئەڕوات کە خوا دیاری کردووە بۆی، تەنیا گەردن بۆ ئەو خوایە کەچ ئەکات، لەبەرئەوە تەنیا ئافرەتی موسڵمان سەربەست و ئازادە.

سەیرە ئەگەر ئێوە ئازادیی و سەربەستی لەوەدا بەدی بکەن کە ئادەمیزاد هەرچی بێت بەسەریا یان بۆی بلوێت، بیکات، یاخۆ حەز لە هەر شتێ بکات، بیکات، بۆ کوێ بیەوێ بڕوات، سنوورێك بۆ کردەوەو وتەی خۆی دانەنێت، ئەمەم زۆر بەلاوە سەیرە، ئەگەر ئێوە، ئەو هەڵسوکەوتە بەسەربەستیی و ئازادیی دابنێن.

ڕەنگە . ئەگەر حیساب بەو جۆرە بێت کە ئەبێ وەهایش نەبێت . شێتو منداڵ لە هەموو کەسێکی تر سەربەستو ئازادو سەربەخۆترین، چونکە ئەو مەرجانەیان تێدایە کە پرشنگ خان لە ئافرەتی خۆرئاوادا هەڵیدانو ناوی بردن. جا ئەگەر زاراوەکان لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیاندا دابنێن، ئەبێ بڵێین: ئافرەتی خۆرئاوا سەرگەردانە نەك سەربەست، سەرلێشێواوە نەك سەربەخۆ، چەوساوەیە نەك ئازاد، چەواشەکراوە نەك ڕێگەزان، کلۆڵو بەدبەختو چارەڕەشە نەك کامەرانو بەختیارو بەختەوەر.

نەشمین: بەڵام، مامۆستا گیان، سەربەستیی کاتێ پێی ئەوترێ سەربەستیی کە فراوانو بێسنوور (مطلق) بێ، ئەگینا تامی نییە.

سەربەستیی بێسنوور خەیاڵێکی خاوە

مامۆستا ساڵح: منیش لە ئێوە ئەپرسم: ئایا سروشت سەربەستیی (مطلق) بێسنووری بۆ ئادەمیزاد یان گیاندارەکانی تر گرتۆتە خۆی؟

ئاواز: بەڵێ، بەڵێ، ئەوانەی کە شەیدای سەربەستین، بۆ هێنانەدیو جێبەجێکردنی ئەو سەربەستیی و ئازادییە سروشتییە هەوڵ ئەدەن.

هەڵکەوت: ئەو سەربەستییە خۆی هەیە، بەڵام هەندێ ئەیانەوێ نەیهێڵن.

مامۆستا ساڵح: سەیرە! نازانم ئێوە چۆن توانیوتانە قۆناغەکانی خوێندنی قوتابخانە ببڕن، چۆن ئەگەنە زانکۆ، چۆن تەواوی دەکەن، ئەبوایە ئاستو ئاسۆی بیرتان گەلێ بەرزو ڕۆشن بونایە، کەچی وانین. بەداخەوە، لەوەش سەیرتر، جۆری بیرکردنەوەتانە، فێری ئەوە نەبوون کە پێش قسەکردن بیربکەنەوە.

ڕۆڵەکانم، لە ڕاستییدا سەربەستیی بێسنوور، لە هیچ شوێنو کاتێکی سەرزەویدا نەبووەو نییەو نابێت، سروشت خۆی وەها خولقێنراوە کە سەربەستیی بێسنوور نەگرێتە خۆی، چونکە ئەو جۆرە سەربەستییە نەشیاوو نەگونجاوو زەرەر بە کۆڵە بە تایبەتی بۆ ئادەمیزاد.

پرشنگ: مامۆستا، ئایا بۆ ڕاستیی بۆچوونەکەت، بەڵگەت بەدەستەوەیە؟

مامۆستا ساڵح: ئەوە بۆچوونی من نییە، بەڵکو حەقیقەتێکی ئاشکراو دیارە.

سەربەست: ئایا زانیاریی پشتگیریی ئەوە ئەکات کە حەقیقەت بێ.

مامۆستا ساڵح: بەڵێ، پشتگیریی ئەکات، هەمووومان ئەزانین، تاقیکاریی گرنگترین هۆو ڕێگەی زانیارییە ئێستا، جا ئێمەش بۆ نزیککردنەوەی باسەکە لە مێشك، با پەنا بەرینە بەر نموونە:

یەکێك لە ئێمە لە باکووری ئەفەریقاوە ئەیەوێ بڕوات بۆ ئەوروپا، چونکە سەربەستەو ئەیەوێ گەشتو گوزار بکات. چۆن ئەڕوات؟

نەشمین: ئەمە شتێکی ئاشکراو ڕونە، پاسپۆرت تەواو ئەکات هەرچی پێویست بێ لە پارەو کەلوپەل ئامادەی ئەکات، سواری ئۆتۆمبیل ئەبێ تا ئەگاتە لای دەریا، لەوێوە بە کەشتیی یان بە فڕۆکە ئەڕوات بۆ ئەوروپاو گەشتو سەیرانی خۆی ئەکات.

مامۆستا ساڵح: دەی ئەگەر من بڕۆم ئەوانە هیچکام ناکەم.

جوان: چۆن هیچکامیان ناکەیت؟ بێ ئەوانە گەشتەکە سەرناگرێت.

مامۆستا ساڵح: چۆن سەرناگرێت؟ ئەی من سەربەست نیم؟ ئەی بۆچ سەربەستییەکەم بێسنور نییە؟ ئەبێ گەشتەکەم سەربگرێت؟

گوێ بە ئاو نادەمو بەپێ وردە وردە ئەکەمە ئەوبەر، ئاو نابێت بمخنێکێنێ، چونکە سەربەستم، سروشت ناهێڵێ ئاوەکە بمخنکێنێ، ئەی سروشت خۆی سەربەستی بێسنووری پێ نەبەخشیوم؟

پاسپۆرتم بۆ چییه؟ كه چوومه ئەوروپا هەركەس لێم بپرسێت له كوێوه هاتووی هەر وەڵامیشی نادەمەوه، قسەش بكات دەمو ددانی ئەشكێنم، ئەی من سەربەست نیم؟ مەیلو ئارەزووی خۆم نییه؟ من گەشتو سەیرانی خۆم ئەكەم، نابێ كەس هەقی بێت بەسەرمەوه.

پارەو كەلوپەلیش نابەم لەگەڵ خۆما، كه چوومه ئەوروپا لەوێ هەموو شتێك هەیه، ئەچمه چیشتخانه خواردن ئەخۆم، له چایخانەدا چا ئەخۆمەوه، له ئوتێلدا ئەخەوم، له گەرماوا خۆم ئەشۆم، له دوكانەكاندا هەر شتێكم بووێت هەڵی ئەگرم، پێویست به پاره ناكات ئەی من سەربەست نیم؟ ئەی سەربەستییەكەم بێسنور نییه؟

لەوەش زیاتر هەر ئافرەتێ كه دڵم بیگرێت قۆڵ ئەكەم به قۆڵیاو بۆ كوێ ئارەزووم بێت، ئەیبەم لەگەڵ خۆمداو لەگەڵیا به ئارەزووی خۆم ڕائەبوێرم، بۆچ ئەتوانێ بڵێت نایەم لەگەڵتا؟ بۆچ كەس حەددی هەیه فزره بكات؟ من سەربەستم،، سەربەست.

نەشمین: مامۆستا، من مەبەستم ئەو جۆره سەربەستییه نەبوو.

مامۆستا ساڵح: دەی سەربەستی بێسنوور ئەوەیه كه باسم كرد بۆتان. جا كه ئەڵێم سەربەستیی بێسنوور سروشتا نەیگرتۆته خۆی، ئایا بەڵگەم به دەستەوەیه یان نا؟ ئایا زانیاریی لەسەر منه یان ئێوه؟

سەربەست: بەخوا زانیاریی و ژیریی لەسەر تۆن لایەنگیریی تۆ ئەكەن.

پرشنگ: بەڵگەكانت واقیعیی و ڕاستن. ئێمه مەبەستمان ئەو سەربەستییه نییه، بەڵام ژیان بێ سەربەستیی ناخۆشه.

جوان: به خوا هەركەس بیەوێ بەو جۆره سەربەستییه بجوڵێتەوه، وای ژێر ئەكەن، تا مابێ ناوی سەربەستیی نەیەت به دەمیا.

مامۆستا ساڵح: منیش له سەرەتاوه پێم گوتن، سەربەستیی تامو خوێی ژیانه. بەڵام سەربەستیی ئەبێ سنووری هەبێت.

## پێشكەوتن دوو لایەنی سەرەكی هەیە

ڕووناك: مامۆستا گیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا، ئافرەتی خۆرئاوا . ئەوەتا هەستی پێ ئەكەین . پێشكەوتووه، هەر هیچ نەبێ، له ئافرەتی خۆرهەڵات پێشكەوتوتره، ئافرەتی خۆرئاوا ئاستی خوێندەواریی بەرزه، ژیانی له ڕووی خۆراكو پۆشاكو بەكارهێنانی ئامێرو شتی تری حەسانەوەوه لەئافرەتی ئێره چاكتره. پلەی ئابوریی بەرزبۆتەوه، هۆ (وسائل)ی حەسانەوەی له دەستدایه، به كورتی ئافرەتی خۆرهەڵات . بەتایبەتیی موسڵمان . بەچەند سەدەیەكی تر ناگاته ئەو قۆناغه شارستانییەته بەرزه كه ئەو ئێستا پێی گەیشتووه.

مامۆستا ساڵح: خوشكه ڕووناك، ئەوەی كه گوتت، زیادی هەیەو كەمی نییه، لەو ڕووانەوه ئافرەتی خۆرئاوا زۆر پێشكەوتوتره له هی لای ئێمه، بەڵام پێشكەوتنی ڕاستەقینەی بەكەڵك دوو لایەنی سەرەكیی هەیه، لایەنی ناوەوه (داخلی)و لایەنی دەرەوه (خارجی)، ئافرەتی خۆرئاوا لەلایەنی دەرەوەدا پێشكەوتنی گرنگی بەدەستهێناوه، بەڵام لایەنی ناوەوەی بەرەو دواكەوتن هێشتا هەر هەنگاو ئەنێت.

پرشنگ: لایەنی دەرەوه كامەیەو لایەنی ناوەوه كامەیه؟ یانی چی؟

مامۆستا ساڵح: پێشكەوتنی ڕاستەقینه بریتی نییه له تەكنۆلۆژیاو ئابووریی و ئامێره داهێنراوەكان و بەكارهێنانییان و بەس، بەڵێ ئەوانه زۆر چاكو پێویستن و خزمەتی ئادەمیزاد ئەكەن و ئەیحەسێننەوه، بەڵام ئەوانه به تەنیا پێیان، ناگوترێت پێشكەوتنی ڕاستەقینه.

ئەوانەی ماموٚستا ڕووناك باسی كردن، لایەنی دەرەوەی پێشكەوتنن. ئەمجا بەكارهێنانیشیان بەشێوەیەكی دروست مەرجێكی سەرەكیی گرنگەو ئەبێ بزانرێت چۆن بەكاربهێنرێن، ئەبێ بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی بۆ بەرزكردنەوەی ئادەمیزاد بەكاربهێنرێت نەك بۆ تێكشكاندنی.

لایەنی ناوەوە مەبەستمان لێی، گیانە، دەروونە، دڵە، مێشك و بیرە، كەرامەت و حەیاو شەرەفە، ئاكاری جوانە، هەڵسوكەوتی گونجاوو ڕاست و پاكە لەگەڵ كەسانی تری كۆمەڵگەدا، بەكورتی مانەوەی ئادەمیزاد لەبەرگو كالای مرۆڤایەتیدا، دەی ئافرەتی خۆرئاوا ئەم لایەنە گرنگە سەرەكییەی نەك هەر دواكەوتووە، بەڵكو شاراوەو نادیارەو پێچراوەیە. ئەمەش بە نیسبەت ئافرەتی ئەوێوە كارێكی سەیرو غەریب و نامۆ نییەو دیاردەیەكی تازە بابەت نییە بۆی، بەڵكو سەرەكییەو بنچینەییە، چونكە شارستانیەتی دوور لە گیان و دوور لە ڕێگەی خواناسیی هەر ئەوەندەی تێدایەو پێوەیە. بۆ نموونە:

ئافرەتی خۆرئاوا . وەك گوتمان . خاوەنی داراییەكی ئەوتۆی سەربەخۆی خۆیەتی، ئەگەر نەیبێ ناژی، هی وایان هەیە زۆر زۆر دەوڵەمەندە، هەر ڕۆژە چەندەها – بگرە دەیان و سەدان – دۆلار، جنیە، ڕۆبڵ یان مارك، بۆ مەبەستی جۆراوجۆری خۆی خەرج ئەكات، ئەتوانم بڵێم زۆربەی ئەو مەبەستانە پێویست نین و گەر نەبن و نەكرێن ئافرەت پەكی ناكەوێت، چونكە لە دەستەو ڕیزی (كماليات)دان. كەچی ئەو ئافرەتە دەستبلاوە، ئەگەر ئادەمیزادێكی ناچاری لێقەوماو، دەستی یارمەتی لێ پان بكاتەوە، سۆزی ناجووڵێت بۆی و دەس ئەنێت بەڕوییەوە.

كەچی ئافرەتی موسڵمانی دواكەوتوی لای ئێمە، لە كاتێكا كە شەكەت و ماندووە، تەنانەت لە كاتێكا كە بەئیش و كارەوە پەشۆكاوەو كەمدەستیشە، هەر كە لێقەوماوێك دەستی یارمەتی بۆ درێژ بكات، هەست و سۆزی یەكسەر ئەبزوێن، گیانی پاڵی پێوە ئەنێت، بەپێی توانا یارمەتیی ئەو لێقەوماوە ئەدات، بۆچ؟ چونكە زۆر نەبێت كەم تینی باوەڕ بە خوا، باوەڕ بە پاداشت لە دڵیایەتی، چونكە پرشی شارسیتانیەتی ئیسلام ناخی ئاوەدان كردۆتەوە.

دەی فەرموو پێم بڵێ، ئافرەتی ئەوێ بەو ئاستە بەرزە مادییەی ژیانیەوە، هی ئێمەش بەم ئاستە نزمە ماددیەوە، كە خاوەنی گیانێكی موسڵمانانەیە، كامیان لەم ڕ،ووەوە بە پێشكەوتوو دائەنێن؟

سكالا: ئەو كەسەی یەك تۆسكاڵ ئاوەزو ویژدانی ببێ، ناتوانێت بڵێ خۆرئاوییەكە لەم ڕووەوە پێشكەوتووە، پێشكەوتنیش ئەبێ كاتێ پێی بگوترێت پێشكەوتن، كە هەستی مرۆڤایەتیی پەرە پێبسێنێ نەك ڕەگ و ڕیشەی لە بنا دەربهێنێ.

ماموٚستا ساڵح: هەروەها لە ڕووی پاكیی و بێگەردییەوە، شەرم و حەیا، دەستپاكیی و دەمپاكیی و داوێنپاكیی، ڕێزگرتن، خزمەت و بەهاناهاتنەوە، پرسینەوە لە كەسوكارو دراوسێ، سۆزو بەزەیی پیاهاتنەوە، زمان شیرینی و میهرەبانی نواندن و چەندان سیفات و تایبەتمەندیی و ئاكاری تری جوانی مرۆڤانەوە، ئافرەتی موسڵمان هی خۆرئاوای نەك هەر بەجێهێشتووە، بەڵكو وەك ئاسمان بۆ ڕێسمان وەهایە، جا نازانم ئێوە ئەم هەموو سیفەتە نایابانە بە نیشانەی شارستانییەت یان دواكەوتن دائەنێن؟

جوان: بەخوا نیشانەی شارستانییەتی پاك و ڕەسەن ئەمانەن كە لە ئافرەتی موسڵماناندا هەن، ئێستا تێگەیشتم كە شارستانییەت دوولایەنی هەیە، هەرگیز باوەڕ ناكەم كە ئافرەتی خۆرئاوا ئەم نیشانەو سیفەت و تایبەتمەندییانەی تێدا بێت، سامەگەر بە دەگمەن.

ماموٚستا ساڵح: كوڕو كچە شیرینەكانم، پێشكەوتنی ڕاستەقینەی ڕەسەن، پێش ئەوەی لە جیهانی دەرەوە (مادە) دا ڕوو بدات، ئەبێ لە جیهانی ناوەو (ڕوح)دا ڕووبدات، ئەبێ لە ناخی مرۆڤدا . پێش هەموو شتێكی تر . دەستی پێ بكرێت، هەر پێشكەوتنێك لە ناخەوە دەست پێ نەكات، بەناخەوە نەبەسترێ، وابەستەی باوەڕێكی

پاکی مرۆڤ دۆست نەبێت، ئەو پێشکەوتنە بێ کەڵکە، بێ سوودە. لەوەش زیاتر ئەبێتە بەڵاو نەگبەت بۆ مرۆڤایەتیی.

ئافرەتی خۆرئاوا یەکێك لە لایەنە ڕەسەنە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی گومکردووە، یاخۆ لێی گوم کراوە، کەواتە ڕاست نییە کە بووترێت، ئافرەتی خۆرئاوا لە هەمو سەرێکەوە پێشکەوتووە، قەید ناکات بڵێین لەلایەنی ماددییدا پێشکەوتووە، بەڵام لە لایەنی گیانییو دەروونییو تایبەتمەندییەکانی تری مرۆڤایەتییدا نەك هەر دواکەوتووە، بەڵکو وێرانە، سەرگەردانە، لە هەستو نەستی مرۆڤایەتیی دوور خراوەتەوە.

جروان السابق، لە عیبارەتێکی بە بڕشتی کورتا ئەڵێت: "شارستانییەت ئەم ئافرەتەی – ئافرەتی سەدەی بیستەمی – هیلاك کرد، هەروەك چەرخی بەرەڵلایی (الدعارة) هیلاکی کرد، تووشی نەوباتی عەصەبیو ئازاری بەردەوام بوو، بۆ دەنگی حەزەکانی ئەقیژێنێ، وانە بێت ئەم شارستانییەتە تەنیا ئاوریشمی نەرمی پێ بەخشی بێت، بەڵکو "دەرزی پیاچەقاندن"یشی پێ بەخشیوە، هەروەکو پێستی ژیشکی بەهەڵگەڕاوەیی لەبەرکردبێت وەهایە بۆی". [1]

## دوای کڵاوی بابردوو نەکەویت

ئاواز: ئاه.. ئاه! بیرکردنەوە لە بەدبەختیی ئافرەت، ئادەمیزاد پیرو پەککەوتە ئەکات، لە کۆنو تازەدا هەر بەدبەختو چەوساوەو مافخوراو بووە، تەنیا یەك ڕێگە هەیە بۆ ئافرەت کە بیگرێتو بەری نەدات، تەنیا ئەو ڕێگەیەش ئافرەت بەرەو بەختیاریی ئەبات، ئەویش ڕێگەی سۆشیالیستە.. سۆشیالیست.

لە سۆشیالیزمییەتدا – بە تایبەتی شیوعییەت –، جیاوازیی لە نێوان پیاوو ئافرەتدا نییە، یەکیەتیی سۆڤییەت ئەم یەکسانییەی جێبەجێ کرد، وڵاتی چین یش بە کورتترین ڕێگە ئەم قۆناغەی بڕی، واتە گرتنی ئەو ڕێگایە تەنیا چارەیەکە کە دەردی ئافرەت چارەسەر ئەکاتو بەرەو بەختیاریی ئەیبات.

مامۆستا ساڵح: ئاواز خان، بێگومان تۆ لە سۆشیالیستییەت تەنها هەندێ ڕستەو وشەی زل و قەڵەو قەڵەوو بریقەدارت بیستووە، یاخۆ خوێندوتەوە، باوەڕناکەم بە قووڵیی لەو ڕێبازە شارەزابێت هەبێو بزانی پایەکانی لەسەر چی دامەزراوە.

سۆشیالیست یان – بە تازەترین ناو – مارکسییەت، ژمارەیەك ڕاڕەوی لێ جیا ئەبێتەوە، گرنگترینیان ڕاڕەوی شوعییەتە کە لە سەر ماددەیەتی جەدەلیی (المادية الجدلية) وەستاوە، ماددیەتی جەدەلیش بریتییە لە فەلسەفەیەکی تایبەتی ژیانو تێگەیشتنێکی پەتی مادیی لە ژیان کە لەسەر ڕێگەیەکی دیالێکتی هەنگاو دەنێت.

جا ماددییە دیالێکتییەکان، ئەم مادییەتە دیالێکتییە یان بەسەر مێژوو، خەڵکناسیی (إجتماع)و ئابوورییدا جێبەجێ (تطبيق) کرد، بەم جۆرە کرا بە عەقیدەیەکی فەلسەفی لە کاروباری جیهانداو بوو بە ڕێگایەك بۆ دەرس خوێندنی مێژووو خەڵکناسییو بوو بە ڕاڕەوێك لە ئابووریی و پلانی ڕامیارییدا، بە داڕشتنێکی تر:

ئادەمیزاد لە قاڵبێکی تایبەتیدا، لە ڕووی جۆری بیرکردنەوەیەوە، لایەنی تێڕوانینییەوە (وجهة نظر) بۆ ژیان و ڕێگەی کارکردنو پێشوازیکردنی ژیانەوە دائەڕێژێ.

بێگومان فەلسەفەی ماددیەتو ڕێگەی دیالێکتێکییەت، داهێنانو بەرهەمی داری ڕاڕەوی مارکسییەت نین، چونکە ملنانو ڕوونان بەرەو مادییەت . واتە فکرەکەی . هەزاران ساڵ لەمەوبەر لە مەیدانی فەلسەفەدا زیتەی

[1] تەماشای (المرأة في القرن العشرين) بکە، ئەم کابرایە یەکێکە لەوانەی کە زۆر خۆرئاوای خۆش ئەوێ، بەڵام جاروبار ڕاستیی قسەی لێ دەدرئەهێنێ.

چاوی هاتووە، هەندێ جار بە زاقیی ئەو بیرە خوی نواندووە، هەندێ جاریش لە پشت پەردەی سەفسەطەو سەهندەیەتیی بەرفراوان (الإنكار المطلق) خۆی حەشار داوە.

ئەو بیرەیە لەسەر دەستی (هیگڵ) دا – کە فەیلەسوفێکی میسالی بوو – پەلوپۆو گۆپکەی کرد، ئەمجا "کارل مارکس" هات، ئەو ژیربێژیی – گەر ئەم ناوە ڕاست بێ –و فەلسەفەیەی سەرلەنوێ داڕێژایەوەو هەوڵی دا بەسەر هەموو مەیدانەکانی ژیاندا جێبەجێی بکات، ئەویش لەسەر ئەم دوو پایەیە:

یەکەم: لێکدانەوەو تەفسیرکردنی ژیان لەسەر بنەڕەتێکی مادديی ڕووت.

دووەم: لەسەر بنەڕەتی دژایەتی (التناقض).

بێگومان ئەم باسە زۆر دوورو درێژو قووڵو فراوانە، پێویستیی بە لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفیی قووڵو ورد هەیەو ئێمە هەروا بە سەرپێییەکەوە ناتوانین باسی بکەین، ئەو کەسەتان کە حەزی لەم باسە بێت، ئەتوانێ پەڕاوی "دراسات في الماركسية"ی "جلال الدين الفارسي" بخوێنێتەوە. ئێمە تەنها ئاماژەیەك بوو کە کردمان.

جوان: سەد هەزار قورئان لەسەر یەك ئەخۆم، ئاواز ئەم باسەی نەبیستووەو هیچی لێ نازانێ، هەروا بە کوێرانە دەم لە سۆشیالیست ئەکوتێ، قسەم نییە هەندێ شتیان بە درۆو دەلەسە بۆ باس کردبێت، لەوە زیاتر نییە.

ئاواز: بیبڕەرەوە، وەنەبێت خۆت دەریای فەلسەفە بیت.

مامۆستا سالح: بەڵام پێویست بە دڵ ئێشاندنی یەکتر ناکات.

ئاواز: مامۆستا، سۆشیالیست یان شیوعییەت، بەو پێیەی کە تۆ خۆت ئاماژەت بۆ کرد، چ زیانێکی تیایە بۆ ئافرەت؟

مامۆستا سالح: کچی بەڕێزم، ئەو ڕاڕەوە خۆی هەر لەسەرەتاوە هەڵەیە، ناڕاستە. جا شتێ کە بنەڕەتەکەی ناڕاستبێ، ئەی ئیتر چۆن بەڕاست دەرئەچێت؟ خانوویەك کە بنەڕەتەکەی بەهەڵە داڕێژرابێت ئایا ئەو خانووە دوایی بەشێوەیەکی ڕاست دێتە کایەوەو هەموو قاتو ژوورەکانیان ڕاست دەرئەچن؟

ئاواز: دیارەو ئاشکرایشە هەرچی بنەڕەتەکەی بەهەڵە دابڕێژرێت، ئەو شتە بە هەڵە دەرئەچێت، بەڵام خانوو شتێکەو سۆشیالیست شتێکی ترە.

مامۆستا سالح: نەخێر، تۆ لە مەبەستەکە تێناگەیت، چونکە هەر وەك خانوو کە بناغەی هەیە، هەموو بیرێکیش بناغەو پایەی سەرەتاییو سەرەکیی هەیە، ئەو بیرە لەسەر ئەوانە ڕائەوەستێ، جا کاتێ بناغەو پایەکان بە هەڵە دەرچوون، دیارە ئەو بیرە هەموو لقو پۆپەکانیشی بەهەڵە دەرئەچن.

تۆیش – ئەگەر دڵگران نەبیت – بە هەڵە تێگەیشتوویت، ئەو بۆچوونەی کە بۆی چوویت ڕاست نییە، ئافرەت هەرگیز لەو ڕێگەیەوە بەختیاریی بەدەس ناهێنێ، بەڵکو زیاتر لە لیتەی بەدبەختییو سەرسەختییدا ئەچەقێت، ئەمەش گوتنێکی سادەی بێبەڵگە نییەو بە تۆی بڵێم، بەڵکو زانیارییو واقیع سەلماندوویانەو زیاتریش ئەیسەلمێنن، بۆیە داوات لێ ئەکەم کە "دوای کلاوی بابردوو نەکەویت".

## نه بڕبڕەی پشتەو نه نهۆمی یەکەم

**ئاواز:** ئەو پایانەی کەناوت بردن، چ ناتەواوییەکیان تێدایە؟

**مامۆستا ساڵح:** لە پێشەوە پێم گوتن کە ئەم باسە قووڵ و دوورو درێژە، بەڵام بە کورتەیەك وەڵامت ئەدەمەوە:

شیوعییەت تەنیا باوەڕی بە ماددە هەیە، ئەوەی کە هەست (حواس)ەکان هەستی پێ نەکەن، باوەڕی پێ ناکات، هەرچی لە هەست کردن بەدەر بێت، بە خورافاتی ئەژمێرێ. "إنجلز" ئەڵێ: "ڕاستێتیی گێتیی لە ماددەدا خۆی ئەنوێنێ "إن حقيقة العالم تنحصر في ماديته". تەنانەت دان بە بوونی گیاندا نانێن و ئەڵێن: "ئەوەی پێی ئەوترێت گیان (الروح) خۆی جەوهەرێکی سەربەخۆ نییەو بەرهەمی مادییە".

**هەڵکەوت:** واتە دان بە بونی خالقدا بۆ ئەم "بوون"ە نانێن. بڕوایان بە خواو پێغەمبەران و پەڕاوەکانی خواو زیندووبونەو شتەکانی تر۔ نییەو لە ماددە دوور ناکەونەوە.

**مامۆستا ساڵح:** بەڵێ، وایە. هەر بۆیەش لەسەر بنەڕەتێکی ماددیی تەفسیری مێژوو ئەکەن، هەموو شتێك دەدەنە دەست کاریگەریی ئابووریی. ئەوانە وا بیر ئەکەنەوە کە مرۆڤایەتیی بە شێوەیەکی حەتمیی ئەبێت بەم دەورانەدا تێپەڕێت: کومۆنەی یەکەم (الشيوعية الأولى)، بەندایەتی، دەرەبەگایەتیی، سەرمایەداریی. کۆمۆنی دووەم، ئەمەش دوا قۆناغی مرۆڤایەتییە.

**ئاواز:** بەڵام ئایا کەس هەیە بتوانێ بڵێت، ئەوە وا نییە؟

**مامۆستا ساڵح:** وەڵامی ئەم پرسیارە لە "دراسات في الماركسية"ی "جلال الدين الفارسي"و "البديل"ی "ڕۆجیە گارودی"و "التفسير الإسلامي للتأريخ"ی دوکتۆر "عمادالدين خليل"و "دراسات في النفس الإنسانية)ی (محمد قطب)و دەیان سەرچاوەی تردا دەست ئەکەوێت، ئەتوانی بە وردیی بیانخوێنیتەوە.

**نەشمین:** باشە، ئەوانە ئەی نابێ بڵێن، لەسەر چ بنەڕەتێك مرۆڤایەتیی بەو دەورانەدا ئەبێ تێپەڕێت؟

**مامۆستا ساڵح:** ئەڵێن، لەسەر بنەڕەتی ئابوریی، ئەڵێن: هەرچی قۆناغێك کە ئادەمیزاد ئەیبڕێ و بڕیویەتی هەموی کاریگەریی (تأثير)ی ئابووریی ئەبێت و بووە.

**ئاواز:** مامۆستا گیان، ئاخر شتەکە وایە، ئابووریی بڕبڕەی پشتی هەموو شتێکە ئەگەر ژیان کۆشکێك بێت، ئەو نهۆمی یەکەمییەتی!

**مامۆستا ساڵح:** ئیسلام لاریی لە گرنگیی و کاریگەریی ئابووریی لە ژیانی ئادەمیزاددا نییە. بەڵام هەرگیز باوەڕی بەوە نییە کە ئابووریی بڕبڕەی پشتی ژیان و نهۆمی یەکەمی کۆشکەکەی بێت. من نامەوێ بتانخەمە دەریاو چەم و چۆم و بیابانی فەلسەفەوە، بەڵکو ئێستا بە نموونەیەکی بچکۆلەی زیندوو ئەمەتان بۆ ڕۆشن ئەکەمەوە:

ئەمەریکا وڵاتێکی دەوڵەمەندی سەرمایەدارە، سۆڤیەتیش وڵاتێکی دەوڵەمەندی سۆشیالیست یاخۆ شیوعییەت، ئادەی پێم بڵێن، چی ئەمریکای کرد بەسەرمایەدارو چی سۆڤییەتی کرد بە سۆشیالیست، خۆ هەردووکیان دەوڵەمەندن؟[1]

**ئاواز:** سەروەت و سامانەکەیان، واتە ئابوورییەکەیان.

**هەڵکەوت:** نەخێر، چونکە هەردووکیان دەوڵەمەندن، ئەبوایە هەردوو لایان سەرمایەدار یان سۆشیالیست بوونایە، من ئەڵێم هەوڵ و تێکۆشانی میللەتەکانیان، حەزی میللەتی هەر یەکەیان لەویتر جیاواز بووە، بۆیە یەکێکیان سەرمایەدارو ئەویان سۆشیالیستە.

---

[1] پێویستە سەرنج لەوە بدرێت نووسەر ئەم بەشەی لە کۆتاییەکانی سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا نووسیوە.

ڕووناك: كه هەردوو لا خاوەنی سەروەت‌و سامان بن‌و دەوڵەمەند بن، ئەبێ حەز چی بكات؟ من تێ ئەگەم، ئەمریكا بیر (فكره)ی دیموكراتییەت كاری تێ كردووە، كەچی سۆڤییەت بیری سۆشیالیست دڵی خرۆشاندوە. وانییە مامۆستا؟

مامۆستا ساڵح: ئافەرین، زۆر چاكی بۆ چوویت، بەڵێ، ئەمەریكا بیری دیموكراتییەتی بەچاكزانیوەو ئابووریی خۆی لەسەر ئەو بیرە هەڵ ئەسوڕێنێ، جا لێرەدا كامیان كاریگەرترە لە ژیاندا، بیر یان ئابووریی؟

ڕووناك: ئاشكرایە كە بیر كاریگەرترە. ئابووری پاشكۆ(تابع، ملحق)ی بیرە، ئەوەتا سۆڤییەت ئابوورییان خۆی بە دوای بیری سۆشیالیستا ڕائەكێشێ، كەچی ئابووری ئەمریكا خۆی بە دوای دیموكراتییەتا ڕائەكێشێ.

مامۆستا ساڵح: كەواتە جگە لە ماددە شتی تر هەیە وەك: گیان، بیر، هێزی ڕاكێشان، هێزی موگناتیسی.. هتد. لە كاتێكا شیوعییەت باوەڕی هەر بە ماددە هەیە. ها، ئەڵێی چی ئاواز خان؟

ئاواز: نازانم بڵێم چی!

سكاڵا: كەواتە نە بڕبڕەی پشتەو نە نهۆمی یەكەم.

## نەخێر، بانێكەو دوو هەوا

ئاواز: من پەیوەندیی‌و دەخڵم بەو كارانەوە نییە، گرنگ ئەوەیە ئافرەت لە سایەی ئەو ڕێبازە سۆشیالیستەدا ئەحەسێتەوە.

مامۆستا ساڵح: تۆ ئەگەر ڕاستت ئەوێ، ئافرەت لە گێژاوی ئەو یاساو ڕێبازەدا نەحەسانەوەی دەست ئەكەوێت، نە بەختیارییش بەدی ئەكات، چونكە ئەبێ ئافرەت هەموو ڕۆژێك وەك پیاو چەند سەعاتێك ئیش بكات، ئەی ئابووریی شیوعییەت لەسەر بناغەی بەرهەمهێنان بۆ بەرزترین ڕادە (الحد الأقصى) نەوەستاوە؟ دەی خۆ ئەو ڕادەیەش بەبێ كاركردنی ئافرەت نایەتە دی، كەواتە ئەبێ ئافرەت كار بكات، بیەوێ‌و نەیەوێ ئەبێ بچێتە كانەوە، بچێتە كارگەوە، بچێتە كێڵگەوە، ناچار ئەكرێت كار بكات.

ئەمەش هەروەك ماندووبوونی لەش (جسمی)ی تیایە، هەر بەو جۆرەش بێئابڕوویی‌و بێنرخكردنی بۆ ئافرەت تیایە. گوێ بگرە، تەنانەت "ماركس" خۆی دان بەم ڕاستییەدا ئەنێت:

"پیاوانی كان (منجم)ەكان بە شێوەیەكی گشتی كار بۆ ئافرەت بە خراپ ئەزانن، چونكە ئافرەت سووك ئەكات‌و لە نرخی دێنێتە خوارەوە، ژنان جلوبەرگی پیاوان ئەپۆشن، هەیانە جگەرە ئەكێشێ، پیسیی كاركردن لە هی كانەكان كەمتر نییە، گەلێ جار هەموو جۆرە كچێنییەكەیان لێ دائەماڵرێت، زۆربەی ئەو ئافرەتانە مێرددارن‌و ناتوانن كاروباری ماڵەوەیان جێبەجێ بكەن.."[1]

گوی بگرن لە "فردریك إنجلز" كە ڕاستەوخۆ ئەڵێت: "سەرئەنجامی ڕەوشتی (أخلاق)ی كاركردنی ئافرەت لە كارگەكانا زۆر زۆر سامناكە، كۆبوونەوەی هەردوو ڕەگەز –نێرو مێ– لە یەك شوێنی كارداو لە هەموو تەمەنێك، ئەوەی بە هۆی تێكەڵاویی حەتمی لەو كۆبونەوەیە پەیدا ئەبێت، دیسان بەسەریەكا كەوتنی ئەو كەسانەی كە هیچ پەروەردەیەكی فیكری‌و ڕەوشتیی نەكراون لە شوێنێكی تەسكا، ئەوە هەمووی، هەرگیز شوێنەوارێكی پاك لە پێشكەوتنی ڕەوشتی ئافرەتا بەجێناهێلێ..". دیسان ئەڵێ: "شایەتێك لە (لایشتر) ئەڵێت: حەز ئەكات كچەكانی سواڵ بكەن، نەك ببینێ بچن بۆ كارگە. كارگەكان كونی دۆزەخی ڕاستەقینەن، زۆربەی زۆری داوێنپیسەكانی شار، كارگەكان ئەو داوێنپیسییەیان بەسەرا هێنان. شایەتێكی تر لە (مانشتەر) بێ دوو دڵیی ئەڵێت: سێ لەسەر

[1] المرأة في التراث الأشتراكي ص٢٥ء ٢٨/ ترجمة جورج طرابيشي.

چواری ئەو ئافرەتە کرێکارە گەنجانەی کە تەمەنیان لە نێوان ١٤ تا ٢٠ساڵدایە بە تەئکید پەردەی کچێنیی خۆیانیان لە دەست داوە".

"مفوض کۆیل" ڕای خۆی دەرئەبڕێت، بەوەی ڕەوشتی ئافرەتە کرێکارەکانی کارگە زۆر کەمە لە تێکڕایی ناوەندی (المعدل المتوسط)ی ڕەوشتی چینی کرێکار.

دوکتۆر (هاوکنز) ئەڵێت: "بە ئاسانیی ناتوانین دەستمان بگاتە ئەو ژمارانەی پێویستە دەستمان بکەون لە بارەی ڕەوشتی سێکسییەوە، بەڵام ئەگەر تێبینییە تایبەتییەکانی خۆم ڕاست بن، ئەگەر قسەی ئەوانەی لەگەڵیانا دواوم ڕاست بێ لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو شایەتییانەی ئەگەنە لام، ئەو بیرەی کە پێویستە پێکی بهێنین لە ڕووی کاریگەریی ژیانی ناو کارگەوە بۆ سەر ڕەوشتی ئافرەتە گەنجەکان ئەبینین زۆر زۆر پشتشکێنە".

بە هەر حاڵ ئاشکرایە کە کارکردن لە کارگەدا، وەك هەموو کارێکی ترو زیاتر لە هەموو کارێکی تر ماف بە خاوەن کار ئەبەخشێت کە یەکەمین گوڵچن یان بەرهەمچن (القاطف الأول) بێت. خاوەنی کارگە دیسان لەم ڕوانگەوە خاوەنی لەشی ئافرەتە کرێکارەکەیەتی خاوەنی هەموو جۆرە جوانییەکیەتی..".[1]

ڕووناك: زۆر سەیرە، مارکس و إنجلز، کە بەمجۆرە لە کارکردنی ئافرەت ئەدوێن، ئەی چۆن ئافرەت ناچاری کار کردن ئەکەن؟

مامۆستا ساڵح: منیش وەك تۆ ئەو پرسیارە چەندان جار بە دڵما هاتووە، کەچی نەگەیشتومەتە وەڵامەکەی، بەڵام تۆ بڵێی پیاوانی لای ئەوان خەسا بن و مەترسیی شتی خراپیان لێ نەکرێت؟ تۆ بڵێی ئافرەتانی ئەوان حەز لە "پیاو" نەکەن؟ یاخۆ "مریشکی خەجێ پێی پاکە"؟

جوان: نەخێر، ئەوانە نییە، بانێکەو دوو هەوا، خاتو ئاواز دەخڵی بەو کارانەوە نییە، حەسانەوەی ئافرەتی لەلا مەبەستە.

## دژایەتیی (التناقض) یانی چی؟

سکاڵا: مامۆستا گیان، گوتت یەکێك لە پایەکانی شیوعییەت دژایەتیی (تناقض)ە، من مانای ئەو دژایەتییە نازانم، حەزئەکەم شتێکی لێ بزانم.

مامۆستا ساڵح: دژایەتیی لە "ئیساغوجی" دا بەم جۆرە تاریف کراوە: "جیاوازیی دوو کێشەیە لە نێوان ئیجاب و سەلبدا، بەجۆرێك لە خۆیا وا پێویست بکات کە یەکێك لەو دوو کێشەیە ڕاست و ئەویان هەڵە بێت. وەك: ئازاد نوسەرە، ئازاد نووسەر نییە".

بە داڕشتنێکی تر، کۆکردنەوی "ئا"و "نا" یاخۆ "بەڵێ"و "نەخێر" لەیەك بابەت یان دانراودا، لە یەك کاتدا. وەك ئەوە من بڵێم: سکاڵا خان ئێستا لەم شوێنەدا دانیشتووە. هەر لە هەمان کاتدا یەکێکی تر لەگەڵ قسەکەی مندا بڵێت: سکاڵا خان ئێستا لەم شوێنەدا ڕاوەستاوە.

پرشنگ: دەی مامۆستا، یەکێك لەو دوانە ڕاست ئەکات، هەر کامیان ڕاست بکات، ئەویتریان قسەکەی بە ناڕاست دەرئەچێت.

مامۆستا ساڵح: بەڵام مارکسییەت باوەڕی وایە کە هەردووکیان لەیەك کاتدا ڕاست ئەکەن و ئەڵێن، هەموو شتێك دژەکەی خۆی تیایە.

ئاواز: باوەڕ ناکەم مارکسییەت شتی وا بڵێت، چونکە ڕاست نییە.

---

[1] المرأة في التراث الأشتراكي، ص٢٨، ٣٩/ ترجمة جورج طرابيشي.

ماموٚستا ساڵح: منیش ئەزانم کە ڕاست نییە. بەڵام سەیرە کە ئەڵێیت باوەڕ ناکەم مارکسیەت شتی وەها بڵێت، دەی من تازەترین قوتابخانەی مارکسیەت، پێشکەوتووترین ڕارەوی، شۆڕشگێڕترین بەشی ئەهێنمەوە بۆت کە "ماو تسی تۆنغ"ە، گوێ بگرە کە لە (المادية الدياليكتيكية والمادية التأريخية)دا، لاپەڕە (١٢)دا ئەڵێت: "خاڵی دەستپێکردن لە دیالێکتیکدا بە پێچەوانەی میتافیزیکەوە ئەو تێڕوانینەیە کە لەسەر ئەمە وەستاوە: هەموو شتەکانی سروشتو ڕووداوەکانی دژایەتیی ناوخۆییان تێدایە، چونکە هەموویان لایەنێکی سەلبیی و لایەنێکی ئیجابییان تێدایە، چ لە کۆن، چ لە ئێستادا، هەموویان ڕەگەز (عناصر)یات تێدایە کە ئەوەڕێن – نامێنن – یان بەرەو ڕووداو ئەچن".

دیسانەوە لە (في الممارسة والتناقض) لاپەڕە (٤٧)دا ئەڵێت: "دژایەتیی لە هەموو شتێکدا هەیە (كلي)و بەرفراوان ـ بێسنور ـ (مطلق)ە، لە هەموو کردارێکی بەرەوپێشەوەچوونی شتەکاندا هەیەو هەموو کردارەکان لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئەگرێتەوە".[1]

جا نازانم باوەڕ ئەکەیت یان نە؛ ئاواز خان؟ ئەوەش تەنها بۆ نموونە بۆم هێنایەتەوە.

ئاواز: نازانم بڵێم چی؟ هەڵبەت ئەوان بە ڕاستی ئەزانن.

جوان: ئاواز پەیوەندیی و دەخڵی بەو قسانەوە نییە، ئەو تەنیا حەسانەوەی ئافرەتی لەلا مەبەستە!!

سەربەست: خۆزگە لەم ڕووەوە بە نموونە هێنانەوە باسەکەت ئەکرد.

ماموٚستا ساڵح: بۆ نموونە: کاک سەربەست، تۆ نێریت، دیارە دژی نێر، مێ (أنثى)یە، جا کە تۆ نێریت دژەکەی خۆت ـ کە مێیە ـ هەڵگرتووە، ئەو دژە هەمیشە وردە وردە لەگەورەبوونو دەرکەوتندایە، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان دژەکە ـ مێیەتیی ـ بەسەر لایەنەکەی تردا ـ کە نێرێتییە ـ سەر ئەکەوێت، جا بە پێی بۆچوونی ئەوان، تۆ لە نێرەوە ئەبیت بە مێ.

سەربەست: بەڵام قسەی وا نەژیریی و نە زانیاریی لایەنگیریی ناکەن، ئەوانە چۆن باوەڕیان بەو دژایەتییە هەیە؟ بە خوا سەیرین.

نەشمین: ئەی چۆن خەڵك دوای ئەو ڕێبازە لارە ئەکەوێت.

ماموٚستا ساڵح: ئەو پرسیارە لە خۆتان بکەن، ئەوەتا هەندێکتان دوای سۆشیالیستو هەندێکی ترتان دوای سەرمایەداریی کەوتوون، لە کاتێکدا کە سەرمایەداریی دوو ئەوەندەی سۆشیالیستی هەڵەو لارو خوارترە، منیش سەرم لە هەردوولاتان سوڕ ئەمێنێ نازانم بۆچ وەهان؟ تاکەی بیر ناکەنەوە؟!

ئەوەش کە زیاتر سەرسامم ئەکات ئەمەیە چۆن هەروا بەو سادەیی و ئاسانییە ئایینەکەی خۆتانتان – ئیسلام – لەبیر چۆوە؟ لە کاتێکا کە نایابترین بەرنامەیەو هەرگیز سەرزەویی بەرنامەو ڕێبازی وای بە خۆیەوە نەدیوەو نایشبینێ، بەرنامەو ڕێبازێکی خوایی کە ئاسمانو زەویی دنیاو قیامەت، ماددەو گیان، بەیەکەوە ئەبەستێو ناوی دژایەتیی لە نێوانیانا ئەسڕێتەوە.

سکاڵا: ماموٚستا، ئایینەکەمانمان لەبیر نەچۆوە، لەبیریان بردینەوە. ئەو بیرە لارو خوارانەیان فێرکردین نەك ئایینەکەمان.

[1] تەماشای (أضواء على المادية الدياليكتيكية)ی کەمال حسین بکە.

## ئافرەتو زەویی ئەبەستن بەیەکەوە

**ئاواز: بەڕاستیی من سەرم سوڕئەمێنێ کە تۆ باسی ئافرەت لە یاسای سۆشیالیستیدا وەها ئەکەیت، ئافرەت لە ڕوسیاو چیندا ئەمڕۆ نموونەی ئافرەتە، گەیشتۆتە چڵەپۆپە تۆ چۆن ئابەو جۆرە باسی ئەکەیت؟**

**مامۆستا ساڵح: سبحان الله، تۆ من تاوانبار ئەکەیت بەوەی کە درۆ هەڵئەبەستمو پڕوپاگەندە ئەکەم دژی سۆشیالیستو یاساکەی دژی ژیانی ئافرەت لە ژێر سێبەری ئەو ڕێبازەدا. بەڵام تۆ بەهەڵە تێگەیشتوویتو تێئەگەیت. دەبا گوێبگرین لە واتەی نوسەرانو دەقی قسەی سەرکردە زلەکانی شیوعییەت، ئەوسا ئەزانیت کە من کەمم گوتووەو زۆر زۆر ماوە.**

**نووسەر (جروان السابق) لە پەڕاوی "المرأة في القرن العشرين"دا، یەکەی (اللامنتمية) نوسیویەتی:**

**"کارل مارکس پیرۆزبایی لە خۆی کرد، مزگێنی خێریدا بە گوێی خەڵکا لەوکاتەوە کە ئاشووبەیەکی فراوانی کەشف کرد کە لە سەرەتای مێژوودا – گوایا– هەبووە، وای خەیاڵ کرد، کۆمەڵگەیەکی شیوعیی سەرەتایی (الشيوعيية البدائية) هەبووە، ئافرەت تیایا وەك زەویی بۆ گشتیی بووە – واتە (مشاع بووە) – ئیتر هەر لەو کاتەوە وای بۆ دەرکەوت، گیروگرفتی ئافرەت بەشێوەیەکی تەواو بەستراوە بە گیروگرفتی ئازادکردنی زەوییەوەو سەربەست کردنی چینی کرێکارەوە".**

**ئاواز: لەوانەیە ئەو گوتنەی جروان خۆی هەڵیبەستێ.**

**مامۆستا ساڵح: دەی گوێ بگرە لە "کارڵ مارکس" کە لە باسی "الشيوعية الفجة والمرأة"دا ، پەڕاوی "المرأة في التراث الإشتراكي" لە لاپەڕە (٩) وە دەستپێئەکات ئەڵێت: "شیوعیەتی کاڵو ئافرەت، ئەو بزووتنەوەیە کە لەسەر نەیاریی (معارضة)ی خاوەندێتیی تایبەتیی بە خاوەندێتیی تایبەتیی بۆ گشتیی وەستاوە، دەنگدانەوەکەی لە شکڵێکی ئاژەڵییدا دەبینرێ، کاتێ نەیاریی هاوسەریی بۆ بوون بە گشتیی (مشاع)ی ئافرەت ئەکا، کە ئافرەت ئەبێتە موڵکێکی کۆمەڵایەتی هاوبەش ..".**

**جوان: ها، خاتو ئاواز، ئەوەت بە دڵە؟ دەبڕۆ بیخوێنەرەوە.**

**مامۆستا ساڵح: وازی لێ بێن، ناهەقی ناگرم، هەرئەوەندەی لێ ئەزانێت، دیسان جروان السابق بەدوای ئەوەی پێشوودا نووسیوویەتی:**

**"ئەگەر جاروبار یەکێتیی سۆڤییەت لەبەردەم ئەو ڕێگەیەدا کە ئافرەت بەرەو شوێنە سەربازییەکان ئەبات، دوو دڵیی کردبێت، چین لە ڕووی ئەو گیروگرفتەوە نەیپرسیوەوتەوە. بەڵکو چین نیمچە چارەسەرو دواخستنو ئەو ئیمتیازانەی کەلەسەر یاسای هاوسەریی دامەزراون، ئەداتە دواوە. هاوسەریی چییە؟ دوو هاوسەر چۆن یەکەمین شانەی کۆمەڵایەتیی کە بە دوژمنی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەژمێرێت، پێکەوە ئەنێن؟**

**لە دروست کردنی کۆمەڵگەی سۆشیالیستدا ئافرەتو پیاو جیاوازییان نییە، ئەمەش یەکییەتی سۆڤییەت لە دوای هەنگاوە پێویستییەکانی پەرەوپێشچونی بەجێی هێنا. بەڵام چین بۆ ئەو مەبەستە ڕێگەی کورتتر کردەوە، ڕێگەی هەموو ئیجتیهادێکی لەبەردەم کۆنگرە شیوعییەتییەکاندا بەست –تا نەیەنە زمان –.**

**ژیانی تایبەتی، ژیانی خێزان کە لە دوو هاوسەرو منالانیان پێك بێت، ڕابواردنێکی خۆپەرستانەی کۆنەپەرستییەو لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستدا جێگەی نابێتەوە، ئایا ئەمە وا ئەگەیەنێت کە چین هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ ئارەزووی سێکسیدا بڕیوە؟ چۆن ئەتوانێ بەرەنگاریی سروشت بکات بۆ پێکهێنانی، یا بەلایەنی کەمەوە بۆ وێنەکێشانی ئادەمیزاد، یان کۆمەڵگەیەك کە ڕابواردنو "لهو" بخاتە پشتگوێ؟**

**لە یەکیەتی سۆڤیەتا ژنو مێرد لە دوو کرێکاری هاوبەش لەکاردا هیچی تر نین، گەرچی جۆرو جێگەی کارەکەش جیاواز بن. تامی هاوسەرێتیی بەستراوە بە کاتی بێکارییو کۆبوونەوەیان، بەڵام بێکاریی کوا؟ خۆ**

ئەگەر ژن و مێردی ڕووسی بەختەوەر بن بە کەمێ بێکاریی، ژن و مێردی چینی بە خۆماندووکردن و لە پشت پەردەوە نەبێت ئەو کەمەشیان هەر دەست ناکەوێت".

سەربەست: مەبەستیان لەبەستنی ئافرەت بەزەوییەوە چییە؟

مامۆستا ساڵح: ئەوان باوەڕیان بە خاوەندێتیی تایبەتیی نییەو ڕێگەی پێنادەن، لەبەرئەوە لەوێ هیچ کەس بەتەنیا خۆی بۆ خۆی خاوەنی هیچ پارچە زەوییەك نییە، بەڵکو هەرچی زەویی ئەو وڵاتە هەیە هەموو گەلی ئەو وڵاتە بەشدارە تیایا. ئەمەش پێی ئەوترێت "مشاعیة الأرض"و بە زەویی سەربەستکراو ناو ئەبرێت.

ئینجا بۆ ئەوەی ئافرەتیش وەك زەویی سەربەست بکرێت، نابێت هەر پیاوێك بۆ خۆی ژنێکی هەبێت و تەنیا بۆ خۆی بێت، ئیتر بەشی کەسی تری پێوە نەبێت، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوە ڕێگە بە خاوەندێتیی تایبەتی دراوە، کەواتە هەروەك زەویی موڵکی گشتیی و هی هەموو جووتیارێکە، ئەبێ بەو جۆرەش ژن هی گشتیی بێت، هەموو ئافرەتان بۆ هەموو "جوتیاران" بن، جا نازانم ئێستا تێگەیشتیت؟

سەربەست: چاك تێگەیشتم، ناسکە سەربەستیی، ئەو سەربەستییە هەر پیرۆزی خۆیان بێت، ئێمە مرۆڤایەتییمان ناگۆڕینەوە بەو سەربەستییە ئاژەڵییانەیان.

## مادییەت وایەو هەر وا دەرئەچێت

نەشمین: وا دیارە ئاواز خان پاڵی بە قەڵای کاوە داوە نەك قەڵای پۆڵا، ئەوەش ژیانی خانمی سۆشیالیزم، گوێت لێ بوو؟

مامۆستا ساڵح: ئەوسا لە چیندا، ئافرەت پەروەردەکەرەکەی پێی ئەگوت : "کاتێ ئەچیت بۆ گەشت، سەرت بەم لاو ئەولادا مەگێڕە، کاتێ قسەش ئەکەیت دانت دەرمەخە، کە دانیشتی قاچەکانت مەجوڵێنە، کە ڕاوەستای ، نەکەیت تەنوورەکەت بشەکێتەوە".

لە دوای شۆڕشی ماوتسی تۆنغ و سەرکەوتنی لە ساڵی ١٩٤٨ . ١٩٤٩دا، دەوڵەت بوو بە پەروەردەکەر، ئافرەتی نەخستە ناو چین (طبقة)ی سروشت ناسکەوە، کە ئەبێت سروت و باوی کچانی ڕەگەزی خۆی فێر ببێت، بەڵکو شۆڕگێڕێکە شان بە شانی پیاوی شۆڕشگێڕ، ئەندازیارێکە هاوشانی پیاوی ئەندازیار، هەروەك پیاو لێهاتووە، هەروەك پیاو لەبەرهەمهێنانی پیشەسازیی و کشتوکاڵیدا بەرگە ئەگرێت، ئیتر وا تەماشای ئەو ناکات کە ئافرەت ئارەزوومەندی ژێر دەستەیی ئەو بێت، بەڵکو هەردوولایان بەیەك چاو تەماشای واتە (التعالیم)ە کانی "ماو" ئەکەن.

ئا، زەویی سەربەست بوو ئافرەتیش سەربەست بوو، بەڵام ئەم ئافرەتە لە چینی "ماو"دا نەبووە بە موڵکی گشتیی، بەڵکو بە پێچەوانەی ڕاکەی مارکسەوە. ئایا ئەو سەربەستکردنە قۆناغی یەکەم ئەنوێنێ وەك هەندێ بۆی ئەچن، یاخۆ بێگەردیی "بوذیی ماوتسی" چاکترە لە "شیوع المرأة"ی لای مارکس؟

نەشمین: کورە بەخوا هیچ کامیان بۆ ئافرەت چاك نین.

پرشنگ: کورد واتەنی: "نەدارو نەپەردوو.."

مامۆستا ساڵح: کچ لە چینی کۆندا هەر بە منداڵیی ئامادە ئەکرا بۆ ژیانی هاوسەریی، بەبێ پچڕان باسی بەختیاریی هاوسەرێتیی ئەکراو، وا ئەخرایە بەرچاوی کە هاوسەریی ئەوپەڕی بەختەوەریی مرۆڤە چ نێر و چ مێ. ئەو کچەی ئەو بەختەوەرییەی چنگ نەکەوێت ئەوە چارەڕەشێکی بێ بەختەو "مانگ" ئەو بەختەوەرییەی لێ سەندووەتەوە. ئافرەتی چین بە سروشت هەوەس دۆستیشە. جا هەرکە بەستەرەکەی هەردوو قاچی . کە

پارێزگاری گچکەیی و نهێنی ئەو دوو قاچەی کردوە . کردەوە، و ئەوە "فەرموو"یە بۆ ئەو پیاوەی کە لەبەردەمیا بەستەرەکەی ئەکاتەوە، خۆی ئەدات بەدەستەوە بۆی، هەروەك خۆی پێشکەشی خواکەی ئەکات.

بەڵام ئافرەتی چینی (ماو) وا ئامۆژگاری کراوە، لە پێش تەمەنی (٢٥) ساڵیدا شوو نەکات، خۆ ئەگەر کردی، ئەوە جێی خۆیو مێردەکەی گوندە دوورەکانن، خێزانی بەختەوەریش ئەو خێزانەیە زیاتر لە دوو منداڵی نەبێت، هاوسەریی نائاییینیش (المدني) کە لە هەموو باوو نەریتێك دوورە، جێگەی هاوسەریی پیرۆزی ئەوسای چینی گرتۆتەوە، واتە هیچی تێ ناچێت، هەر کە تینووت بوو ئاو بخۆرەوەو لە هەموو لایەکیشەوە ئاو زۆرو زەبەندەیە. بەڵام بەو مەرجەی ئاو خواردنەوەکە نەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بەرهەم، نەبێتە هۆی ڕەنجاندنی بتە زلەکانی (أنتاج)!! هەروەك ئادەمیزاد تەنیا بۆ بەرهەم زیادکردن بەدیهێنرابێت!!

ڕووناك: ئەی هاوار، سۆشیالیستەکان، سەرمایەدارەکان، بەوە تاوانبار ئەکەن کە ئافرەت ئەڕەتێنن و ئەیڕووتێننەوە، کەچی خۆیان لەوان زیاتر ئافرەت ئەبەن بە ناخی زەوییدا.

مامۆستا ساڵح: بەڵێ، وایە کە گوتت، کچی بەڕێزم، ماددییەت، لەهەر کوێ و هەر کاتێك و لەلایەن هەر لایەنێکەوە بێت هەر ماددییەتە، چونکە مادییەت خۆی بە سروشت وایە، سەرمایەداریی و سۆشیالیستییەت هەردووکیان دوولایەنی ماددیەتن، بەڵام تەنیا لە شێوازدا جیان، لە یەکەمیاندا تاك (فرد) ئافرەتی بەسەرزمان ئەڕەتێنێ و ئەڕوتێنێتەوە، لە دووەمیاندا کۆمەڵ، دۆڕاویش بەزۆریی هەر ئافرەتە، بەڵام ئاخ بۆ ئەو کاتەی کە ئافرەت بێدار ئەبێتەوەو قازانج و زەرەر لە یەك جیائەکاتەوە.

جوان: وەك پرشنگ گوتی : "نەدارو نەپەردوو..".

مامۆستا ساڵح: گلەیی کردن لە ماددییەت، لە کاتێکیشا هەڵیبژێرێت بۆ خۆت و بیکەیت بە بەرنامەی ژیانت، کارێکی شێتانەیە. چونکە ماددییەت هەر ماددییەتەو لە سروشتی خۆی ناچێتە دەرێ. تەنیا ماددە ئەبینێ و هەر هەڵپەی ماددەش ئەکات. ئەی قابیلە ماددەپەرست نیوەی خۆی بە هەمووی واتایەکی (نیوەی خۆی) تەرخان بکات بۆ ماددەو نیوەکەی تری بۆ گیان؟ ئەی خۆی مەفهومی ژیانی خالقی ژیانەوە وەرنەگرتووە تا بە پێی "وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا..".[1] بجووڵێتەوە. یان خۆ یاساکانی لە مامۆستای مرۆڤایەتیی (محمد) (ﷺ) وەرنەگرتووە تا لە ژێر ڕۆشنایی خۆری "إعمل لدنياك كأنك تعيش أبدا، وإعمل لآخرتك كأنك تموت غدا"دا دەست بۆ ژیان ببات. ماددییەت وایەو هەر وا دەرئەچێت کە دەرچووە.

## بەرهەم ئەبێت هۆیەك بێت بۆ گوزەران

مامۆستا ساڵح: تۆ بڵێیت ئافرەتی چین بە یەکجاریی لە بیری چووبێتەوە کە نەنکی "دایکێکی ناسکی نیگابانیکراو بوو وەك مرواری، لەو ماڵەدا کە هەڵیبژاردبوو بۆ خۆی"؟ بەڵام ئەوەندە کاتی بێ ئیشیی نییە تا بیر لە ڕابردوو بکاتەوە، بیر لەوە بکاتەوە کە کۆمەڵگەی ئەوسا چۆن ژیاوە، چونکە شۆڕش هەمووان و هەموو لایەنێکی گرتۆتەوە، خۆپەرستیی تاکەکان کە سەرسەختترین دوژمنی ژیانی کۆمەڵن گشتیان بەسەریەکدا هاڕی.

لەمەودوا بەرامبەر پیاو بێدەنگ نابێت، ئەوو پیاو دوو هێزی بەرهەمهێنەرن، سرووده فۆلکلۆرییەکەی جارانی چین "تفەنگ بۆ پیاوو قوتووی بۆیە بۆ ئافرەت" ئێستا ناڵێت. مناڵیشی ناوێت!! چونکە ئێستا چین پێویستی بە بارقورسکردنی خۆی نییە، خێزان و ماڵی بەختەوەر ئەوەیە منداڵی تێدا نەبێت، بە پێچەوانەی چینییە کۆنەکانەوە کە گۆرانییان پیادا ئەوت.

---

[1] القصص /٧٧ .

خۆشەویستی بۆچی؟ ئەوسا سەماکەر (راقصة)یەکی جوانکیلە ئەو خۆشەیستییەی پێویست بوو کە خۆی بەرەو باوەشی نێر ئەخلاند. وانەبێت تەنیا "راهبەی بوذی" توانای مراندنی دەروون و زاڵبوونی بەسەر ئارەزووی سێکسی خۆیدا هەبێت، بەڵکو "راهبەی ماوتسی"یش کە باوەڕی بە "شۆڕش" نەك "بوذا" هەیە، کە باوەڕی بە "ماوتسی و بەرهەم" هەیە، نەك بە خۆرو مانگ و ئاسمان، ئەو توانایەی هەیە.

هەڵکەوت: مامۆستا گیان، بەڵام ئەبێت بەرهەم خزمەتی ئادەمیزاد بکات، نەك ئەم ئەو بپەرستێت، قەید ناکات بەرهەم پێویستە بەڵام ئەبێت ئادەمیزاد لە پێناوی ئەو بەرهەمەدا خۆی نەتوێنێتەوە، خۆی لە بیر نەچێتەوە، بەرهەم هۆیەکە بۆ گوزەران و خۆشگوزەرانی نابێ بکرێت بە مەبەست و ئادەمیزاد بکرێت بە هۆ بۆ زیادکردنی بەرهەم.

مامۆستا ساڵح: ئەوەی گوتت، هەموی ڕاستە، هەر بۆیە خوای گەورە . وەك لە ئایەتی ژمارە (٧٧)ی (القصص)دا کە ناومان برد . داوامان لێئەکات کە بەشی خۆمان لە دنیادا فەرامۆش نەکەین، ئەویش دوای غەمخواردنی قیامەتمان. پێغەمبەریش (ﷺ) هەوڵ و تێکۆشانمان ئەکات بەدوو بەشی یەکسانەوە، نیوەی بۆ ئەم دونیاو نیوەشی بۆ ئەو دنیا.

سکالا: ئایا ژیریی پەسەندی ئەکات کە ئادەمیزاد دەست لە خۆشەویستی هەڵبگرێت لە پێناوی زیادکردنی بەرهەمدا؟ تو خوا ئادەمیزاد بە بێ خۆشەویستی ئادەمیزادە یان دڕندەیەکی کێویی خوێنمژ؟ دوای ئەوە، هەموو عەقڵێکی پاك ئەوەی لا ڕۆشنە کە هیچ شتێك لە ماڵدا بەقەدەر بزەی منداڵ بەتام و شیرینتر نییە. ئیتر چۆن ئەوان بەختەوەریی ماڵ لە بێ منداڵییدا بەدی ئەکەن؟ پح لەو بیرو بۆچوونە.

مامۆستا ساڵح: ڕۆڵە گیان وەڵامی پرسیارەکانت ئەوەندە ئاشکران، فطرە خۆی یەکسەر دەریان ئەبڕێت، پێویستییان بە باسی فەلسەفیی و قووڵ نییە.

بەڵێ، لە وڵاتی چیندا تەمەنی هاوسەریی بەرزکراوتەوە بۆ (٢٥) ساڵ ئەوپەڕی چاودێری کردنیشی لە دەوڵەت و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانەوە بۆ ڕوونەدانی پەیوەندیی سێکسی لە کایەدایە – لەبەر خاتری چاوی ڕەشی بەرهەم –و پەرەپێدانی ئابووری، بەڵام ئایا شۆڕش هەرچەندە هێزو دەسەڵاتی بەهێزبێ، ئەتوانێت بەرەیەکی تەواو بخولقێنێ کە هیچ کەسێك لەوی تر جیاواز نەبێت؟ تەنانەت ئەگەر ئەو هەموو کەسانە لە چەند قاڵبێکی ئالیی (آلي) قەبارە دیاریکراویشدا دابڕێژرێن، ئایا نامۆ (شاذ)یان لێدەرناچێ و هەموو وەك یەك دەرئەچن، ئایا جوانیی و زیرەکیی و هێزی لەشی و هەست و نەست و بەهرەو .. هتدیان وەك یەك دەرئەچێت؟؟

ڕووناك: ئەوەی کە بەلای منەوە زۆر سەیرو نامۆیە، ئەوەیە کە یاساو ڕێبازی سۆشیالیست بێگەردییی و ئابڕووپەروەری ئەگەر بە ناوی ئایینەوە بن، بە دواکەوتوویی و کۆنەپەرستی دائەنێن، کەچی بێگەردیی و ئابڕووپەروەری ئەگەر بۆ خزمەتی بەرهەم پەیڕەوی بکرێن، بە پێشکەوتن و کارچاکیی باسی ئەکەن، لە کاتێکا پێچەوانەکەیان ڕاستە.

مامۆستا ساڵح: جەماوەری گەنجان – بە نێرو مێیانەوە – وەها تێگەیەنراون کە "خۆشەویستیی" لە دوای هاتنە دی پێویستییە ئابوورییەکان ئەبێت بە هەڵم، بەڵکو خۆی لە خۆیا لە بواری بەرهەمدا شتێکی بێسوودە، چونکە وزەی بەرهەم لاواز ئەکات، ئەیشلەژێنێ، مەبادیئەکانی شۆڕش ئەژاکێنێ.

ئادەمیزادی ژێر ئەم کارە ناهەموارەی نابێ بەلاوە سەیر بێت، چونکە هەرکە ئادەمیزاد لە شاڕێگە لایداو کەوتە دوای تووڵەڕێ، بێگومان سەدان چۆرتمی ملشکێن هەرئەبێ بدات، ئەوانەش ژمارەیەکن لەو چۆرتمانە.

## ئێوه له جۆری سێیه‌من

ڕووناك: مامۆستا، داوای لێبوردنت لێئه‌كه‌م، له‌وانه‌یه له سنوور ده‌رچووبین، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا دووچاری سه‌ریه‌شه‌مان كردبێت.

مامۆستا ساڵح: خوا هیدایه‌تتان بدات، من له‌لایه‌ن خۆمه‌وه هه‌ست به‌هیچ سه‌ریه‌شه‌و ته‌نگ پێهه‌ڵچنین‌و ماندوبوون‌و وه‌رسییه‌ك ناكه‌م. به‌ڵكو به پێچه‌وانه‌وه هه‌ست به شادمانیی‌و كامه‌رانیی ئه‌كه‌م. خۆم به به‌خته‌وه‌ر ئه‌زانم، له‌گه‌ڵ چه‌ند كه‌سێكی وه‌ك ئێوه‌دا كۆبوومه‌ته‌وه‌و به‌و وتوێژه‌ی ئه‌كرێت له نێوانماندا ئه‌ركی سه‌رشانی خۆم به‌جێئه‌هێنم، بێگومان ئه‌مه‌ش هه‌لێكی زێڕینه‌و خوای گه‌وره ڕه‌خساندوویه‌تی.

ئه‌وه‌ش كه‌زیاتر شادمانم ئه‌كات ئه‌وه‌یه ڕاسته‌وڕوویی (صراحه)تان تێدا به‌دی ئه‌كه‌م، بیروڕاتان به‌بێ پێچ‌و په‌نا ده‌رئه‌بڕن، ئه‌وه‌ش سیفه‌تێكی مه‌ردانه‌یه، له‌وه‌ش زیاتر گوێ له قسه‌ی به‌رامبه‌ره‌كه‌تان ڕائه‌گرن، ئه‌مه‌ش تایبه‌تمه‌ندییه‌كی جوانه.

ئه‌مجا من كاتێ سه‌رنج له ئێوه ئه‌ده‌م، قسه‌یه‌كی (خلیل بن أحمد)م دێته‌وه یاد -. كه به‌لامه‌وه زۆر جوانه - ئه‌ڵێت: "مرۆڤ چوار جۆره: كه‌سێك ئه‌زانێت‌و ئه‌شزانێت كه ئه‌زانێت، لێی بپرسن . پرسیاری لێ بكه‌ن . . كه‌سێك ئه‌زانێت به‌ڵام نازانێت كه ئه‌زانێت ئه‌و جۆره كه‌سه بیری بخه‌نه‌وه، كه‌سێك نازانێت به‌ڵام ئه‌زانێت كه نازانێت، ئه‌و كه‌سه حه‌ز له ڕێنمونی ئه‌كات، فێری بكه‌ن. كه‌سێك نازانێت، به‌ڵام ناشزانێت كه نازانێت، ئه‌وه نه‌زان‌و نه‌فامه دوور بكه‌ونه‌وه لێی". [1]

جوان: وی، مامۆستا گیان، ئه‌ترسم ئێمه له‌م جۆره په‌ته‌ڕییه‌یانه بین!

مامۆستا ساڵح: نه‌ء، سوپاس بۆ خوا ئێوه له جۆری چواره‌مین نین، به‌ڵكو له جۆری سێیه‌من، حه‌زتان له ڕێنمونی هه‌یه، حه‌زتان له زانیین بووه به‌ڵام به هه‌ڵه فێركراون، حه‌زتان له زانینه‌و خوا یاربێت فێر ئه‌بن‌و ئه‌گه‌ن به ڕاستیی‌و حه‌قیقه‌ت هه‌ر ئه‌دۆزنه‌وه.

من له ئێوه به گومان نیم، هیوام پێتان ئێجگار زۆوره، چونكه له‌سه‌ر قسه ئه‌ڕۆن، من له‌و جۆره كه‌سانه ئه‌ترسم‌و بێهیوام، قسه‌یان بۆ ئه‌كه‌یت سه‌ر دائه‌خه‌ن‌و بێده‌نگ ئه‌بن.

## منیش به‌زه‌ییم به تۆدا دێته‌وه

ئاواز: مامۆستا كه‌سایه‌تی خۆت‌و هه‌ڵسوكه‌وتی ئه‌ندامانی خێزانه‌كه‌ت، به ته‌واویی سه‌رسامیان كردووم، خوانه‌خاسه له‌لارگۆو ناهه‌ق بێژ ناكه‌ن، به‌ڵام سه‌باره‌ت به ژیانی ئافره‌ت له یاساو ڕێبازی سۆشیالیستدا، نازانم چۆن ئه‌و جۆره قسانه ئه‌كه‌یت، به تایبه‌تی ده‌رباره‌ی خێزان له سۆشیالیستدا نازانم ڕاست، ن، ن، ڕاست...

مامۆستا ساڵح: كچی شیرینم، منیش به‌زه‌ییم به كه‌سێكی گه‌نجی خوێنده‌واری وه‌ك تۆدا دێته‌وه كه هه‌ر له سه‌ره‌تای به‌هاری ته‌مه‌نییه‌وه به گومڕایی بچێته هه‌وارگه‌ی ژیانه‌وه، له هه‌مان كاتدا سه‌رم سوڕئه‌مێنێ كه چۆن هه‌ر به ساده‌یی توانیوته‌و میشك‌و دڵت ڕێیان پێداویت، باوه‌ڕ به‌و ده‌ملووسانه بكه‌یت كه له ڕێ لایانداویت، چۆن باوه‌ڕت كردووه به‌و درۆیانه‌ی كه له‌گه‌ڵتا كراوه؟ هه‌ق نه‌بوو ئه‌وه‌نده ساویلكه‌و ساده بوویتایه.

ئه‌وه‌ی سه‌باره‌ت به ئافره‌ت و خێزان له ماركسیزمدا بۆم باسكردن، قسه‌ی من نییه، واقیعێكه ژیان گه‌واهیی له‌سه‌ر ئه‌دات، نووسه‌رانی شاره‌زا نوسیوویانه، گوێ بگره له (جروان السابق) كه ئه‌ڵێت:

[1] روائع الإسلامية/ إبراهيم النعمة. ص٧٩، ص١٩٨٣.

".. چین ناچار بوو، له ژێر پاڵەپەستۆی شۆڕشگێڕێتیی سەرچڵیی (متطرف)دا وه له ژێر پاڵەپەستۆی مەترسیی زۆربوونی دانیشتواندا، که هەنگاوی گاریگەر هەڵبگرێت، ئەمجا چین لەو دەلاقەوه ئەڕوانێته مەسەلەی هاوسەریی و ئەمیش ـ هاوسەریی به دوژمنی شۆڕش ئەژمێریت.

خێزانی پەشۆکاو به لەزەتچەشتنی خۆیەوه، له بانگ کردن بۆ شۆڕشگێڕیی پاشگەزئەبێتەوەو ئاگای بەسەر تەعلیماتەکانی ماوتسی تۆنغو بەجێهێنانی ئەو تەعلیماتەوه نامێنێ. زۆربوونی دانیشتوانیش به خێرایی چین بەرەو کارەساتێکی گەورە ئەبات، ئەگەر بێتو لغاوی بەر بدەیت، جا لەوانەیە لەسەرەتاوه چینییەکان بەرهەڵستی ئەم کارەیان نەکردبێت کەشایانی باس کردن بێت، هەرچەندە جاروبار بەرهەڵستی له خۆکوشتنەوه (إنتحار)دا خۆی ئەنوێنێ، کەچی گەنجو لاوان ئەوه به بنەمایەکی پێویست ئەزانن بۆ بەردەوامیی شۆڕشو گەیشتنی به مەبەستەکانی، ئەو خۆ بەڕاهبکەرانه ئارەزووی سێکسیی به گڵاو ئەزانن، شایانی ئەوەنییه شۆرشگێڕێ که ئەیەوێ کۆمەڵگەیەکی چاکتر بێته کایەوه، خۆی بتلێنێ بەو شته گڵاوەوه".[1]

گەنجێك – چ نێرو چی مێ – وا پەروەردە کرابێت که ئارەزووی سێکسیی بەگڵاو بزانێت، ئەبێ چۆن تەماشای خێزان بکات؟ ئارەزووی سێکسیی لای گەنج زۆر بەهێزه، ئارەزوویەکی سروشتییه وەك ئەزانن، بێزاندنی خێزان له مارکسیزمدا دیاردەیەکی زۆر ئاشکرایه، شاردنەوەی تێدا نیه. مارکس خۆی به موڵکایەتیی تایبەتی دائەنێتو به کۆسپێك له ڕێگەی "مشاعية النساء"ی ئەژمێرێت.

گوێ بگرن که ئەڵێت: "ئافرەتی پیاوی بورجوازیی لای مێردەکەی تەنیا ئامێرێکی بەرهەمهێنانه".[2]

من نامەوێ دیفاع له بۆرجوازییەت بکەم، بەڵام ئەوەندە هەیه که مارکسیزم ئەیەوێ بۆرجوازییەت بڕوخێنێ، واته ڕووخانی بۆرجوازییەت یانی ڕوخانی خێزانیش. واته به له ناوچوونی یاسای سەرمایەداریی خێزانیش لەناو ئەچێت. ئەی مارکس خێزان به دەزگایەکی بورجوازییو سەرمایەداریی دانانێت؟ ئەوەتا خۆی به دەمی خۆی خێزان به هێلانەی چەردەکاری دائەنێت، لای وایه دایكو باوك منداڵان ئەڕوتێننەوه، ئەڵێت: "ئایا سەرزەنشتمان ئەکەن لەسەر ئەوەی که ئەمانەوێت ئیستغلال کردنی منداڵان لەلایەن دایكو باوکیانەوه بدەینەوه دواوه؟ ئەگەر ئەو کاره به تاوانکاریی بژمێرێت، ئێمه دان بەو تاوانکارییەدا ئەنێین".[3]

پرشنگ: ئەو مارکسیزمانه سەیرن، هەرچی به ناشیرینو خوارو خێچ بزانن ناوی بۆرجوازییەتی پێوه ئەلکێنن، کەوابێ بۆرجوازییەت یاسای خێزانداریی تیایه، مارکسیزم تف له ناوچاوی خێزانداریی ئەکات، هەوڵی نەهێشتنی ئەدات، ئەمەش هەرگیز به کارێکی چاك دانانرێت، سا مەگەر لای ئەوان بەچاك دابنرێت.

مامۆستا ساڵح: له ڕاستیدا ئەو جۆره قسانەیان، دەربارەی بەستنی خێزان بەبۆرجوازییەتەوه لەژێربێژییەوه دوورن، ئەیانەوێت بەوناوەوه خێزان به دەزگایەکی خراپی زەرەرمەند بخەنه پێش چاوی خەڵك، تا لەو ڕێگەیەوه بەهانەیان بۆ بسازێتو قەڵاچۆی خێزانو خێزانداریی بکەن. ئەی نابێ بزانن که خێزان یەکەمین شانەی هەموو کۆمەڵگەیەك بووەو هەر وایش ئەبێت؟ ئەی نازانن خێزانداریی دیاردەو پێویستییەکی دێرینی ئادەمیزاد بووه؟ کاتێ که خێزان دروست بووه، ئایا هیچ کەسێك ناوی بۆرجوازییەتو سۆشیالیزمی بیستبوو؟

ئێستا ـ لەوانەیه ـ که شیوعییەتی چین، ڕوسیا به ئیمپریالیزمو داگیرکەرو کۆنەپەرست ئەژمێرێت. واته خۆی ئیمپریالیزمو داگیرکەر نییه، خۆی "تازەپەرست"ه، شیوعییەتی پاڵفتەکراو خۆیەتی نەك ڕوسیا.

---

1 المرأة في القرن العشرين، جروان السابق / ص١٦٤.

2 المرأة في التراث الإشتراكي/ ترجمة جورج طرابيشي.

3 المرأة في التراث الإشتراكي/ ترجمة جورج طرابيشي.

کەچی ڕێبازەکەی ماوتسی تۆنغ قەت بە هاندەر لە ڕوی خێزانەوە خۆی نەنوادووەو خۆی نانوێنێ، تەمەنی هاوسەریی دواخست، هاوسەریی ئەمڕۆ لە چینا ئەبێت موافەقەتی ڕێکخراوەی "حیزبی" هەریەکە لەو دوو هاوسەرەی لەگەڵدا بێت، دەوڵەت هەنگاوی توندی ناوە بەرەو سەرکەوتن بەسەر ئارەزووی سێکیدا، ئەو گەنجەی – نێرو مێ – حەساسییەتی سێکسی ئاشکرای لێ بەدی بکرێت، ئەوە خۆی ئەخاتە بەردەمی کاری ناڕەحەتی دەستیی، کارێکی سەختیی وا کە زاڵ ببێت بەسەر سێوس (الشبح)ی سێکسیدا، خۆ ئەگەر کچەکە دان نەکەنێو لە "مەجنوون"ەکەی دەست هەڵ نەگرێت، سەرلەنوێ ئەبێ ملکەچ بکات بۆ دەورات نەك دەورەی (إعادة التربية)!! جا کاتێ لە دەورەکان گەڕایەوە ئیتر ئارەزووی شووکردنو مەیلی هاوسەریی چی؟ قایل ئەکرێت بە خەیاڵیش ناوی نەبات.

سەرکردەکانی چین ئەو کارەیان ناوناوە "بێگەردیی"! ئەو بێگەردییە لە کۆنگرە کۆمەڵایەتییەکاندا زۆر بە شانو باڵیا گوتراوە، لە لایەن سەندیکاکانەوە بە "هەل هەلە"وە پێشوازی لێکرا، لە لایەن چاودێرە "متطوع"کانەوە پێویستکراو سەپێنراو چاودێریی سەرپێچیکەران بە بەردەوامیی ئەکەن، خەڵك سوێند ئەدرێتو هەموو شتێك ئەکرێت بە قوربانیی ژیانی هاوبەش لە چوارچێوەی کۆمەڵدا. وایان لە نێرو مێ کردووە کە نەیپەرژێت بەسەر خۆیەوەو بۆی نەکرێت گوێ لە ناخی، خۆی لە دڵی خۆی بگرێت، "ئەگەر دڵی هەبێت".

من بەزەییم بە تۆدا دێتەوە ئاواز خان، چونکە تۆ بەرەو ڕێبازێك ڕاکێشراویت کە کەمێکیم لە نەنگییەکانی بۆ باس کردوویتو خۆت هیچت لەو نەنگیانە نەبیستووەو پێت نەگوێراون، حەزئەکەم بیانزانی، لەگەڵ ئەوەشدا هیوادارم بیرکەیتەوە، شت هەڵسەنگێنی، تاوتوێی بکەیت، بەگۆترە شت نەخەیتە دڵو مێشکتەوە، بیر لەو ڕێبازە، لە ڕێبازی سەرمایەداریی بکەیتەوە، ئەمجا لەگەڵ ئیسلاما بەراوردیان بکە، بە ویستی خوا ئەگەیت بە ئەنجامو شاڕێی ژیان ئەدۆزیتەوە.

## کارکردن بۆ ژیان نەك ژیان بۆ کارکردن

ئاواز: بەڵام ئافرەت لە سایەی ڕێبازی سۆشیالیستا تێرەو برسیی نابێت، یەکسانیی لەگەڵ پیاودا بەدەست هێناوە، لە هەموو بوارێکی کاردا شان بە شانی پیاو کار ئەکات، ئەی ئەوە کەمە؟

مامۆستا سالح: ڕاستە، لە ڕێبازی سۆشیالیستا تاك (فرد) برسیی نابێتو خواردەمەنیی مسۆگەرە، بەڵام چی لە سکی تێر ئەکەیت لە کاتێکا کە سەربەرستییت لێ زەوت بکرێت؟ سەربەستیی لە سۆشیالیستیدا تەنها بۆ ئەندامانی ئەو حزبەیە، ئەویش لە سنووری ئەیدۆلۆجییەتی ئەو حیزبەدا؟ دابەستەش هەمیشە تێرە، قەساب ناهێڵی برسیی ببێ، ئایا ڕاستە قەسابەکە منەت بکات بەسەر ئەو دابەستەیەدا؟ تۆ ئەتەوێ سك تێریی بە هەموو شتێك بزانیت.

لە ڕێبازی سۆشیالیستیدا تاك هیچ شتێکی لە شێوەی خاوەندێتیی تایبەتییدا نییە، خاوەنی بەرهەمی کارکردنەکەی خۆیشی نییە، ئەو هەر کارکردنو بەرهەمهێنانی لەسەرە، ئەی نابێت تێر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانێ کار بکات؟ هێشتا (نانە ئەشقەم)یش بە چاك ئەژمێرێ.

فەلسەفەی ژیان لەوەدا نییە بڵێین: "بابژین بۆ ئەوەی بخۆین". بەڵکو لەوەدایە: "ئەخۆین بۆ ئەوەی بژین". هەر بەو جۆرەش، ئەبێ کاربکەینو بەرهەم پێك بێنین بۆ ئەوەی پێی بژین. نەك بژین بۆ ئەوەی کار بکەین و بەرهەم پێك بێنین. لە سۆشیالیستیدا مەبەست خراوەتە جێی هۆو هۆیش خراوتە جێی مەبەست، کارکردن ئەبێت بۆ ژیان بێت، نەك ژیان بۆ کارکردن بێتو بەس.

کارکردنی پاكو ڕەوا لە ئیسلامدا بەرزترین پلەی دراوەتێ لە لایەن خواو پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، بەڵام ئەو کارکردنە وەك هی سۆشیالیستیو سەرمایەداریی تەنیا چاوی نەبڕیوەتە سكو ناوگەڵ تێرکردن، بە یەکسانی ئاوڕ لە ماددەو گیان لە زەوییو ئاسمان، لە دنیاو قیامەت ئەداتەوە، ڕێکڕەویی (تنسیق) لە نێوان ئەو هەموو لایەنانەدا بەشێوەیەکی زۆر ورد ئەکات.

بەڵێ ڕاستە لە زۆر بوارەکانی کارکردندا شان بەشانی پیاو ئافرەت کار ئەکات، لە پێناوی زیادکردنی بەرهەمدا ڕەنج ئەدات، خۆی ماندوو ئەکات، ئارەق ئەڕێژێ، هەروەك پیاو (بەدلەی) کارکردن لەبەر ئەکات، لە دواوە ئافرەتو پیاو لەیەك جیاناکرێنەوە، لە پێشەوە مەگەر بە دەرپەڕینی سنگدا لێکتر جیابکرێنەوە، چونکە ئافرەتی (بەرهەمهێنەر) قژ داپاچڕاوە!

لە (المرأة في القرن العشرين)دا "جروان السابق" نووسیوویەتی: "ئای چین چەندێ قژی خانمان ئەنێرێتە دەرەوە، ئەو قژەی تا دوێنێ هێمای مێیەتی ئافرەتو موڵکی مێردی ئەو خانمە بوو، ئەمڕۆ بێکەڵکە جگە لە "بڕین" شایانی هیچی تر نییە. ئایا ماوتسی ڕای وایە کە ئەم بەرەیەی چین. لە ئافرەتان. ئافرەتانی دواڕۆژ نیشان ئەدات؟ پیاوو ئافرەت هاوشانن لە هەنگاوناندا بەرەو (بۆمبای هایدرۆجینیو بەدلەی کەتانو پرۆتیناتی زیندوو) ئایا ئا لەم سنوورەدا ئەمێنێتەوە.

ڕووناك: بەڵام ئەو بارە دژ بە بەرژەوەندیی ئافرەتە، ئەو یەکسانییە قازانجی پیاوە نەك ئافرەت، ئەرکی سەرشانی پیاو چەندێ سووك بووە، ئەوەندە هی سەرشانی ئافرەت قورس بووە، ئافرەت دۆڕاوە نەك براوە، بەرەو بەدبەختیی براوە نەك بەختیاریی.

ئەبێ ئەوەش بزانین، ئافرەت کاتێ ئافرەتە لە تایبەتمەندییەکانی دانەماڵرێت، پیاویش هەر بەو جۆرە، جا هەرکام لەم دووانە سیفاتو تایبەتمەندیی خۆی گوم کرد، بێگومان ئەوە بە دۆڕاو ئەژمێرێت. گوڵەباخ بۆیە گوڵەباخە کە گوڵەباخ بێت، کە کرا بە هێرۆ کەی ڕاستە پێی بگوترێت گوڵەباخ؟ ئایا ئافرت خۆی بە سروشت ناتەواوو خراپە تا شێوەو کاری پیاو وەرنەگرێت تەواو چاك نابێت؟ ئایا ساردیکارەبا نەبێت بە گەرم "بوون"ی بۆ دانانرێت؟

مامۆستا ساڵح: سەرنجەکانت زۆر وردو بەجێن، بەڵام لەو ڕێبازەدا هەمووی ئەخرێتە ژێر پێڵاوی قوڕپینی "بەرهەم"ەوە، پەیڕەوانی ئەو یاسایە ئەوە فەرامۆش ئەکەن کە ئافرەت خۆی بەرزترین کارگەیە، بەرهەمەکەی مرۆڤە نەك کەلوپەل. تۆ بڵێیت بەرهەمی شتومەك لە مرۆڤ بە نرخ تر بژمێرێت لە سۆشیالیستیو سەرمایەدارییدا؟ تۆ بڵێیت دوورخستنەوەی ئافرەت لە بەرهەم هێنانی "ئادەمیزاد" هاوسەنگیی بەرهەمهێنانی شتومەکی ناو کارگە نەکات؟ یاخۆ ژێربێژییو ویژدانی بەرهەمپەرستیی شێواونو لە کارکەوتوون؟

## خەیاڵێکی خاوی دوور لە واقیعە

ئاواز: بەڵام با ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ڕێبازی شیوعییەت، هەر هیچ نەبێت کۆمەڵێ لە دەردو بەڵای نەخۆشیی سەرمایەداریی لە جەستەی مرۆڤایەتیی دوورخستەوە. ئەی ئەوە کارێکی مەزن نییە؟

مامۆستا ساڵح: ئەو چارەسەرییەی شیوعییەت هێنای بۆ لەناوبردنی دەردو بەڵای سەرمایەداریی، هەورگ (مضاعفات)ی زۆری بە دواوە بوو، نرخەکەی ئێجگار گران بوو. ڕێگەی چارەسەرییەکە بە لای دەروونەوە زۆر ناڕەحەتە، گرتنی ئەو ڕێگایە زۆر زەحمەتە.

ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ئەو چارەسەرە ناتەواوو پڕ لە کەموکورتییەو ناتوانێ بەسەر هەموو فەسادێکی کۆمەڵایەتییدا سەربکەوێت، چونکە دەردەکەی بەڕاستییو چاکیی دەستنیشان نەکردووە، ئەو

خاڵەی کە ئەم هەموو فسادەی لێوە دەرپەڕیوەو، نەیتوانیوە بە وردیی دیاریی و دەسنیشانی بکات. بگرە ئەو خاڵە لە ڕێبازی شیوعییەتدا هەر ماوەتەوەو جێی خۆی کردۆتەوە.

ئاواز: چۆن؟ لە مەبەستت تێ ناگەم، کامەیە ئەو هەورگە؟

مامۆستا ساڵح: ئەو هەورگەی لەو چارەسەرییەوە پەیدا ئەبێت هەر زۆر گەورەیە: بەهۆی ئەو چارەسەرییەوە سەربەستیی تاکەکان (الافراد) بە گۆڕ ئەبێت، چونکە ئەبێت موڵکیەتی شیوعییەت (بە کۆمەڵ) جێگەی موڵکیەتی تاك بگرێتەوە.

ئەو گۆڕینکارییە کۆمەڵایەتییە گەورەیە، پێچەوانەی سروشتی تەواوی مرۆڤایەتییە تاکو ئێستاش بەلایەنی کەمەوە. وەك سەرۆکەکانیان ئێستا دان بەمەدا ئەنێن. چونکە مرۆڤی ماددیی هەر بیر لە خۆی ئەکاتەوەو هۆشی وا بەسەر بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیەوەو لە ڕوانگەی فەردیی خۆیە تەماشای ژیان ئەکات، مرۆڤی ماددی لە ماددە بەدەر ئەبێ بیر لەچی بکاتەوە؟ کە ماددەی لێ بشارێتەوە، ئەی ئەبێت ئیتر دڵ بە چی خۆش بکات؟ لە پێناوی چیدا خۆی بەخت بکات؟

داڕێژانی نەخشەیەکی تازە بۆ کۆمەڵگەیەك کە بەیەکجاریی تاك (فرد)ی تێدا بتوێتەوەو بەتەواویی هەموو پاڵپێوەنەر (دافع)ێکی خودیی تێدا پامال بکرێت، ئەمجا جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیە، هێزێکی پڕ لە حەزم و توانای ئەوێ کە لغاوی ئەو کۆمەڵگەیە بە دەستێکی پۆڵایین بگرێتەدەست، هەر دەنگێ تیایا بەرزبێتەوە کپی بکاتەوە، هەر هەناسەیەك لەناو جەماوەردا هەڵبکێشرێت بیباتەوە بەناوا، هەموو هۆیەکانی پڕوپاگەندەو بڵاوکردنەوە دابڕ بکات بۆ خۆی، سنوورێکی پۆڵایین بەدەوی جەماوەردا دروست بکات و کەس نەتوانێ لێی بچێتە دەرێ، تەنانەت هەرکەس گومانی لێکرا سزا بدرێت. ئەی ئەگەر بەم جۆرە نەکرێت، ئەو لغاوە بەو ئاسانییە لە نێو دەستدا ئەمێنێتەوە؟ ئەمەش لە هەموو ڕژێمێکدا کە بەسەر جەماوەردا بسەپێنرێت، دیاردەیەکی سروشتییە.

بەڵێ، ئادەمیزادی "ماددەپەرست" ئەگەر هەر تەنیا بیر لە کۆمەڵ بکاتەوە، بەژیریی کۆمەڵ تەماشای بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی بکات، لە دەروونیا هەمو سۆزێکی تایبەتیی و حەزێکی خودیی و ئاهێکی ناخیی بار بکەن و بچنە دەرەوە، ئەوسا ئەگونجێت ڕژێمێك بێتە کایەوە کە کەسان (تاکان)ی تێد بتوێتەوە، ئیتر گۆڕەپان تەنیا "کەڵە کۆمەڵایەتیی مەزنی" تێدا بمێنێتەوە. بەڵام ئایا ئەمە لە مرۆڤی ماددەپەرست ئەوەشێتەوە؟ چۆن؟ مرۆڤێك کە تەنیا باوەڕی بە ژیانێکی سنووردار بێت، ئەو ژیانەش تامی تەنیا لە لەزەتپەرستیدا بەدی بکات، گۆڕینی ئەو مرۆڤە بۆ مرۆڤێکی وەها کە بەرژەوەندیی تایەبتیی خۆی بکات بەقوربانی بەرژەوەندیی گشتیی پێویستی بە "معجزە"ی گەورە هەیە. ئایا بەهەشتی لە ئاسمانەوە بۆ دێتە سەر زەویی؟ ئایا هەست بە کۆتایی تەمەنی خۆی ناکات؟ بۆچ "حازر بدات بە قەرز.."؟ ئایا ئەو مرۆڤە خۆی باوەڕی بە بەهەشت هەیە؟

ئەو خەیاڵە کە کارگە بەسەر سروشتی ئادەمیزاددا زاڵ ببێت و بیگۆڕێت و سەرلەنوێ دایڕێژێتەوەو مرۆڤێکی نموونەیی لە بیرو کرداردا لێ دروست بکاتەوە، خەیاڵێکی خاوی دور لە واقیعە، پێچەوانەی فیطرەی ئادەمیزادە، ئەگەر ماوەیەکیش سەر بگرێت ئەنجامەکەی لە دواییدا هەر ڕوخان و هەڵوەشانەوەیە.

بەڵی، تاك لەسایەی ئەو ڕژێمەدا لە بژێوی خۆی دڵنیایە، ژیانی مسۆگەرەو لە ئەستۆی کۆمەڵدایە. چونکە بەرهەمی کارکردن هی کۆمەڵەو بۆ کۆمەڵ ئەبێت. و پێویستییەکانی مسۆگەرن، بەڵام ئەگەر بێتو دەستکەوتەکانی بخەینە تای تەرازوویەك و ئەوەی لە دەستی دەرئەچێ بیخەینە تاکەی تری ئەو تەرازوە، کامیان قورس تر ئەبن؟ ئایا قازانجی لە زیانی زۆرتر نابێت؟ ئەی ناکرێت لە پاڵ ئەو ژیان مسۆگەرییەدا هەناسەیەك هەڵمژێت و بۆنی سەربەستیی بچێت بە دەماغیدا؟ بۆچ نابێ سروشت و سۆزو کەفوکوڵی دەروونی نەسووتێنرێن؟ ئایا ناکرێت کە نەخرێتە ناو دەریایەکی شەپۆل بەهێزەوە؟ چۆن ئەگونجێ کەڵکەڵەی سەربەستی بکات. لە یەکیك لە مەیدانەکاندا

. مادام سەربەستیی ڕێگەی خۆژیاندنی بیبەش کرابێت و خۆراکی ژیانی بەسترابێت بە دەستە (هیئە)یەکی دیاریی کراوەوە، لە کاتێکا کە سەربەستیی ئابوریی و خۆژیاندن بناغەی هەموو سەربەستییەکانی ترە؟

ڕۆڵە شیرینەکانم، کەسێك کە کەسانی تر وزەکانی بگوشن و دڵنیایی ژیانیکی پاك و چاك و کرێیەکی دادگەرانە و تەئمینی ژیانی لە ڕۆژانی ڕەشا نەبێت، ئەو کەسە مرۆڤێکی بێبەشکراوە لە تام و چێژیی ژیان، لە ژیانی ئاسوودەگی و هێمنی دوورخراوەتەوە، ئەمەش زۆر بە ئاشکرایی لە کۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا بەرچاو ئەکەوێت.

هەروەها ئەو کەسەی کە لە ژیانیا هەموو ساتیك هەڕەشەی لێ دەکرێت، لەسەر هەموو جموجوڵێك موحاسەبە ئەکرێت، لەبەر دەستی گرتنی بێ مەحکەمەدایە. لەبەردەستی بەندیخانەو دوورخستنەوەو کوشتندایە بە هۆی بچووکترین هەڵەوە، ئەو کەسە مرۆڤێکی دڵ ترساوی شڵەژاوە، ترس شیرینی ژیانی لێ تاڵ ئەکات، ترسنۆکی ژیانی ئەکات بە ژەهری مار.

دەردو بەڵای سەرمایەداریی لە خاوەندێتیی تایبەتییەوە هەڵ نەقوڵاوە، نەخێر. خاوەندێتیی تایبەتی تەنیا خۆی بە تەنیا ناتوانێ بەختیاریی گێتیی بخاتە لەرزە، ناتوانێ ملیۆنەها کرێکار بێ ئیش بهێڵێتەوەو کرێ و ڕۆژانەی کرێکار بێنێتە خوارەوە. خۆی بە تەنیا ناتوانێ وا لە سەرمایەدار بکات کەڵکی لێ وەربگرن. ناتوانێ خۆی بە تەنیا سووکایەتی پێبکرێت و خوێنی هەژارانی پێ بمژرێت، یان هەرچی لە بازاڕدا هەیە بکڕدرێت پێی بە مەبەستی دابڕین یانی (إحتكار). ئەم هەموو کارەساتە دڵتەزێنانە لە خاوەندێتیی تایبەتییەوە هەڵنەقوڵاون..

ئاواز: باشە، ئەی پێم ناڵێیت لە چییەوە هەڵقوڵاون؟

ماموستا ساڵح: ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەو هەموو لق و پۆپەکانیان، زادەی بەرژەوەندیی مادەپەرستیی کەسێتیی (المصلحة المادية الشخصية)یە کە کراوە بە پێوەر (مقیاس)ی ژیان لە ڕژێمی سەرمایەدارییدا. کراوە بە پاك کەرەوە (المبرر)یەکی بەرفراوان بۆ هەموو مامەڵەو هەڵسوکەوتێك، جا ئەو کۆمەڵگەیە کە ڕژێمەکەی، بنەڕەتەکانی، لەسەر ئەو پێوەرو پاککەرەوەیە داڕێژێت تەنها ئەوەندەی لێئەوەشتێتەوەو هەروا ئەبێت.

خاوەندێتیی تایبەتی ئەگەر بێت و سنووری بۆ دیاریی بکرێت و لەو کارەساتە دڵتەزێنانە بپارێزرێت، پایەکانی لەسەر بنەڕەتی باوەڕ بە خواو سزاو پاداشتی ڕۆژی دوایی دابمەزرێت، هەرگیز بەختیاریی گێتیی ناخاتە لەرزە، هەرگیز سەرمایەداریی لێ دروست نابێت. لە هەمان کاتدا ئادەمیزاد لە سروشت و فطرەی پاکی خۆی ناکرێتە دەرەوە، لە سەربەستیی بێ بەش ناکرێت، بەوەش هێزو توانا و وزەکانی سیس نابن و ناوەرێن. بەڵام وا دیارە لەم ڕووەشەوە لە بەرنامەی ئیسلام بێ ئاگان و جگە لە ڕەخنە هیچی تر فێر نەکراون.

جوان: ئێمە گیانمان بە ڕەخنەگرتن لە ئیسلام ئاودراوە ماموستا!

ماموستا ساڵح: ئەی هەزار ڕەحمەتت لێ بێت مادام دان بە ڕاستییدا ئەنێیت!

## هەرشتێ کاتی خۆی هەیە

دڵپاك: بابەگیان، ئەترسم لە بیرت نەبێت کە ئەمڕۆ هەینییە، کاتژمێر لە یانزە خەریکە نزیك ئەبێتەوە.

ماموستا ساڵح: نەخێر، لە بیرم نەچۆتەوە، ئەزانم هەینییە.

جوان: ئامینە خانم، بە درێژایی ئەم هەموو کاتە هەر گوێگر بوو، نازانم بۆچ قسەیەکی نەکرد، وا دیارە نۆرەمان پێنەدا.

ئامینەخان: من حەز ئەکەم تەنیا گوێتان لێبگرم، ئەوە بەچاك ئەزانم.

هەڵکەوت: ماموستا ئەترسم زیزمان کردبێت، گەلێ قسەی تاڵمان هەڵڕشت. تکایە لێمان ببورە.

ماموٚستا ساڵح: خوا لێتان ببورێت، دڵنیابن کە دەربارەی ئێوە دڵم هیچ گەردێکی نەگرتووە، هەر جۆرێکیش قسە ئەکەن، گەردنتان ئازاد بێت. من ئەمەوێت خۆم بکەم بە شاگردی "زین العابدین" لەم ڕووەوە.

نەشمین: زین العابدین کێیە؟ چۆن؟

ماموٚستا ساڵح: ئێستا کاتی ئەوە نییە کە "زین العابدین"ت پێ بناسێنم، ئەوەندە هەیە موسڵمانێکی ڕاستەقینە بووە، خواناس و لە خواترس بووە، بۆ خوا ئەژیا ئاواتی بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بوو.

ئەو موسڵمانە بەندەیەکی هەبوو ڕۆژێکیان بەندەکەی مەڕێکی ئەو موسڵمانەی بەرزکردەوەو بە بەرچاوییەوە دای بەزەویداو قاچێکی شکاند، زین العابدین لێی پرسی ئەوە بۆچ وات کرد؟ بەندەکە گوتی: بۆ ئەوەی ڕقی تۆ هەڵسێنم. زین العابدین فەرمووی: دەی ئەبێت من ڕقی ئەو کەسە هەڵسێنم کە تۆی فێرکردووە کە شەیتانە، بڕۆ لەبەر ڕەزامەندیی خوا ئازادبە. بەندەکەی ئازاد کرد".[1]

جوان: یانی شەیتان ئێمەی فێری ئەو کەفەدەمێ کردووەو تۆیش ئەتەوێ بە توڕەنەبوونی خۆت ڕقی شەیتان هەڵسێنێ.

پرشنگ: ماموٚستا، تۆ ڕێبازی سەرمایەدارییو سۆشیالیستیت دایە بەر نووکی خەنجەرو بۆت باس کردین کە ئافرەت بەرەو بەختیاریی نابەن، بە تایبەتیی لە بارەی دەرهێنانی ئافرەتەوە لە ماڵداو بردنی بەرەو مەیدانی کارکردن، ئەوەت بە ستەم کردن لە ئافرەت دایە قەڵەم. کەواتە کارکردنی ئافرەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە حەرامە.

ماموٚستا ساڵح: پرشنگ خان، ئێستا کاتی وەڵام نییە، ببورە، هەرشتێ کاتی خۆی هەیە، ئێستا کاتی چوون بۆ نوێژە، بەویستی خوا کە لە نوێژ گەڕاینەوە، لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

سەربەست: منیش دێم بۆ نوێژی هەینی، بزانم چۆنە.

جوان: سکاڵا، تۆیش هەڵبەت لەگەڵ ماموٚستا دڵپاکا دەچن بۆ نوێژ.

سکاڵا: بێگومان، بێگومان.

ڕووناک: وەرن با ئیمەش بچین، خۆ نامانخۆن با ئێمەش بچین.

ئامینە خان: کێ ئەتانخوات؟ کچم مزگەوت جێی مرۆڕۆ خواردن نییە.

ماموٚستا ساڵح: ئارەزووی خۆتانە هەرکەس دێت بەخێربێت، من کەس ڕووگیر ناکەم.

---

[1] روائع الإسلامية : إبراهيم النعمة ص٦٥، ط١٩٨٣.

## سەرچاوەكان


١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری (في ظلال القرآن) سید قطب.

٣. فقه السنة، ج٢، السید سابق.

٤. إسلامنا، السید سابق.

٥. شبهات حول الإسلام، محمد قطب.

٦. الإسلام وقضايا المرآة المعاصرة، البهي الخولي.

٧. المرأة في القرآن والسنة. محمد عزة دروزة.

٨. الحجاب، أبو أعلى المودودي.

٩. المرأة في القرآن، عباس محمود عقاد.

١٠. عمل المرأة في الميزان، الدكتور محمد علي الباري.

١١. سەربەستیی لە ئیسلامدا، ئەحمەد كاكە مەحمود.

١٢. دروس في الماركسية، جلال الدين الفارسي.

١٣. روائع الإسلامية، إبراهيم النعمة.

١٤. أضواء على المادية الدياليكتيكية، كمال حسين.

١٥. سروەی بێداری، جەمال حەبیب الله.

١٦. المرأة في التراث الإشتراكي: ترجمة / جورج طرابيشي.

١٧. المرأة في القرن العشرين، جروان السابق.

١٨. الإيمان والحياة: د. يوسف القرضاوي.

١٩. ماذا عن المرأة: د. نورالدين العتر.

٢٠. حقائق الإسلام وأباطيل خومه: محمود عباس العقاد.

٢١. البيت الإسلامي كما ينبغي أن يكون: مقداد يالجن.

٢٢. الطلاق بين الفقه والقانون: إبراهيم النعمة.

٢٣. إلى كُل فتاة تؤمن بالله: محمد سعيد رمضان البوطي.

٢٤. چەند سەرچاوەیەكی تری جۆربەجۆر.


## ناوەڕۆك

## بڵاوكراوەكانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیرە | ناوی كتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، رووداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |

| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان<br>رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| --- | --- | --- |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی رەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی<br>پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك رەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، رێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی رۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا<br>بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |